# سلێمانی

# لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا

١٢٦٣-١٣٣٦ کۆچی

١٨٤٧-١٩١٨ زایینی

بەرگی هەشتەم


ئامادەکردن و پێشکەشکردنی:

دکتۆر نەوزاد یەحیا باجگر

وەرگێڕان: ئاشتی رەحمان


8

سلێمانی لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا




ئامادەکردن و پێشکەشکردنی: دکتۆر نەوزاد یەحیا باجگر


2019





بڵاوکراوەی زانکۆی جیهان

خانەی بەڵگەکان

٢٠١٩




# سلێمانی

## لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا

١٢٦٣-١٣٣٦ کۆچی

١٨٤٧-١٩١٨ زایینی



**بەرگی هەشتەم**





**بڵاوکراوەی زانکۆی جیهان**

**خانەی بەڵگەکان**

**٢٠١٩**



ئامادە و پێشکەشکردنی: **د. نەوزاد یەحیا باجگر**

وەرگێڕان: **ئاشتی رەحمان**

## پێرســت

• ناوی کتێب • **سلێمانی** لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا
١٢٦٣-١٣٣٦ کۆچی/ ١٨٤٧-١٩١٨ زایینی
بەرگی هەشتەم
• ئامادە و پێشکەشکردنی • د. نەوزاد یەحیا سەعید باجگر
• وەرگێڕان (زمانی عوسمانی) • ئاشتی ڕەحمان
• بەڕێوبەری هونەری • بورهان سابیر
• دیزاینی ناوەڕۆک • هێمن حەساری
• بڵاوکراوەی • زانکۆی جیهان | خانەی بەڵگەکان
• تیراژ • ١٠٠٠ دانە
• چاپ • یەکەم ٢٠١٩ هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (      )ی ساڵی ٢٠١٩ی وەزارەتی ڕۆشنبیری

Download Books بۆ داونلۆدکردنی کتێبەکان:
www.NawzadBajger.net
www.NawzadBajger.org
chairman@cihanuniversity.edu.iq

تەواوی مافی
ئەم کتێبە پارێزراوە
بۆ زانکۆی جیهان

ئەو وشەو بیروبۆچوونانەی کە لەم پەرتوکەدا نووسراوەتەوە سەرچاوەکەی بەڵگەکانەو ئێمە لێی بەرپرس نین، لەبەر ئەمانەتی زانستیش لەکاتی وەرگێڕانی دەستکاری نەکراوە.

# پێشەکی



ئەم شارەی کە لە سەردەمی عوسمانیەکاندا بە بابان و دواتر بە سانجەقی سلێمانی ناوبانگی دەرکرد، لە لایەنی سیاسی و ئابووری و کەلتوریدا جێگەی خۆی لە ناو مێژووی ناوچەکە قایم کرد، بە شێوازێك ڕێڕەوی خۆی نەخشاند کە مێژوویەکی پوخت و تێروتەسەلی بۆ نەوەکانی دوای خۆی بەجێ هێشت، هەڵبەتە نەك لەلایەنی کەلتوری و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە، بەڵکو لەلایەنی سیاسیشەوە باوباپیرانی ژێر دەستەییان قەبوڵ نەکرد، لە سەرهەڵدانی شۆڕش و ڕاپەرینەکاندا گەرم و گور بوون و بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان دریغیان نەکرد، تا بە نەوەی دوای خۆیان بڵێن: «هیچ کەسێك بە بەندەیی لە دایك نەبووە تا ژێر دەستەیی قەبوڵ بکات، مافی هەموو کەسێکە بە سەربەرزی و شکۆمەندی بژیت».

لە کۆتایی ساڵی ١٧٨٤ سلێمانی بووە پایتەختی میرنشینی بابان، پێشتر لە قەڵاچوڵان کە دەکەوێتە باکووری سلێمانی، فەرمانڕەواییان دەکرد، میرەکانی میرنشینی بابانیش تا ساڵی ١٨٥٠ لە سلێمانی فەرمانڕەواییان کرد. بەڵام دوای ڕووخانی میرنشینی بابان ڕۆڵی سلێمانی کەم بووەوە و تا هاتنی ئینگلیزەکان لە ساڵی ١٩١٧، نەخشەیەکی نوێیان بۆ عیراق دارشت، ئەمەش وایکرد لە ساڵی ١٩١٨ شۆڕشی شێخ مەحمود دژی ئینگلیزەکان سەریهەڵدا، کە دەوڵەتێکی سەربەخۆی لە سلێمانی ڕاگەیاند. بێگومان دەوڵەتی عوسمانیش لە هەمبەر دەسەڵاتی ئینگلیز و شێخ مەحمود دەستەوئەژنۆ نەوەستاوە، هەروەك لە بەڵگەکاندا دیارە و دەردەکەوێت لە ساڵی ١٩١٨ دوای لەدەستدانی سلێمانی دووبارە خستۆیەتیەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی، بۆیە بە درێژای مێژوو ئەم ناوچەیە سەقامگیری سیاسی و ئارامی بە خۆیەوە نەبینیوە، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی عوسمانیەکان لە ناوچەکە و دامەزراندنی مێرنشینی کوردی، کە لە نێوان ئەم دوو دەسەڵاتە ڕووبەڕووبوونەوە ڕوویداوە و هەر لایەك لەمانە هەوڵی داوە دەسەڵاتی خۆی بەزەبری هێز بسەپێنێت، دوای ئەمەش هاتنی ئینگلیزەکان بۆ ناوچەکە ڕووبەڕووبوونەوە و ناکۆکی سیاسی زیاتر و قوڵتر کرد، بە تایبەتی دوای ئەم سەردەمەدا کە دەوڵەتی عوسمانی بەرەو لاوازی دەڕۆیشت و ئەم هێز و توانایەی نەمابوو تا بتوانێت بە ئاسانی بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆی.

ئەم بەڵگانەی پەیوەستن بە سلێمانی ئێجگار زۆرن، بە شێوەیەك چڕوپڕن، گشت لایەنێك دەگرێتەوە، جگە لەلایەنی کارگێڕیەوە باس لە دامەزراندن و لادانی قائیمقام و بەڕێوەبەر و کاتب دەکات، هەروەها باس لە سزادان و پاداشت کردنی ئەم کەسانە دەکات کە لە پلەوپایە کارگێڕیەکاندا ئەرکیان هەبووە و کاریان کردووە. لەلایەکی تر نزیکی لە سنووری ئێران وایکردووە کێشە و گرفتی سیاسی و کۆمەڵایەتی دروست بێت، بە تایبەتی هۆزە کوردییەکان لەوانە هەمەوەند و جاف لە نێوان سنووری عیراق و ئێران بۆ ناوچەی سلێمانی هاتوون، ئەمەش وایکردووە کێشە بۆ خەڵکی ناوچەکە و دەوڵەتی عوسمانی دروست بکەن، جگە لەمانە هەم ناکۆکی و ململانێی ناوەخۆ واتە لە نێوان هۆزەکاندا، هەم ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ عوسمانیەکان لە ناو بەڵگەکاندا ڕەنگ دەداتەوە و بە ڕوونی باسیان دەکات.

دوای بەدواداچوون و کۆکردنەوەی ئەو بەڵگانەی پەیوەستن بە شاری سلێمانی، بەڵگەیەکی ئێجگار زۆر لە ئەرشیفی عوسمانی بەرچاوکەوتن، ئەمەش وایکرد گشت ئەم بەڵگانەی ناوی سلێمانی تێدا هاتووە لە بەڕێوەبەرایەتی ئەرشیفی عوسمانی/ ئیستەنبوڵ بهێنرێت و لە زانکۆی جیهان/ خانەی بەڵگە و ئەرشیف دابنرێت، لە ڕاستییدا دەستنووسەکان ئێجگار زۆرن نەتوانرا لە کتێبێکدا کۆیان بکەینەوە، بۆیە بەشێك لەم دەستنووسانە کە دەگاتە (٤٠٠) بەڵگە وەرگێردرانە سەر زمانی کوردی و چاپ کران، ئەوەی ماوەتەوەش بە پشت و پەنای خوا، لە داهاتوودا وەکو ئەم کتێبە ئەوانیش وەردەگێردرێن و بڵاو دەکرێنەوە.

د. نەوزاد یەحیا باجگر
سەرۆکی دەستەی ئەمینداریەتی کەمپەکانی زانکۆی جیهان

# چەند ڕوونکردنەوەیەك لە بارەی بەڵگەکان



1 • لە ناو بەڵگەکاندا هەڵەی ساڵ و مانگ و ڕۆژ کراوە؛ ئەوەی لە بارەی مێژووی ناو بەڵگەکانە ئەوا مێژووی کۆچی و ڕومی بەکارهاتووە، لە هەندێک بەڵگەشدا مێژووی رومي یا ئەوەتا کۆچیەکەی نووسراوەتەوە، بە تایبەتی لە ساڵە ڕومیەکە هەڵەی تێدا کراوە.



2 • جگە لەمەش هەڵەی ناوەکان هەیە، بۆ نموونە هۆز و ناوی کەسێتی، شوێن، لەبەر ئەوەی ئەو نووسەرەی نووسراوەکەی نووسیوەتەوە کوردییەکەی باش نەبووە، بە شێوازی سەر زاری خۆی ووشەکەی نووسیوەتەوە، یاخود لە بارەی ناوچە و شوێنەکانەوە شارەزاییەکی ئەوە تۆی نەبووە، زانیاری لە شێوەزاری ناوچەکەش نەبووە، ئەمەش وایکردووە بە هەڵە بینووسێتەوە، هەر بۆیە لە بارەی ناوەکانەوە هەروەکو خۆی نووسراوەتەوە، دەستکاری نەکراوە.



3 • لە بارەی وەرگێرانی بەڵگەکان ئەوا هەروەکو خۆی وەرگێردراوە؛ یەک ووشە زیاد یاخود یەک ووشە کەمی نەکردووە، تەنانەت هەوڵ دراوە لە کاتی وەرگێرانەکە دەستکاری دەستەواژە و ووشەکان نەکرێت، چونکە ئەگەر بە گوێرەی زمانەوانی کوردی دەستکاری دەستەواژە و ووشەکان بکرابووایە، ئەوا دەبووایە دەستکارییەکی زۆری دەستەواژەکان بکرێت، هۆکاری دەستکاری نەکردنەکەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە بەڵگەکان ڕەسەنایەتی خۆیان لە دەست نەدەن، لە هەمان کاتدا خوێنەر و مێژوونووسان لە شێوازی نووسینی بەڵگە و شێوەزاری ئەو سەردەمەی نووسەران ئاشنا بن، کە ئەو بەڵگانە بە چ شێوازێک نووسراونەتەوە، جگە لەوەش کاری نووسەر و مێژوونووسانە لە کاتی لێکۆڵینەوە لە زانیاری ناو بەڵگەکان ڕوون کردنەوە و شی کردنەوە بۆ بابەتی ناو بەڵگەکەکان بکەن.



4 • لە هەندێک شوێن لە ناو بەڵگەکاندا بۆشایی هەیە، ئەوانیش بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن؛ هۆکاری ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی لە کاتی نووسینەوەی نووسراوەکە هەندێک ووشەی نهێنی هەبووە، نەویستراوە ئاشکرا بێت، بۆیە نووسەرەکە بۆشایی بەجێ هێشتووە، تەنیا ئەوەی نووسراوەکەی گەیشتۆتە دەستی لەم بۆشاییە تێگەیشتووە و زانیویەتی نووسەر یاخود لایەنی پەیوەندیدار مەبەستی چییە.



5 • لە چەند شوێنێکی کەمیش بۆشایی بە خاڵ خاڵ هەیە (...) مەبەستیش لەم بۆشاییە بە خاڵانە ئەوەیە کە ئەو ووشەیە نەتوانراوە بخوێندرێتەوە، زۆر جار ووشە هەیە خوێندنەوەی زۆر ئەستەمە کە نووسەرەکە بە شێوەیەک یاخود بە خەتێک نووسیویەتی ناتوانرێ بخوێندرێتەوە، بۆ ئەوەی لە خوێندنەوەی هەڵە و لە ووشەی هەڵە دوورەپەرێز بین، بۆ ووشەکە بۆشایی بە خاڵ دانراوە.



6 • هەندێک ووشە یاخود ڕاسترە بڵێین زاراوە هەیە لەو سەردەمە بەکار هاتووە و مانای تایبەتی خۆی هەیە؛ ئەو مانایە نادەن کە ئێمە ڕۆژانە بەکاری دەهێنین و لێی تێدەگەین، جگە لەوەش وەرگێرانی ئەو ووشانە بۆ کوردییەکەی لە نرخ و ماناکەی تێک دەدات و لە هەمان ئەو ئاستە نابێت، واتە مانای پر بە پێستی خۆی لە دەست دەدات، بۆیە نەکراوەتە کوردی و هەروەکو خۆی دانراوە، بەڵام بۆ ئەوەی خوێنەر و مێژوونووسان لە

پێناسەی زاراوەکان ئاشنا بن، ئەوا لە (شیکردنەوەی زاراوەکانی عوسمانی) پێناسە کراوە و روون کراوەتەوە، لە هەمان کاتیشدا زاراوە هەیە، کە زانراوە لە ماناکەی ناگۆردێت، وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی.



7 • جگە لەوانەی کە باسمان کرد بەڵگە هەیە، لە چەندین لاپەڕە پێک هاتوون، ئەو چەند لاپەڕەیەش باسی یەک بابەتی دیاری کراو دەکات، بۆیە لەناویان تەنیا یەک لاپەڕە وەرگێردراوە، چونکە هەموو لاپەڕەکان هەمان بابەت باس دەکەن، جیاوازیەکی ئەوەتۆیان تێدا نییە، بەڵام ئەگەر ئەو چەند لاپەڕەیە باسی چەند بابەتێکیان کردبێت، یاخود هەر هەمان بابەت بەڵام بە شێوازی جیاواز باس کرابێت ، واتە هەر لاپەرەیەک بە شێوازێکی جیاواز باسی بابەتەکەی کردبێت، لێرەدا ئەگەر لە بابەتەکە جیاوازی بەدی کرابێت، هەمووی وەرگێردراوە.



8 • دووبارە بوونەوەی بەڵگە، کەمێک لە بەڵگەکان هەندێک بابەتی دیاریکراو دووبارە بوونەوەی بەڵگەی تێدایە؛ واتە هەمان بابەت لە جیاتی ئەوەی هەمان ژمارەی بدرێتی، وەکو ئەوەی لە سەرەوە باسمان کرد، بابەتەکە لە چەند لاپەڕەیەک پێک هاتووە، ئینجا لە جیاتی ئەوەی هەمووی کۆ بکرێتەوە و هەمان ژمارەی بدرێتی، کەچی بە پێچەوانەوە هەمان بابەت ژمارەی جیاجیایان دراوەتێ، لێرەدا بە ناچاری هەمان بابەت کە لە ژمارەی جیاجیا پێک هاتووە، وەرگێردراوە، چونکە ژمارەیان جیایە و هەمان ژمارەی نەدراوەتێ.



9 • لە هەندێک بەڵگەدا لە کاتی نووسینەوەی رووداوەکان و زانیاری لە بارەی ناوچەکانەوە بە گشتی باسی بابەتەکان کراوە، بۆ نموونە شوێنی عەرەب نشینیش باس کراوە؛ لێرەدا تەنیا ئەوەی پەیوەندی بە کورد و ناوچەکانی کوردییەوە هەیە وەرگێردراوە.



10 • لە نێو بەڵگەکاندا دەستەواژەی دووبارە و رستەی دووبارەی تێدا بەرچاو دەکەوێت، لێرە دا نووسەر لە کاتی نووسینەوەی نووسراوەکەدا هەمان زانیاری یاخود دەستەواژەی دووبارە کردۆتەوە و هەمان زانیاری نووسیوەتەوە.



11 • لە بارەی ساڵی بەڵگەکان ئەوا بۆ ریزبەندی بەڵگەکان تەنیا ساڵی کۆچی بەکار هاتووە، پشت بە مانگ و رۆژەکەی نەبەستراوە؛ جگە لەمانەش ساڵی ناو بەڵگەکان بە گوێرەی زانیاری ناو بەڵگەکە و ئەوەی سەر بەرگەکەی گۆرانکاری بەسەر دادێت، واتە نووسەر لە کاتی نووسینەوەی بەڵگەکەی ئەم ساڵەی نووسیوەتەوە کە بەڵگەکەی تێدا نووسیوەتەوە، کەچی کە گەیشتۆتە لای پاشا ئەو ساڵەی نووسیوەتەوە کە نووسراوەکەی تێدا بینیوە، هەندێک جاریش ساڵی جێبەجێ کردنەکەی لەسەر نووسراوە، واتە لە یەک نووسراودا مەبەست بەڵگەکەیە چەند ساڵێکی جیاواز بەرچاو دەکەوێت.



12 • هەندێك ساڵ کە لە ناو بەڵگەکاندا ئاماژەی پێکراوە، بە کورتکراوی نووسراوەتەوە، بۆ نموونە دەڵێت ساڵی (٢٧) لێرەدا مەبەستی ساڵی (١٢٢٧)ە، کە ١٢٠٠ ەکەی فرێ داوە، یا ئەگەر نووسرابێت ساڵی (٣٣٦) ئەوا لێرە مەبەستی ساڵی (١٣٣٦)ە، کە ١٠٠٠ ەکەی فرێ داوە.

**وەرگێر**

# شیکردنەوەی زاراوەکانی عوسمانی

| | |
|---|---|
| ئاڵای (الای) | ئاڵای بە مانای کۆمەڵ، قەڵەباڵغ دێت، لە زاراوەی سەربازیش ووشەیەکە لە سێ چوار تابور پێک دێت، هەروەها هەر ئاڵایەک سانجەقێکی لە ژێر دەستدا بوو. |
| ئەعیان (اعیان) | لە سەرەتا بۆ بەدواداچوونی بریارەکانی ئەنجوومەنی میللەت ئەنجوومەنێکی تر هەبووە و ئەم ئەرکەیان پێ سپێردراوە، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ساڵانی ١٨٧٧ و ١٩٠٨ ئەندامەکانی لەلایەن حکوومەتەوە هەڵبژێردراوە. |
| ئەنبار | شوێنێکە بۆ هەڵگرتنی زەخیرە و هەموو کەلوپەلێک بەکارهاتووە. |
| ئەنجوومەنی واڵا (مجلسی والا) | ئەنجوومەنی واڵا لە ساڵی ١٨٣٧ دامەزرا، ئەم ئەنجوومەنە کاری ئەوە بوو، داواکاری نێوان دەوڵەت و خەڵک جێبەجێ بکات، لە ساڵی ١٨٦٧ هەڵوەشایەوە و لە شوێن ئەو شورای دەوڵەت دامەزرا. |
| ئستەبڵی عامیرە (اصطبل عامرە) | تەوێلەی کۆشکی پاشا. |
| ئۆچاقلق (اوجاقلق) | ئەو زەوییانەن کە جیاکرابوونەوە و داهاتەکانیان بۆ پارێزگارانی قەڵا و کۆگای چەک دەرۆیشت. |
| ئۆن باشی (اونباشی) | ئەو سەربازەیە کە قوماندانیەتی ١٠ کەسی کردووە، ئەمەش لە نێوان کەس و چاوشەکە دەبێت. |
| ئیستدعانامە (استدعانامە) | ئەم نووسراوەیە وەکو داواکاری بۆ دەوڵەت دەنووسرێت، بەڵام مۆر و پولی لەسەرە . |
| ئیستعلامنامە (استعلامنامە) | ئیستعلام واتە بە نووسراو داوای زانیاری کراوە، هەرچی ئیستعلامنامەیە ئەوا ئەو نووسراوە بووە، بەڵگەی لەگەڵ بووە. |
| ئیستیناف (استیناف) | دووبارە دەست پێکردنەوە، ئەو بریارەی کە لە دادگای سەرەتایی دەدرا، بۆ ئەوەی بریارەکە هەڵبوەشێنرێتەوە سەردانی دادگایەکی سەرووتر واتە لە ئەو بەرزتر دەکرا، تا بریارەکە هەڵبوەشێننەوە. |
| بابی عالی | بنکەی سەدری ئەعزەم، دیوانی همایۆن لەگەڵ نەزارەتی ناوەخۆ و دەرەوە و فەرمانگەی شورای دەوڵەت دەگرێتەوە. |
| باش کاتیب (باش کاتب) | نووسەری یەکەم یاخود سەرۆکی نووسەران، ئەرکەکەشی لە فەرمانگە فەرمییەکاندا سپێردراوە بە نووسینی نووسراو. |
| باش کیتابەت (باش کتابت) | کیتابەت واتە پیشەی نووسین، باش کیتابەت یەکسانە بە باش کاتیبی، واتە سەرۆکی نووسین. |
| باشبوغ | قوماندانی سەربازی رێک نەخراو یاخود نارێک. |
| باش مودیرەت (باش مدیرت) | باش بە مانای سەرۆك یاخود یەکەم دێت. مودیرەت واتە بەرێوەبردنی کاروبارەکان؛ هەرچی باش مودیرەتە بە مانای بەرێوەبەرایەتی یەکەم یاخود بەرپرسی یەکەمی بەرێوەبەرایەتی دێت. |
| بەرائەتی شەریفە | واتە پاکانەی ئەستۆ و خۆبەرێکردن، لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ وەرگرتنی زەوی کشتوکاڵی یاخود دامەزراندن دەبووایە لەلایەن پاشاوە یاخود دەوڵەت بەرائەتی شەریفە واتە پاکانەی ئەستۆ وەربگیرێت. |
| برادەر زادە | برادەر زادە منداڵی خوشک و برا، هەروەها برازا، پورزا، خاڵۆزا دەکات. |
| برادەری | واتە برا. |
| بلۆک (بلوک) | دەستەی سەربازی. |

| | |
|---|---|
| بلۆک باشی (بلوک باش) | سەرۆک یاخود بەرپرسی بلۆک. |
| بینباشی (بیکباشی) | بین بە مانای هەزار کەس دێت، بینباشی، ئەو ئەفسەرەیە یاخود قۆماندانەیە تابورێک بەڕێوە دەبات لە هەزار سەرباز پێک هاتووە. |
| پلەی حەرەمەین (درجە حرمین) | بەو کەسە ووتراوە کە تۆبەی کردووە و حەرامی لە خۆی قەدەغەکردووە. زیاتر لە کاتی حەج کردن دەچووە پلەی حەرەم و خراپە و کاری بەدی لە خۆی حەرام دەکرد. لەلایەکی تر لە سەردەمی کۆندا چینی زاناکان دەگرێتەوە کە لە دوای پایەی میسر لە پێش پلەوپایەی ئیستەنبۆڵ پلەیەکی بەرزە. |
| تابور | لەشکری سەربازی، کەرتی سوپا. |
| تاتار | نامەی گواستۆتەوە بۆ ناوچەکانی تری دەوڵەت، جولەی زۆر خێرا بووە، جگە لە ناوی تاتار ئەوەی ئەو کارەی کردووە ناوی (ساعی، پۆستە، قاسد، برید)یشی پێ ووتراوە، لە کاتی خۆیدا تاکی تاتار بە خێرا رۆیشتن بەناوبانگ بووە، بۆیە بەم مانایەی پێیان ووتراوە تاتار. |
| تەحسیلدار (تحصیلدار) | ئەو فەرمانبەرەیە  کە باج و باجی داهات و بەروبوومی داهات کۆدەکاتەوە. |
| تەرسانە (ترسانە) | یاخود تەرسخانە ئەمەش ئەو شوێنە بووە کاروباری کەشتییە جەنگیەکانی تێدا دەکرا، واتە کارگەی دەریایی و کاروباری دەریایی تێدا جێبەجێ دەکرا، یەکسانە بە تەرسانەی عامیرە (ترسانە عامرە). |
| تەغار (تغار) | چوار ربە یەك تەغارە. |
| تەنزیمات (تنظیمات) | لە رووی زاراوەدا بە مانای رێکخستن و رێکوپێکی و خستنە سەر رێگا دێت، لە سەردەمی عەبدولمەجید لە ساڵی ١٨٣٩ ی ٣ی قاسم لە گوڵخانە خوێندرایەوە، بە ناوی رەشنووسی هومایۆنی گوڵخانە بە فەرمانێکی پاشا هەژمار کرا، لەلایەن رەشید پاشای گەورەش وەکو چاکسازی راگەیەندرا، تا ساڵی ١٨٧٧ی جەنگی رووس بەردەوام بوو، دواتر سنووردار کرا؛ ناوە راستەقینەکەی تەنزیماتی خێرخوازی  (تنظیمات خیریە) بوو. |
| تیمار | ئەو زەوییە کشتوکاڵیانەن کە ساڵانە داهاتیان لە نێوان ٣٠٠٠ ئاقچە لەگەڵ ٢٠٠٠٠ ئاقچە بووە، ئەم جۆرە زەوییەش بەو سەربازانە دەدرا کە لە شەڕ سوودیان لێ وەردەگیرا یاخود بەو کەسانە دەدرا کە لە بواری ئایینەوە ئەرکیان پێ سپێردرابوو، ئەمەشیان بۆ ئەوە بوو تا بژێوی ژیانی خۆیان پێ دابین بکەن، واتە لە جیاتی مووچە پێیان دەدرا. |
| پارە | وشەیەکی فارسیە، یەک قوروش چل پارەیە، یەک پارەش دەکاتە سێ ئاقچە. |
| پۆست نشین | بە شێخی تەکیە ووتراوە پۆست نشین، لە هەمان کاتدا بە کەسێك ووتراوە کە لە پلەیەك دانیشتووە واتە پلەیەکی هەبووە و کارەکەی بەرێوە بردووە. |
| حەرەم (حرم) | ئەو شوێنەیە کە هەموو کەسێك ناتوانێ بە بێ مۆڵەت بچێتە ژوورەوە، بە تایبەتی ئەو شوێنانەی کە تایبەتن بە ئافرەت و ژووری ئافرەت. |
| جەبەخانە (جبەخانە) | ئەو شوێنە یاخود ئەو کۆگایە بووە هەموو جۆرە چەک و باروت و کەلوپەلی چەکی ئاگری تێدا پارێزراوە. |
| جەلیلە (جلیلە) | جەلیلە ناوداری گەورە، وەزیر یاخود موشیرەکان هەروەها کە نووسراو بۆ فەرمانگەی ئەوان دەکرا، بەم شێوەیە رێزیان لێ دەگیرا، هەروەها لە پلەی ئەوان نزمتر پێیان دەوترا بەهیبە یا عالییە. |
| خاخام | زانا و بەرپرسی یەهودیەکان، واتە کاهین. |
| خەلافەتپەناهی (خلافتپناهی) | خەلیفە شوێن گرەوەی کەسێک، کە لە دوای پێغەمبەر وەکو وەکیلی پێغەمبەر، ئەرکێک بوو لە ئیسلام داهێنرا، پەناهی واتە پەیوەندی، خەلافەت پەناهی واتە شتێک کە پەیوەندی بە خەلیفەوە هەیە و لەلای ئەوەوە دەردەچێت. |
| خەیل (خیل) | تاقم، خەڵکێکی زۆر، بە تاقمی سوارەش دێت. |

| | |
|---|---|
| خولعە (خلعە) | ئەو جلە بوو چەند جۆرێکی هەبوو، جۆرەکانیشی جلی رێز لێنان، جلی پەشیمانی یاخود جلی مردن بوو، ئەم جلەش لەلایەن پاشاوە بە کەسێک دەدرا. |
| داعی | ئەو کەسە دەگەرێتەوە کە ئەرکی دوعا کردن و نزا کردنە. |
| دەرسەعادەت | ئیستەنبوڵ پایتەختی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. |
| دەفتەردار (دفتردار) | سەرۆکی ژمێریاری، بەرپرس لە کاروباری دارایی. |
| دەفتەر خاقانی (دفتر خاقانی) | دەفتەر خانەشی پێ ووتراوە فەرمانگەیەك بووە کاروباری پارەی دەوڵەت، موڵك و زەوی و زاری بەرێوە دەبرد، بۆ نموونە تاپۆ. |
| دزدار | پارێزگاری قەڵا. |
| دوخان | تووتن. |
| دوخانچی | تووتنچی؛ ئەو کەسە دەگەیەنێت کە کاری تووتن دەکات. |
| ژورنال | ژورنال دەفتەری رووداوەکان، یاخود دەفتەری رۆژانە. |
| رایج | رایج بەهاکەی تری، واتە نرخەکەی تری یاخود بەهای رابردووی. |
| رەدیف (ردیف) | بەو سەربازانە وتراوە رەدیف کە لە دواوەی سەربازی رێکخراو دەوەستان و ئەوانەش لە کاتی پێویست چەکیان پێ دەدرا. |
| رەژی (رژی) | فەرمانبەرانی فەرمانگەی تووتن. |
| روزهزر و روزقاسم | (Hıdırellez) لە دونیای تورک وەرزێکە جەژنی بۆ ساز دەکرێت، روزی هزر (Ruz-ı Hızır) واتە (رۆژی هزر) کە بە ناوی رۆژی خدری لەز (Hıdırellez) ناو نراوە، بە پێی داستانی ئەو سەردەمە ئەو رۆژەیە لە سەر رووی زەوی پێغەمبەر خدر و ئیلیاس بەیەک گەیشتوون، تاوەکو یارمەتی هەژار و لێقەوماوان بدەن. لە تورکیاش جەژن بۆ ئەم بۆنەیە دەگێردرێت. بە پێی رۆژژمێری زایینی رۆژی خدری لەز لە ٦ مایس، لە کۆنیش بە پێی رۆژژمێری رومی رۆژی ٢٣ نیسان هەژمار دەکرێت. ماوەی نێوان ٦ مایس تا ٨ تشرینی دووەم بە ناوی رۆژەکانی هزر وەرزی هاوین و ماوەی نێوان ٨ تشرینی دووەم تا ٦ مایس بە ناوی رۆژەکانی قاسم وەرزی زستان پێک دەهێنن. بەم شێوەیە رۆژی ٦ مایس تەواو بوونی وەرزی زستان و دەست پێکردنی وەرزی هاوین و رۆژە گەرمەکان نیشان دەدات. |
| رسوم (رسوم) | باج و باجی گومرگ. |
| رسومات (رسومات) | فەرمانگەی گومرگ. |
| ریاسەتپەناهی (ریاستپناهی) | پەیوەستە بە سەرۆکایەتیەوە، کە پابەندە بە کارەکانی پاشا، بۆ نموونە بۆ لایەنی پاشای ریاسەتپەناهی. |
| ریال | ریال پارەی زیوی ئاسیاوییە، دەکاتە ٢٥ قوروش. |
| ریکابی هومایۆنی شاهانە (رکاب هومایونی شاهانە) | سەربازە سوارەکانی پاشا. |
| ریکابی هومایۆنی قەپوچی باشی | بەرپرسی یاخود سەرۆکی دەرگای سەربازە سوارەکانی پاشا. |

| | |
|---|---|
| زەربخانەی عامیرە (ضربخانە العامرە) | ئەو شوێنەیە پارەی دەوڵەتی لێ دروست دەکرا. |
| سالیانە | ئەو باجەیە ساڵی جارێك وەردەگیرێت، لە پێش تەنزیمات بەشێك لە فەرمانبەران و بەکارهێنراوان کە ئەرك هەبووە، ساڵی جارێك کرێیان پێ دراوە. |
| سەدارەت (صدارت) | شوێنی کاری سەدری ئەعزەم و پلەکەیەتی. |
| سەدارەتپەناهی | پەیوەندی بە سەدری ئەعزەمەوە هەیە، واتە ئاماژەیە بۆ سەدری ئەعزەم. |
| سەدری ئەعزەم (صدر اعظم) | لە دەوڵەتی عوسمانی پلەکەی وەکو سەرۆک وەزیرانی ئێستا بووە، یاخود وەکیلی پاشا بووە. |
| سەر عەسکەر (سر عسکر) | سەر وشەیەکی فارسیە بە واتای سەر دێت، سەر عەسکەر بە واتاکانی ئێستا بە مانای سوپا سالار، سەر لەشکر، سەرکردەی سوپا، قوماندان دێت. |
| سەر کاتیب (سر کاتب) | سەرۆک یاخود یەکەم نووسەر. |
| سەعادەت (سعادت) | واتە خۆشی. |
| سەفەربەرلیك(سفربرلك) | واتە چوونە شەر، بەو کەسانە ووتراوە کە خۆیان ئامادە کردووە تا بچنە شەر یاخود بۆ چوونە شەر لە ئامادەباشی دابوونە. |
| سەلاملك (سلاملك) | لە کۆشکە گەورەکاندا بەو ژوورە دەوترا کە بۆ پێشوازی کردن لە میوانان تەرخان کرابوو. |
| سوریچی | ئەم پیاوەیە سەرپەرشتی ئاژەڵە بارهەڵگرەکان یاخود بارگیرەکان دەکات، واتە کرێچیە، وەکو خزمەت بووە، بەکرێ گیراوە تا بارگیرەکان بە رێگا ببات. |
| سیپاهی (سپاهی) | ئەو سەربازە سوارەیە خاوەنی تیمارە واتە زەوی کشتوکاڵییە، لە لەشکری عوسمانی کۆندا چینێک سەربازی سوارە هەبوو، لە بەرامبەر ئەو دە یەکە (عشر) لە زەوی کشتوکاڵی وەریاندەگرت لەگەڵ ئەو ئاژەڵانەی کە خۆیان بەخێویان دەکرد بەشداری جەنگیان دەکرد، بەڵام کەلوپەلی جەنگی لەلایەن دەوڵەتەوە پێی دەدرا. |
| سیپاهیدار (سپاهدار) | گەورەترین سەرباز، سەر عەسکەر. |
| سیلاحشۆر (سلاحشور) | واتە پیاوی چەکدار، ئەو پیاوانە بوونە لە چەك هەڵگرتن و بەکارهێنانی شارەزاییەکی تەواویان هەبووە، لە شەرەکان بە چەك شەریان کردووە. |
| شاهنشاه | گەورەترین پاشا یا شا، واتە پاشای پاشایان یاخود شای شایان. |
| شەهبەندەر (شهبندر) | بە واتای باڵیۆز دێت، لە سەردەمی مەحمودی دووەم لە ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ پاراستنی بازرگانە موسڵمانەکانی ناوەخۆ، لە نێوان خۆیان کەسێکیان هەڵدەبژارد تا هەر ناکۆکی و لێك تێنەگەیشتنێك هەبێت چارەسەری بکات. |
| شورای دەوڵەت بە زمانی عوسمانی (شورای دولت) | لە دەوڵەتی عوسمانیدا پێش ئەو دامەزراوەیە، ئەنجوومەنی والا کارەکانی دەکرد، دوای هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی والا، لە ساڵی ١٨٦٨ شورای دەوڵەت دامەزرا، جۆری کارەکەی لە کاری کارگێڕی پێک دەهات، ئەرکەکەشی دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشە کارگێڕییەکان و دەرکردنی یاسای گونجاو بوو، ئەم دامەزراوەیە تا ساڵی ١٩٢٢ بەردەوام بوو. |
| چاوش | وشەیەکی تورکیە ماناکەی سەربازی پلە بچووکە، لە ئەمڕۆشمان لە رووی سەربازییەوە بە پلەی پاسەوان دێت. |

| | |
|---|---|
| چەڵتوك (چلتوك) | برنج. |
| ڤۆیڤۆدە | لە سەردەمی عوسمانیەکان سەر بە خەزینە و فەرمانبەرێک بوو، ئەو داهاتانەی رێک دەخست کە لەلایەن ئافرەت، ئەفەندی، سەدری ئەعزەم، وەزیر، بەگی بەگان و بەگی سانجەقەکانەوە دەهات، هەروەها ئەوانە ئەرکێکی تریان هەبوو، ئەویش پاراستنی ئاسایش و رێکخستنی شوێنە تایبەتیەکانیان پێ درا بوو، ئەو شوێنەی ڤۆیڤۆدەکانی تێدا بوون، بەهۆی ئەوەی لە بەرێوەبردنەوە پیاوی هێز بوون، وایکرد بوو ناوە ناوە کێشە بۆ دەوڵەتی عوسمانی دروست بکەن. |
| عولوفە (علوفە) | ئەو زاراوەیە بوو کە لە سەردەمی عوسمانیەکاندا بەو سەربازانە دەوترا کە سێ مانگ جارێک مووچەیان وەردەگرت. |
| فەریق (فریق) | تاقم، تیپ، دوو لایەن، کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر، بە پلەی سەربازیش دێت، لە کۆن لە چینی سەربازی لە دوای موشیر دەهات، ئەویش گەورەترین پلەی سەربازی بوو. |
| فرقە | دەستە، کۆمەڵ. |
| قەپوچوقدار (قپوچوقدار) | ئەرک و خزمەت بوو، ئەو فەرمانبەرانە بوون لە بابی عالی لە ویلایەت لە خزمەتی قەپوکەتهودا دابوون و هەندێک داواکاری والییان جێبەجێ دەکرد. |
| قەپوچی باشی | بەرێوەبەری ئەو چینەیە، کە لە بەردەم دەرگای کۆشک وەستاون. |
| قەپوکەتهودا (قپوکتهودا) | قەپوکەتهودا خزمەتکاری بەر دەرگا بوون. |
| قەساس (قصاص) | سزای شەرعی بکوژی کوژراو و برینداركاری برینداركراوەكەیە، بۆ میراتی كوژراو داوای قەساس دەكەن، وەک بکوژیان قەساس کرد. |
| قپوچی باشی (قپوچی باشی) | قەپوچی بە دەرگای فەرمانگە و شوێنە فەرمییەکانی دەوڵەت دەوترا کە خەڵک بۆ ئیشوکارەکانیان لەم دەرگایە دەچوونە ژوورەوە و دەهاتنە دەرەوە، بێگومان ئەو دەرگایانەش بەرپرس و سەرۆکیان هەبووە، جگە لەوە قەپوچی باشیش پلەیەک بووە دراوەتە فەرمانبەرانی دەوڵەت، بۆ نموونە ریکابی هومایۆنی قەپوچی باشی (رکاب همایونی قپوچی باش). |
| قۆڵ ئاغا (قول اغا) | بە واتای قۆڵ، لێرەش قۆڵی ئاغا یەکسانە بە ئەفسەری قۆڵەکی تابور، یا خود یاریدەدەری بینباشی، قۆڵی راست و چەپی ئاغا. |
| قولی | قول؛ ئەو پیاوەیە بۆ ئەرك جێبەجێ كردن دەكرێت، هەرچی قولی؛ ئەو فەرمانبەرەیە بۆ چاودێری كردنی سەربازانی دوژمن و سەرپەرشتی کردنی زەوی و زار ئەرکی پێدەدرێت. |
| قوماندان | قوماندان سەرۆک یاخود بەرپرسی ئەفسەر دەکات، وەکو قوماندانی تابور، قوماندانی لەشکر، قوماندانی ئاڵای، قوماندانی ژاندارمە. |
| قۆناغ (قوناغ) | قۆناغ واتە مەنزل، لەسەر رێگا بۆ گەشتیاران و کاروانچیان دروست دەکرا، تا تێدا بحەسێنەوە و بخەون، هەروەها بۆ دەستنیشانکردنی دووری شوێنێک دەیانووت سێ قۆناغ یاخود چوار قۆناغ دوورە، واتە چەند قۆناغ لە نێوان ئەو دوو ناوچەیە هەبوایە هەژمار دەکرا، جگە لەوە بە کۆشکی پاشا و گەورەکان دەوترا قۆناغ یا قۆناق. فەرمانگەی حکوومەتیش پێی وتراوە قۆناغ وەکو قۆناغی حکومەت، کە هۆبەیەک لە هۆبەکانی فەرمانگەی فەرمی حکومەت پێی دەوترا قۆناغی حکومەت. |
| قیە | دەکاتە گرانی ٤٠٠ درهەم، بۆ دە یەکیش بە واتای کیلۆ دێت، کە بە قورسایی ١٠٠٠ گرام دەکات. |
| کەتهودا (کتهودا) | واتە خزمەتکار ئەوانەی پلەکەیان لە فەرمانبەر نزمتر بوو، پێیان دەوترا خزمەتکار. |
| کەلەك (كلك) | ئەو پارچە دارانەن کە بە ئاو ئەستوور کراون و یەك لە دوای یەك لە پاڵ یەکتر بە داو بەیەکتریەوە بەستراونەتەوە و تەختەیەکیان لێ پێکهێنراوە، ئەمەش بۆ گواستنەوەی مرۆڤ و کەلوپەل لە رووبارەکانی جەزیرە بە تایبەتی لە دیجلە بەکار هاتووە، ئەم کەلەکە بە گوێرەی گەورەییەکەی بۆ بەرێوەبردنی ٢ تا ٦ پیاوی پێویستە. دوای تەواو بوونی گەشتەکە بە تایبەتی لە سەر رووباری دیجلە تا دەگاتە بەغداد بەشی دارەکانی کەلەکەکە زۆر جار بە نرخێکی هەرزان دەفرۆشرا، هەروەها قازانجی راستەقینەی کەلەکچیەکان لەو کرێیە پێك هاتبوو، کە لە کاروانچیەکان وەریاندەگرت. ئەو کەلەکچیانە لەسەر رووباری دیجلە تا خوارەوە کەرستەی بیناکاری و دانەوێلە و باری گرانیشیان بار دەکرد. لە جەنگی جیهانی یەکەم سەربازیشیان پێ گوازراوەتەوە. |

| | |
|---|---|
| کیل | کیل، بۆ پێوانی دانەوێڵە بەکارهاتووە. |
| گاردیان | فەرمانبەری گرتووخانە. |
| مەشروتیەت (مشروطیت) | مەشروت واتە مەرجدار کە پەیوەستە بە مەرجەکانەوە، مەشروتە واتە لەلایەن یەکەم خاوەنیەوە بە مەرجی نەفرۆشتن بۆ میراتگرەکانی بەجێی هێشتووە، ئەویش وەکو خانوو، زەوی کشتوکاڵی، نەخۆشخانە، مزگەوت، هەرچی مەشروتیەتە ئەوا ئەو حوکمدارە دەگرێتەوە کە لە ژێر دەسەڵاتی سەرۆکایەتیە. |
| مەمالیکی مەحروسەی شاهانە (ممالیکی محروسە شاهانە) |ووڵاتی عوسمانی. |
| مەمالیك (ممالك) | ووڵاتەکان، مەملەکەتەکان، خاکی ووڵاتێك. |
| مەملوک (مملوک) | کەسێک پارەی هەبێت، یاخود بەندە، کۆیلە. |
| مەنزل | لە بنەڕەتدا وشەیەکی عەرەبیە، بە زۆر مانا دێت، ئەوەی لە زمانی عوسمانیدا پێویستە بە مانای کۆشک، شوێنی کوشک، سەرە ڕێگای یەک ڕۆژ دێت، یاخود بە مانای دووری نێوان دوو کۆشک دەکات، تاتارەکان لە کاتی بردنی پۆستە بۆ ناوچەکانی تر، لەم مەنزیلانە هاتوونەتە خوارەوە و حەساونەتەوە، هەروەها ئەسپیان گۆڕیوەتەوە، یاخود شەویان لەوێ بەسەر بردووە. |
| موشیر (مشیر) | بە مانای ئاماژە پێکردن دێت، لەلایەکی تر لە چینی سەربازی لەگەڵ وەزارەت یەکسانە، کە گەورەترین پلەی سەربازیە، بۆ نموونە موشیری لەشکر، موشیری تۆپخانە. |
| موعەجەلە (معجلە) | موڵکی میریە و لە وەقف دیارە، هەر لە وەقف مامەڵەی بۆ دەکرێت، کە پارەکەی پێش وەختە دەدرێت. واتە بە شێوەی بەکایەتی و وەرگرتنی پارەی پێشەکی لەلایەن ئاوقافەوە دەبێت. |
| موقاتەعە (مقاطعە) | ووشەی موقاتەعە هەر لە سەرەتاوە، ئەو زەوییانە بوونە کە خاوەنداریەتی بۆ دەوڵەت یاخود وەقفەکان بووە، بە کرێ دراوەتە کەسی تایبەت و دامەزراوەکان بە شێوەی ڕێککەوتن بووە، جگە لەوەش بڕی پارەکە دیاری دەکرا و ئەو پارەیەش ڕاستەوخۆ دەچووە خەزینەی دەوڵەت. |
| میعمارباشی (معمارباشی) (سەرۆکی بیناسازی) | سەرۆکی بیناسازی، کاری سەرپەرشتیکردنی بیناسازی، هەروەها لە پیشەکەی خەریکی دابەشکردن و ڕێکخستنی کارەکەی بووە. |
| نازر (ناظر) | لە بینین هاتووە، واتە سەیرکردن، کە لە هەموو شوێنێک ئامادە و سەیرکەرە، ئەرکەکەشی بەڕێوەبردن و بەڕێکردنی کاروبارەکانە، وەکو نازری دارایی. |
| نەزارەت (نظارت) | لە زاراوەی بینین هاتووە؛ واتە چاودێری کردن و بینینی دەورووبەر. لەلایەکی تر بە مانای سەرۆکایەتی و بەڕێوەبردنی کاروبارەکان دێت. بە زاراوەی ئێستا بە مانای وەزارەت دێت. |
| هومایۆن (هومایون) | پاشا. |
| وەکالەتپەناهی (وکالتپناهی) | پیشەی سەدری ئەعزەم، ئەو کارەیە کە پەیوەندی بە سەدری ئەعزەمەوە هەیە، یەکسانە بە سەرۆکی بریکار. |
| یوزباشی | لە بنەڕەتدا بە مانای ١٠٠ کەس دێت، لە رووی سەربازییەوە ئەو ئەفسەرە دەگرێتەوە کە قۆماندانیەتی یەک بلۆک سەرباز دەکات لە ١٠٠ سەرباز پێکهاتوون، بۆ نموونە یوزباشی سوارە، یوزباشی پیادە، یوزباشی ژاندارمە، یوزباشی ڕەدیف. |
| یوک | یوک بە مانای بار دێت، هەڵگرتنی بار ئینجا چ لەلایەن مرۆڤەوە بێت یاخود ئاژەڵ وەکو بارگیر و ئەسپ و گوێدرێژ، لەلایەکی تر بە مانایەکی تریش دێت کە یەک یوک دەکاتە بڕی ٥٠٠ هەزار قوروش. |

# کۆد و ووشەی ڕەسەنی کۆدەکان

| | | |
|---|---|---|
| A.AMD. | Bab-i Âsafî<br>Âmedî Kalemi | بابی عەسافی |
| A.DVN. | Sadaret<br>Divan Kalemi Evrakı | سەدارەت، کاغەزەکانی دیوانی قەڵەم |
| A.E.I. ABDÜLHAMİD. | Ali Emiri Tasnifi I. Abdülhamid | پۆلینکردنی میری عەلی، عەبدولحەمیدی یەکەم |
| A.E.III. OSMAN. | Ali Emiri Tasnifi III. Osman | پۆلینکردنی میری عەلی، عوسمانی سێیەم |
| A.E.III.AHMED. | Ali Emiri Tasnifi III. Ahmed | پۆلینکردنی میری عەلی، ئەحمەدی سێیەم |
| A.E.III.MUSTAFA. | Ali Emiri III. Mustafa | پۆلینکردنی میری عەلی، مستەفای سێیەم |
| A.MKT. | Sadaret<br>Mektubi Kalemi | سەدارەت، قەڵەمی تۆمار |
| A.MKT.DV. | Sadaret<br>Mektubi Kalemi Deavî | سەدارەت، دیوانی قەڵەمی تۆمار |
| A.MKT.MHM. | Sadaret<br>Mektubi Kalemi Mühimme | سەدارەت، قەڵەمی تۆمارە گرنگەکان |
| A.MKT.MİTM. | B.E.O. Sadaret Evrakı | بابی عالی، کاغەزەکانی سەدارەت |
| A.MKT.MVL. | Sadaret<br>Mektubi Kalemi Meclis-i Vala | سەدارەت، قەڵەمی تۆماری ئەنجوومەنی والا |

| A.MKT.NZD. | Sadaret<br>Mektubi Kalemi Nezaret Ve Devair | سەدارت، قەڵەمی تۆماری<br>نەزارت و دیوان |
|---|---|---|
| A.MKT.UM . | Sadaret<br>Mektubi Kalemi Umum Vilayet | سەدارت، قەڵەمی تۆماری<br>گشت ویلایەتەکان |
| BEO. | Babıali Evrak Odası | کاغەزەکانی ژووری بابی عالی |
| C.AS. | Cevdet<br>Tasnifi Askeriye | جەودەت، پۆلینکردنی سەربازی |
| C.EV. | Cevdet<br>Evkaf | جەودەت، ئاوقاف |
| C.NF. | Cevdet<br>Nafia | جەودەت، نافیە |
| C.T. | Cevdet<br>Timar | جەودەت، تیمار |
| DH.EUM.EMN. | Dâhiliye Nezareti<br>Emniyet-i Umumiye Müdüriyet Şubesi | نەزارەتی ناوەخۆ، یەکەی<br>بەڕێوەبەرایەتی ئەمنیەتی<br>گشتی |
| DH.EUM.MKT. | Dâhiliye Nezareti<br>Emniyet-i Umumiye Müdüriyeti Posta<br>Mecmuası | نەزارەتی ناوەخۆ،<br>بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵەی<br>پۆستەی ئەمنیەتی گشتی |
| DH.I.UM.EK. | Dâhiliye Nezareti<br>İrade-iUmummiye Ekleri | نەزارەتی ناوەخۆ، پاشکۆی<br>فەرمانی گشتی |
| DH.ID. | Dâhiliye Nezareti İrade | نەزارەتی ناوەخۆ، فەرمان |

| | | |
|---|---|---|
| **DH.MB.HPS.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Meban-i Emiriye-Hapishâneler** | **نەزارەتی ناوەخۆ، بینایەکانی میری-گرتووخانەکان** |
| **DH.MB.HPS.M.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Meban-i Emiriye Hapishâneler Müdüriyeti** | **نەزارەتی ناوەخۆ، بەرێوەبەرایەتی گرتووخانەکانی بینایەی میری** |
| **DH.MKT.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Mektubi Kalemi** | **نەزارەتی ناوەخۆ، قەڵەمی تۆمار** |
| **DH.ŞFR.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Şifre Kalemi** | **نەزارەتی ناوەخۆ، قەڵەمی شیفرە** |
| **DH.SN.THR.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Sicill-i Nüfus idare-i umumiyesi tahrirât Kalemi** | **نەزارەتی ناوەخۆ، تۆماری ناسنامە، فەرمانی گشتی قەڵەمی تۆمارکردن** |
| **DH.TMIK. M.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Tesr-i Muamelat Ve Islahat Komisyonu Muamela** | **نەزارەتی ناوەخۆ، مامەڵەی قۆمیسیۆنی چاکسازی و مامەڵەی بەپەلە** |
| **DH.TMIK.S.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Tesrî-i Muamelat ve Islahat Komisyonu** | **نەزارەتی ناوەخۆ، قۆمیسیۆنی چاکسازی و مامەڵەی بەپەلە** |
| **DH.UMVM.** | **Dâhiliye Nezareti**<br>**Umur-i Mahalliyye Ve Vilayat Müdürlüğü Kataloğu** | **نەزارەتی ناوەخۆ، کاروباری دارایی و کەتەلۆگی بەرێوەبەرایەتی ویلایەت** |
| **HR.MKT.** | **Hariciye Nezareti**<br>**Mektubi Kalemi Evrakı** | **نەزارەتی دەرەوە، کاغەزەکانی قەڵەمی تۆمار** |

| | | |
|---|---|---|
| HR.SYS. | Hariciye Nezareti<br>Tahrirat-ı Hariciye Odası | نەزارەتی دەرەوە، ژووری<br>تۆماری دەرەوە |
| I.AS. | Irade Askeri | فەرمانی سەربازی |
| İ.DH. | Irade Dâhiliye | فەرمانی ناوەخۆ |
| I.DUIT. | Irade Dosya Usulü Iradeler Tasnifî | ڕێگاکانی فەرمانی دۆسیە،<br>پۆلینکردنی فەرمان |
| I.HB. | Irade Harbiye | فەرمانی جەنگی |
| I.HUS. | Irade Hususi | فەرمانی تایبەتی |
| İ.ML. | Irade Maliye | فەرمانی دارایی |
| İ.MMS. | Irade Meclis-i Mahsus | فەرمانی ئەنجوومەنی تایبەت |
| I.MVL. | Irade Meclis-i Vâlâ | فەرمانی ئەنجوومەنی والا |
| I. ŞD. | Irade Şura-yı Devlet | فەرمانی شورای دەوڵەت |
| İ.TAL. | Irade Taltifat | فەرمانی ڕێزگرتن و بەخشین |
| İE.EV. | Ibnulemin Tasnifi Evkaf (Vakıf) | پۆلینکردنی وەقفی<br>ئیبنولئەمین |
| MF.MKT. | Maarif Mektubi Kalemi | قەڵەمی تۆماری مەعاریف |
| MV. | Meclis-i Vükela<br>Meclis-i Vükela Matbataları | ئەنجوومەنی بریکارەکان،<br>چاپکراوەکانی ئەنجوومەنی<br>بریکارەکان |

| | | |
|---|---|---|
| MVL. | Meclisi Vâlâ | ئەنجوومەنی والا |
| MVL. | Meclis-i Vâlâ<br>Meclis-i Vâlâ Evrakı | ئەنجوومەنی والا، کاغەزەکانی ئەنجوومەنی والا |
| Ş.D. | Şura-yı Devlet Evrak | کاغەزەکانی شورای دەوڵەت |
| Y.A.HUS. | Yıldız<br>Sadâret Hususi | ئەستێرە، تایبەت بە سەدارەت |
| Y.MTV. | Yıldız<br>Mütenevvi Maruzât Evrakı | ئەستێرە، کاغەزی داواکاریە وون بووەکان |
| Y.PRK. AZJ | Yıldız<br>Perakende, Arzuhâl ve Jurnaller Kataloĝu | ئەستێرە، نارێك، کەتەلۆگی داواکاری و ژورنال |
| Y.PRK.ASK. | Yıldız<br>Tasnifi Perakende Evrakı Askeri Maruzat | ئەستێرە، پۆلینکردنی نارێکی کاغەزەکانی داواکاری سەربازی |
| Y.PRK.DH. | Evrakı Dâhiliye Nezareti Maruzatı | کاغەزەکانی داواکاری نەزارەتی ناوەخۆ |
| Y.PRK.PT. | Yıldız<br>Perakende Posta ve Telgraf | ئەستێرە، پۆستە و تەلەگرافی نارێك |
| Y.PRK.SH. | Yıldız<br>Tasnifi Perakende Evrakı Sıhhıye Nezareti Maruzatı | ئەستێرە، پۆلینکردنی کاغەزی داواکاریە نارێکەکانی نەزارەتی تەندروستی |
| Y.PRK.UM. | Evrakı Umum Vilayetler Tahriratı | کاغەزی گشتی، تۆماری ویلایەتەکان |



A.}MKT.00065.00029.001

| 18 سەفەر 1263 | **00065.00029** | **A.MKT.** |
|---|---|---|

بۆ جەنابی میری میرانی ستودەشیم ئەفەندی
ئەحمەد سابت (احمد ثابت) خوا هیدایەتی داوە و هاتۆتە ناو ئایینی ئیسلام، لەبەر خراپی بژێوی ژیانی داواکاریەکی پێشکەش کردووە، لەسەر فەرمانی میری میران بۆ شەریفەکان نێردراوە، ناوبراو کاتی خۆی لە لایەنی سەربازی خزمەتی کردووە، لەبەر ئەوەی زانیاری لە بارەی سەربازیەوە هەیە، بۆیە لەو تابورانەی کە لە سانجەقی سلێمانی رێك دەخرێت، شوێنێکی بۆ دابین دەکرێت، بەڵام گونجاوترە بنێردرێتە بەغداد، خۆشی داوای کردووە بۆ لایەنی میری میران بنێردرێت، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە هیممەت بکرێت لە ئەنجامدانی، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراوی بە پەلە نووسراوەتەوە، لە 18 سەفەر 1263.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT
149 | 38 | 1

A.}MKT.00149.00038.001

| A.MKT. | 00149.00038 | 20 شەوال 1264 |
|---|---|---|

٧٧٥

بۆ والی بەغداد و موتەسەرفی سلێمانی

لە سانجەقی سلێمانی، مستەفا ئاغا لە بەرێوەبەرایەتی خانەی پاراستن ئەرکی پێ دراوە و دامەزراوە، ئەمجارە لە بارەی رۆیشتنی بۆ ئەم شوێنە رێزی لێ بگیرێت و ئاماژەی پێکراوە کە لە کاروباری ئەرکەکەیدا هاوکاری بکرێت، بۆ ئەم رێزگرتن و هاوکاری کردنی ناوبراو ئاسانکاری بکرێت و هیممەت بکرێت، نووسراو کراوە.

بە ئاماژەی جەنابی راوێژکار




A.}AMD.00018.00094.001

| A.AMD. | 00018.00094 | 18 ڕەجەب 1266 |
|---|---|---|
| نووسراوی سەدری ئەعزەم<br>لە لەشکری هومایۆنی عیراق و حیجاز، موشیری جەنابی پاشا گەیشتۆتە سلێمانی، لەسەر ئەم ئاژاوەیەی کە لەوێ ڕوویداوە، لەگەڵ جەنابی ملوکانە گفتوگۆی کردووە، باس لەوە کراوە کە بە چ شێوازێك لەناوبردراوە، بۆ ئەمەش والی بەغداد جەنابی پاشا پارچەیەك نووسراوی هاتووە، لەسەر فەرمانی جەنابی شاهانە پێشکەش کراوە، بە ڕاگەیاندنی نووسراو بکرێت. | | |


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT.MHM
21 | 56

A.}MKT.MHM.00021.00056.001

| A.MKT.MHM. | 00021.00056 | 14 ڕەجەب 1266 |
| --- | --- | --- |

بۆ جەنابی سەر عەسكەری پاشا
ئـەو گـرژی و تێكچوونـەی كـە لـە سـانجەقی سـلێمانی ڕوویـداوە، بـە تەواوەتـی كۆتایـی پێهاتـووە، بابەتەكـەش بـە تەواوەتـی لەلایـەن جەنابـی موشـیرەكانی لەشـكری هومایۆنـی عیـراق و حیجـاز و ئەنـادۆڵ ڕوون كراوەتـەوە و بـە نـووسراو بـۆ سـپاهیدار نێـردراوە، ئـەو چەنـد پارچـە نووسراوانـەی كـە نێـردراوە، پێشكەشـی جەنابـی شـاهانە كـراوە و نیشـانی دراوە، لـە پەراوێـزی نـووسراوی بەپەلـە فەرمانـی پاشـا دەنووسرێتـەوە، هەروەهـا لەلایـەن سەرعەسـكەرەوە وەڵام بـۆ جەنابـی ناوبـراوان دەنووسرێـت، هاوپێچەكـەی بـۆ واڵا دەنێردرێـت، بـە جێبەجـێ كردنی نـوسراوی ناوهاتوو بنێردرێتـەوە، فەرمـان بـۆ ئەفەندیمـە.



A.}MKT.UM.00025.00023.001

| 6 شەوال 1266 | 00025.00023 | A.MKT.UM. |
| --- | --- | --- |

راگەیەندراوی بەندەیەکتانە کە هیچ نرخێکی نییە
لـە سـەر داواکاریەکـەی تـری بەندەمـان کـە راگەیەنـدرا بـوو، بـە بەراوردکردنـی کارگێـری پێشـووی سـانجەقی سـلێمانی، زانـاکان لـە خۆیـان زیاتـر کەسـی تـر نایانناسـێت و بـە پەیوەسـت نەبوونیـان بـە دەوڵەتـی عالیـە، لەلایـەن ئـەو پاشـایانەی کـە قائیمقامیەتیـان وەرگرتـووە، ئەمانـە لـە سـەڵتەنەت سـوودیان لـێ وەرنەگیـراوە و لـە سـەڵتەنەت لـە زانسـت و دیـوان بیرۆکەیـان وەرنەگیـراوە و شـتێکیان بـۆ نەکـراوە، ئێـرە زانـای زۆرە و بڵاوکراوەیـان زۆرە و بـە داهێنـەری پەرتـوك ناوبانگیـان دەرکـردووە، بۆیـە لـە پلەکانـی سـەڵتەنەت بـێ بـەش نەکرێـن و لـە هەمـوو لایەنێکـی پلـەی سـەڵتەنەت سـوودیان لـێ وەربگیرێـت، بانـگ بکرێـن و بهێنرێـن کـە دڵیـان رابکێشرێـت، ئەمانـە شایسـتەی میهرەبانـی پاشـان، ئـەو زانایانـەی کـە بـاس دەکرێـن، بـە چاکـە و دینـداری لەگـەڵ خـاوەن زانسـت و لـە خـوا تـرس ناوبانگیـان دەرکـردووە، نـاوی چەنـد کەسـێکیان لـە پارچەیـەك پۆسـتە بـە دیاریکردنـی ژمـارە پێشکەشـی عالـی بکرێـت، دوای نیشـاندانی رەزامەنـدی ئـەم زایانـەی کـە ناویـان نـووسراوە لـە ئەدرنـە یاخـود برۆسـە بـە پیشـەی مودەریـس کار بکـەن، لـەم بارەیـەوە هـاوکاری پاشـای پەیوەندیدارانـی فەتـوای پێویسـتە، لـە هـەر حالەتێـك ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ٦ شـەوال ١٢٦٦.
مۆری محەمەد نامق بەندە موشیری لەشکری حیجاز و عیراق


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT.NZD
18 84

A.}MKT.NZD.00018.00084.001

| A.MKT.NZD. | 00018.00084 | 15 موحەررەم 1267 |
| --- | --- | --- |
| بۆ جەنابی پاشای سەر عەسکەر<br>لەسەر هەندێك ووتەی سانجەقی سلێمانی، لە رۆژانی رابردوو لەلایەن قائیمقامی لیوای ناوهاتوو نووسراو هاتووە، بۆ والای سیپاهی نێردراوە، ئەمجارە هەر لەسەر ئەم بابەتە نووسراوی ناوهاتوو هاتووە، لەسەر فەرموودەی دەوڵەت بۆ سەر عەسکەر نێردراوە، دوای خوێندنەوەی ئەم بابەتە، بە ئاماژەی خوێندنەوەی سیپاهیدار نووسراوی ناوهاتوو دەنێردرێتەوە، فەرمانی ئەفەندیمانە. | | |


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT.MHM
26 | 20

A.}MKT.MHM.00026.00020.001

<table dir="rtl">
<tr><td>A.MKT.MHM.</td><td>00026.00020</td><td>13 سەفەر 1267</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ جەنابی سەر عەسکەری پاشا<br>لە بارەی بارودۆخی سانجەقی سلێمانی، ئەمجارە قائیمقام ئیسماعیل پاشا پارچەیەك نووسراوی هاتووە و لەسەر قسەی سیپاهیدار هاوپێچ نێردراوە، قائیمقامی ناوهاتوو لە ڕۆژانی رابردوو لەم نووسراوەی کە هاتووە بۆ لایەنی دەوڵەت نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکان خوێندنەوەی بەهیەی بۆ کراوە و لەگەڵ ئاماژەکردن بە ناردنەوەی نووسراوەکان، لەسەر فەرمانی ئەفەندیمان وەستاوە.</td></tr>
</table>




A.}MKT.UM.00086.00075.001

<table dir="rtl">
<tr><td>A.MKT.UM.</td><td>00086.00075</td><td>3 سەفەر 1268</td></tr>
<tr><td colspan="3">راگەیەندراوی بەندەیە<br>ئەمجارە قائیمقامی پێشوو ئیسماعیل پاشا لە میری میرانی سانجەقی سلێمانی، گەراوەتەوە و چۆتە دەرسەعادەت، هەروەها پاشای ناوهاتوو ماوەیەکی زۆرە لە عیراقە، زانیاری و ئاگاداری لەسەر هەموو بارودۆخی ناوچەکە هەیە، جگە لەمە دڵسۆزی و کارە باشەکانی شایەدە و خۆشی لە هاوڕییانی سەڵتەنەتە و ئەرکی پێشووی هەبووە، بۆیە شایەنی ڕێزلێنان و پاداشتە، هەروەها لەلایەن جەنابی پاشای والی کوردستان شایەدی بۆ دراوە کە کەسێکی باشە، ئەم داواکاریەی پێشکەش کراوە، تێدا بوێری کراوە کە ناوبراو پاداشت بکرێت، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>٣ سەفەر ١٢٦٨<br>مۆری بەندەی لەشکری ئەنادۆڵی</td></tr>
</table>




A.}MKT.MHM.00057.00013.001

| A.MKT.MHM. | 00057.00013 | 15 شەوال 1269 |
|---|---|---|
| بۆ جەنابی پاشای سەر عەسکەر<br>بە پێویست زانراوە هێزی سەربازی لە سانجەقی سلێمانی جێگیر بکرێت، هەروەها لەسەر گشت ووتەکان، نووسراوەکانی جەنابی پاشای والی شارەزوور هاتووە، لەگەڵ ئەم نووسراوانە کاغەزەکانی هاوپێچ بە فەرموودەی سەدری ئەعزەم نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردنی ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات. | | |


OSMANLI ARŞIVI DAIRE BAŞKANLIGI

İ.DH 260/16120

2

İ.DH.00260

| I.DH. | 00260.016120 | 11 موحەررەم 1269 |
| --- | --- | --- |

جەنابی ئەفەندیم

لەلایـەن جەنابـی پاشـای قائیمقامـی سـلێمانی نـووسراو هاتـووە و لەگـەڵ نووسراوی سـەر عەسـکەر پێشکەشـی عالی کـراوە، لـە بابەتـی ئاسایشـی سـانجەقی سـلێمانی راگەیەنـدراوە، کـە بـە چ شـێوەیەك بەرقـەرار بـووە، جگـە لەمـە جەنابـی پاشـا بـە فەرمانـی پاشـا رەزامەنـدی داوە بـە دەسـتکەوتنی داهاتـی پاشـا مووچـەی سـەربازانی شـاهانەی پـێ بدرێـت، ، بەهـۆی بەرەوپێشـچوونی تۆمـار بارەکـە باشـتر بـووە، لەمـەودوا هـەوڵ و کۆششـی پێویسـت ئەنجـام دەدرێـت و لەلایــەن پاشــای ناوهاتــووەوە وەڵام دەنووسرێتــەوە، نــووسراوی باســکراویش بــۆ لایــەنی سوپاســالار دەنێردرێـت، بـە راگەیاندنـی نـووسراو نووسراوەتـەوە و ژمارەی لەسـەر تۆمارکـرا ئەفەنـدم، لـە ١١ موحـەررەم ١٢٦٩.



İ.MVL.00285

| 4 زیلحیجه 1269 | 00285.011265 | I.MVL. |
|---|---|---|

پارچەیەك راپۆرت لە نەزارەتی دارایی جەلیلە دراوەتە ئەنجوومەنی والا، پزیشكێك بە ناوی وادش هاووڵاتی ئوستورالیا لە پاراستنخانەی (ئەو شوێنەیە تەرخان كراوە تاوەكو رێگە لە بڵاوكردنەوەی مردن و نەخۆشی بگیرێت) سلێمانی ئەركی پێ دراوە، بۆ هەر مانگێك كە لە ١٥٠٠ قوروش پێك دێت، بە كۆی گشتی سێ مانگ و ١٥ رۆژ دەبێتە ٥٢٥٠ قوروش، لە خەزینەی جەلیلە مووچەی بۆ دابین كراوە و رەزامەندی دراوە لە خەرج كردنی، ئەگەرچی لە نەزارەتی ناوهاتوو حەواڵە كراوە و لە ئەنجوومەنی والا نووسراوی بۆ كراوە، بەڵام ئەم بابەتە پەیوەستە بە ئەمر و فەرمانی پاشای پەیوەندیداری وەكالەت، ئەگەر بفەرمووێت جێبەجێ دەكرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو كەسەیە كە فەرمان دەردەكات، لە ٤ زیلحیجە ١٢٦٩.


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞIVI DAIRE BAŞKANLIGI (BOA)

İ. DH 289/18180

İ.DH.00289

| 22 ڕەبیعی کۆتایی 1270 | 00289.018180 | I.DH. |
|---|---|---|

جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم

لــە پایــەی میــری میــران، ڕاپۆرتەکــەی جەنابــی پاشــای نــازری دارایــی لــکاوە بــە بڕیارنامــەی ئەنجوومەنــی ژمێریــاری و پێشــکەش کــراوە تــا بدرێتــە جەنابــی شاهنشــا، لەســەر مردنــی محەمــەد ئەفەنــدی شــێخی تەکیــەی شــەریفەی گونــدی ماویرانــی ســەر بــە ســانجەقی ســلێمانی، کــە تەکیەکــەی لــە بــاج و ســەرانەی ماردیــن و موســڵ خۆراکــی بــۆ دابیــن کــراوە، ناوبراویــش ئەرکــی نــزاکاری هەبــووە و ڕۆژانــە ٥ قوروشــی وەرگرتــووە، بــۆ ئــەوەی بدرێتــە شــێخ نەسروڵــڵا ئەفەنــدی کــە لــە بنەچەیەکــی پاکــە، لــە خەزینــە مۆڵــەت دراوە بــە جێبەجــێ کردنــی، بــەڵام لــەم بابەتــەدا ئەمــر و فەرمانــی جەنابــی پاشــا هــەر چییــەك بێــت، بــە گوێــرەی ئــەوە پەلــە دەکرێــت لــە جێبەجــێ کردنــی کارەکــە، بەڕاگەیاندنــی نــووسراوی نــووسراوە ژمــارەی لەســەر تۆمــار کــرا ئەفەنــدم.

لە ٢٢ ڕەبیعی کۆتایی ٧٠




A.}MKT.MHM.00078.00083.001

<table>
<tr><td>A.MKT.MHM.</td><td>00078.00083</td><td>26 سەفەر 1272</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ جەنابی پاشای سەر عەسکەر<br>بـۆ کارگێـری ئێسـتای سـانجەقی سـلێمانی و لەشـکری هومایۆنـی ئەنادۆڵـی لـە لـە ئەیالەتـی شـارەزوور، بـڕە پارەکـە ڕێکخـراوە و لـە داهاتـی لیـوای ناوهاتـوو ١٠٠٠ کیسـە نێـردراوە، ئـەوەی ماوەتـەوە ٥٠٠ کیسـەکە لەمـەودوا دەنێردرێـت، لەلایـەن قائیمقامـی لیـوای ناوهاتـوو نـووسراو هاتـووە، بـۆ واڵای سـەر عەسـکەر نێـردراوە، وەڵام دەنووسرێتـەوە نـووسراوی باسـکراو دوای خوێندنـەوەی دەنێردرێتـەوە، فەرمانـی ئەفەندیمانـە.</td></tr>
</table>



A.}MKT.MVL.00087.00099.001

| A.MKT.MVL. | 00087.00099 | 17 شەوال 1273 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی و ئاوقافی هومایۆنی جەلیلە
لـە مەدینـەی منـەووەرە، ئیسـماعیل بەرزنجـی سەرپەرشـتیار لەسـەر مەزهەبـی شـافعی، لـە بەرامبـەر ئـەو مولکانـەی کـە لـە سـانجەقی سـلێمانی هەیەتـی، داوای کـردووە لـە خەزینـەی دارایـی مانگانـە ٩٩٧ قـوروش و نیـو مووچـەی بـۆ ببڕێتـەوە، بۆیـە لـە سـەرەتای ساڵەوە بـە پێشـین لـە خەزینـەی جەلیلـە دراوە و لەگـەڵ دیـاری هومایـۆن (پارەوپـول و دیـاری کـە سـاڵانە فەرمانـڕەوا بـۆ مەککـەی دەنـارد)، بەیەکـەوە دەنێردرێـت، بـۆ ئەمـەش حەواڵـەی واڵا کـراوە، بـە جێگیـر بوونـی لـە واڵا و بـە مۆڵەتدانـی، فەرمانـی پاشـای جەنابـی شاهنشـا لـە مەرکـەز فەرموویەتـی، بـۆ جێبەجـێ کردنـی ڕێکخستنەکەشـی حەواڵـەی نەزارەتـی جەلیلـەی ناوهاتـوو کـراوە، لەگـەڵ ڕاگەیاندنـی نـووسراو بکرێـت، بـۆ جێبەجـێ کردنـی فەرمانـی پاشـاش هیممـەت بکرێـت، لـە ١٧ شـەوال ١٢٧٣.





| 12 شەوال 1274 | 00239.00058 | HR.MKT. |
|---|---|---|

- نووسراوی سەدری ئەعزەم بۆ جەنابی فەریق دەرویش پاشا
مەروماڵاتی هۆزی ئیسماعیل عەزیر کە سەر بە سانجەقی سلێمانییە، لە لایەن حاکمی سنە تاڵان کراوە، بۆ ئەم مەبەستە لێکۆڵینەوە کراوە و نووسراوەکان نێردراوە، لە وەڵامدا نووسراوی والی شارەزوور جەنابی پاشا نێردراوە، بە گوێرەی پوختەی بابەتەکە هۆزی ناوبراو لە ئێرانیەکانە، لەلایەن فەرمانبەرانی ئێرانەوە ئەم پروپاگەندەیە دروست کراوە، بە خوێندنەوەی بابەتەکە ئەو زانیاریانەی کە هەیە، بە راگەیاندن و ئاماژەی والاکانەوە، هیممەت بکرێت لە ناردنەوەی کاغەزە باسکراوەکان، نووسراو بکرێت.

- ١٠٥٩
لە ١٢ شەوال ١٢٧٤
نووسراوی سەدری ئەعزەمە بۆ فەریق دەرویش پاشا
پروپاگەندەی ئەوە کراوە کە هۆزی ئیسماعیل عەزیر لە هۆزی ئێرانیە، بۆ ئە مەبەستە نووسراوی والی شارەزوور نێردراوە.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT.UM
281 | 14 | 1

A.}MKT.UM.00291.00014.001

| 10 موحەررەم 1274 | 00291.00014 | A.MKT.UM. |
| --- | --- | --- |

بۆ موتەسەرفی شارەزوور
رەفعەت ئەفەندی موعەلیمی مەکتەبی روشدیە، لە گوندی کلکنی سەر بە سانجەقی سلێمانی پاشکۆی ئەیالەتی بەغداد، لە باوکییەوە زەوی کشتوکاڵی بۆ ماوەتەوە و ئاوی شیرین بە ناویدا تێدەپەڕێت، بەڵام لەلایەن هەندێك کەس ووتوویانە هی ئێمەیە و دەستیان بەسەر داگرتووە، لەبەر ئەوەی ئەمە بە زوڵم هەژمار دەکرێت، داواکراوە هەر لە شوێن خۆی ڕێگە بەمە نەدرێت و زەوی کشتوکاڵی ناوهاتوو رادەستی وەکیلەکە و مامەکەی بە ناوی نەسروڵڵا ئەفەندی بکرێت، بە شەرعی شەریف و زانیاری ئەنجومەن بابەتەکە روون دەبێتەوە، لە بارەی ڕێگە گرتن هیممەت بکرێت لە ئەنجامدامی کارەکە و نووسراو بۆ سەروو بکرێت.

بە ئاماژەی جەنابی وەکیلی راوێژکار.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT.UM
296 | 21 | 1
A.}MKT.UM.00296.00021.001

<table>
<tr><td>A.MKT.UM.</td><td>00296.00021</td><td>13 رەبیعی یەکەم 1274</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ موتەسەرفی شارەزوور<br>عەبدولرەحمان پاشازادە عەزیز بەگی سلێمانی مردووە کە عوسمان ئەفەندی خەزووریەتی، ناوبراو بۆ ئەوەی لە سانجەقی سلێمانی خێزان و منداڵەکانی کۆچکردوو بگوازێتەوە دەرسەعادەت، لە وەرگرتنی مۆڵەتی پەرینەوەیان ئاماژەی پێکراوە، ئەمانە لە شوێن خۆیان باجیان لێ وەردەگیرێت، دوای پەیداکردنی کەفیل، باج وەرگرتنەکە لە شوێنی خۆیاندا بە بێ هیچ کێشەیەك ئەنجام دەدرێت، بە دەرچوونی ناسنامەی پەرینەوەیان هیممەت بکرێت لە پێدانی، نووسراو بکرێت.<br>لەلایەن ئەمینی کەلوپەلی گومرگ، جەنابی بەگ ئەفەندی</td></tr>
</table>


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT.NZD
276 | 4

A.}MKT.NZD.00276.00004.001

| 25 جەمادی کۆتایی 1275 | 00276.00004 | A.MKT.NZD. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە

١٣ کەس لە گوندی گولدەرەی سەر بە سانجەقی سلێمانی کە لە خانەدانە راستەقینەکانن، بۆ ئەوەی لە باج و گشت پاداشتەکان ببووردرێن، نامەیەك لەلایەن کەسێك بە ناوی عەبدولرەحمان ئەفەندی لەگەڵ گشت ناوی ئەو ناوبراوانە نووسراوەتەوە و پێشکەش کراوە، لەسەر ووتەی والّا هاوپێچ نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردنی لەسەر هیممەتی بەهیە وەستاوە.

بە ئاماژەی جەنابی راوێژکار


OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI
İ. MVL 421/18438
İ.MVL.00421

| 15 موحەررەم 1276 | 00421.018438 | I.MVL. |
| --- | --- | --- |

بۆ جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم

لەگـەڵ بریارنامــەی نەزارەتـی دارایـی جەلیلـە راپۆرتـی جەنابـی پاشـا راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە دواتـر لـە ئەنجوومەنـی والا هاوپێچەکـەی نووسراوەتـەوە، ئـەوەی نیشـان دراوە کـە دوای مردنـی شـێخ عەبدولئەحـەد ئەفەندی دانیشـتووی سـانجەقی سـلێمانی، ٣٠ ئاقچـەی ئەرکەکـەی لـە داهاتـی دیاربەکـر بـێ خاوەنـە، بـە گوێـرەی نیـزام ٦ ئاقچـەی رۆژانـەی کۆچکـردووی ناوبـراو بۆ بـرادەرزادەی بەناوی عەبدولرەحـمان ئەفەندی دابیـن بکرێت، بۆ جێبەجێ کردنـی نـووسراو حەواڵـەی نەزارەتـی ناوهاتـوو کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی ملوکانە بـە فەرمانی پاشـا چ بفەرمووێت بـە گوێـرەی ئـەوە رەفتـار دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی نـووسراوی نـووسراوە ژمـارەی لەسـەر تۆمـار کـرا ئەفەنـدم.

لە ١٥ موحەررەم ١٢٧٦


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
A.}MKT.MHM
207 | 19

A.}MKT.MHM.00207.00019.001

| A.MKT.MHM. | 00207.00019 | 15 رەجەب 1277 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>گومرگی دوخان و رسوماتی مۆڵەتی سانجەقی سلێمانی بە هەژمارکردنی ساڵی ٧٦ چۆنیەتی موزایدە و حەواڵە کردنەکەی لە نووسراوی قائیمقامی لیوای ناوهاتوو باسکراوە و هاتووە، لەسەر ووتەکانی بەرێزیشی هاوپێچ نێردراوە، بە راگەیاندنی نووسراو بکرێت. | | |




A.}MKT.MHM.00217.00011.001

| A.MKT.MHM. | 00217.00011 | 19 شەوال 1277 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>بە کۆی گشتی ئەو مامەڵەیەی کە لە داهاتی رسومات لە رووی جۆر و رەگەزەوە رێکخراوە، لە دەفتەری بریارنامە بۆ خەزینەی جەلیلە نێردراوە، ئەو نووسراوەی کە لە قائیمقامیەتی سلێمانیش هاتووە، لەسەر فەرموودەی واڵا هاوپێچ نێردراوە، بە راگەیاندنی نووسراو بکرێت. | | |




A.}MKT.MHM.00217.00017.001

| A.MKT.MHM. | 00217.00017 | 20 شەوال 1277 |
|---|---|---|
| بۆ لایەنی واڵای جەنابی سەر عەسکەر<br>لە بارەی چۆنیەتی ڕێکخستنی مووچە و دامەزراندنی سەربازانی شاهانەی سانجەقی سلێمانی هەروەها ڕاگەیەندرا ئەو ئەندامانەی کە لە بەغداد هەڵاتوون، دەستگیر کران و ڕەوانەی شوێنەکانی خۆیان کرانەوە، لە دانیشتوانی لیوای ناوهاتوو لەسەر ئارەزووی خۆیان ٧٠ ئەندام چوونەتە ناو سەربازی شاهانە و نامەی ئەمانە نێردراوە، نووسراوی قائیمقامی لیوای ناوهاتوو لەسەر فەرمانی واڵای سوپاسالار هاوپێچ نێردراوە، فەرمان فەرمانی ئەفەندیمانە. | | |




A.}MKT.NZD.00339.00036.001

<table>
<tr><td>A.MKT.NZD.</td><td>00339.00036</td><td>29 جەمادی کۆتایی 1277</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>عەلـی حەسـەن ئەفەنـدی بـاش کاتیبـی دارایـی پێشـووی سـانجەقی سـلێمانی، لـە شـوێن خـۆی وەکـو خانەنشـین برێـك مووچـەی بـۆ ببرێتـەوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی ئـەم کارەش ئـەو داواکاریـەی پێشکەشـی کـردووە، لەگـەڵ ووتـەی والا بەیەکـەوە نێـردراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی لەسـەر هیممەتـی بەهیـە وەسـتاوە.</td></tr>
</table>


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

سلیمانیه قائممقامی مصطفی بکه

OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT.DV
199 | 30.

A.}MKT.DV.00199.00030.001

| 7 سەفەر 1278 | 00199.00030 | A.MKT.DV. |
|---|---|---|

بۆ مستەفا پاشا قائیمقامی سلێمانی
عەبدولرەحمان چاوش لە سەربازی شاهانە دەرچووە، ئەم ماوەیە لە بارودۆخێکی خراپ دایە، لە بارەی بەکارهێنانی لە پیشەی یوزباشی پۆلیسی پاراستن، داواکاری دراوەتە جەنابی ملوکانە، ناوبراو لەم ئەرکە خزمەتی پێشووی هەبووە، بۆیە هیمەت بکرێت لە دامەزراندن و دڵخۆش کردنی.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT.NZD
383 | 86

A.}MKT.NZD.00383.00086.001

<table>
<tr><td>A.MKT.NZD.</td><td>00383.00086</td><td>7 جەمادی کۆتایی 1278</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ سەرۆکایەتی قۆمیسیۆنی پەنابەرانی جەلیلە<br>لە هەندێك شوێنی سانجەقی سلێمانی زەوییەکی زۆر و فراوانی کشتوکاڵی بە داهات بەتاڵە، بە پێویست زانراوە کە پەنابەری تێدا نیشتەجێ بکرێت، لەسەر ئەم گفتوگۆیە نووسراوی قائیمقامیەتی لیوای ناوهاتوو هاتووە، هەروەها لەسەر فەرموودەی واڵا هاوپێچ نێردراوە، دوای خوێندنەوەی تایەت بە جێبەجێ کردنی، هیممەت بکرێت و لەم بارەیەوە نووسراو بکرێت.</td></tr>
</table>


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

| I.DH. | 01247.097706 | 17 رەبیعی یەکەم 1309 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
.... دیوانی هومایۆن
جەنابی ئەفەندم
لە ناو ویلایەتی موسڵ نەزیف ئەفەندی قائیمقامی قەزای رانیە لەبەر نەخۆشیەکەی ناتوانێ کارەکەی بەڕێوە ببات، دوای دوورخستنەوەی، لە شوێن ئەو ئیبراهیم ئەدهەم ئەفەندی کە لە قائیمقامیەتی قەزای رەداع لە ویلایەتی یەمەن لەسەر ویستی خۆی لە کارەکەی جیابۆتەوە، لە قەزای ناوهاتوو دامەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە بریارنامە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران رێکخراوە و تێدا نیشان دراوە، بۆ جێبەجێ کردنی نووسراوی نەزارەتی ناوخۆی جەلیلە لەگەڵ کاغەزی وەرگێردراوی کەسێتی بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بارەیەوە هەر چۆنێك بێت فەرمانی پاشای جەنابی ملوکانە چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بۆ ئەمەش نووسراوی بەپەلە کراوە ئەفەندم، لە ١٧ رەبیعی یەکەم ١٣٠٩ و لە ٩ تشرینی یەکەم ١٣٠٧.
سەدری ئەعزەم




A.}MKT.NZD.00406.00061.001

| 7 رەمەزان 1278 | 00406.00061 | A.MKT.NZD. |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>محەمەد سەعید ئەفەندی لە زاناکانی سانجەقی سلێمانییە، داوا کراوە وەکو کەسانی هاوشێوەی خۆی مووچەی بۆ ببڕێتەوە، ئەو داواکارییەی کە داویەتی، لەگەڵ بڕیارنامەی خۆچێی بەیەکەوە نێردراوە، لەلایەنی جەنابی موشیخەتپەناهی عالی نووسراو هاتووە، هەروەها لەسەر ووتەی سەروو داواکاری باسکراو لەگەڵ بڕیارنامەکە هاوپێچ نێردراوە، بە گوێرەی ئەو ڕێگایانەی گیراوەتە بەر، بۆ جێبەجێ کردنی مامەڵەکە نووسراو کراوە هیممەت بکرێت. | | |


OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (C)
İ. MVL 462/20843
1
İ.MVL.00462

| I.MVL. | 00462.020843 | 16 شەعبان 1278 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
ئەنجوومەنی والای فەرمانڕەواییەکانی داد
ژمارە ۱۲۴۳
راپۆرتـی نەزارەتـی دارایـی جەلیلـە لـە مێـژووی ٥ شـەعبان ٢٧٨ دراوەتـە ئەنجوومەنـی والا، تێـدا هاتـووە؛ لـە قـەزای قەرەداغـی سـەر بـە سـانجەقی سـلێمانی، ئـەو شـوێنەی تایبەتـە بـە نیشـتەجێی بوونـی بەرێوەبـەر، قۆناغـی میـری وێـران بـووە و دواکەوتنـی نـۆژەن کردنـەوەی تووشـی خەرجیەکـی زۆری دەکات، بۆیـە دەرخسـتەی بـۆ کـراوە و بـە پـارەی دانیشـتوانەکەی جگـە لـە خەرجـی ٥٣٥٥ قـوروش نـۆژەن دەکرێتـەوە، لـە شـوێن خـۆی ئامـاژەی پێکـراوە کـە لەسـەر خەرجـی باسـکراو ئەگـەر داوا بکرێـت خوارەوەشـی چـاك بکرێتـەوە، ئـەوا بـە زانینـی حکوومـەت مۆڵـەت دراوە بـە نۆژەنکردنـەوەی، بـە تێروانیـن لـە وێنـەی ئامـاژە پێکردنەکـە قۆناغـی باسـکراو بینایـەی میریـە، ئەگـەر تـا ماوەیەکـی تـر نـۆژەن نەکرێتـەوە ئـەوا بـە تەواوەتـی وێـران دەبێـت، بـە گوێـرەی دەرخستەکەی و بـرە پـارەی دیـاری کـراوی لـە خەزینـەی جەلیلـە بـە ئاسـایی زانـراوە خـەرج بکرێـت، بـە راپۆرتێـك قۆناغەکـە ئامـاژەی پێکـراوە و لـە کۆتـا جێبەجـێ کردنـی نۆژەنکردنەوەکـەی، دەفتـەری جێبەجـێ کردنـی رێـك بخرێـت و لـە خەزینـە حەواڵـەی نەزارەتـی ناوهاتـوو بکرێـت، بـەڵام پێویسـتە پـارەی دانیشـتوان بـە خراپـی بەکارنەهێنرێـت و بـە بریـاری پێشـوو لـە فەرمانگـەی خـۆی رێـك بخرێـت، بـۆ ئـەم بابەتـە کاتـی دیاریکـراوی بـۆ دیـاری بکرێـت و بـۆ ئەمـەش فەرمـان و ئاماژەی جەنابـی پاشـای والـی بەغـداد راگەیەنـدراوە، بـەڵام لـەم بابەتـەدا ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ١٦ شـەعبان ٢٧٨.

مـۆری محەمـەد ئەمیـن/ نـوری بـەگ ئامـادە نەبـووە، مـۆری محەمـەد عـارف/ مـۆری ئیبراهیـم/ مـۆری محەمـەد زاهیـر شـەریف/ مـۆری محەمـەد وەیسـی/ مـۆری سـەید مەحمـود ئیبراهیـم/ مـۆری ............/ مـۆری یوسـف کامـل


OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (C)

İ. MVL 466/21107

2

İ.MVL.00466

| 15 زیلحیجه 1278 | 00466.021107 | I.MVL. |
|---|---|---|

جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
فەرمانی ئەنجوومەنی واڵای کۆڵکەی دادی جەنابی فەرمانڕەوا لەگەڵ بڕیارنامە ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، کە لە بابەتەکە ڕوون بۆتەوە، لە سانجەقی سلێمانی لە سنووری مەنگە و چیغانە قشلە دروست کراوە، بۆ تێچووی ئەم قشلەیە ١٥٠٠٠ قوروش خەرج کراوە، لە خەزینە قەبوڵ کراوە و سەبارەت بە هەژمارکردنی نووسراو حەواڵەی نەزارەتی دارایی جەلیلە کراوە، بەڵام لەم بابەتەدا جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت بە گوێرەی ئەوە جولە دەکرێت، بە ڕاگەیاندنی نووسراوی نووسراوە ژمارەی لەسەر تۆمار کرا ئەفەندم، لە ١٥ زیلحیجە ١٢٧٨.



| 1279 موحەررەم 12 | 00492.033365 | I.DH. |
|---|---|---|

جەنابی ئەفەندم
عەزیـز ئاغـا لـە خانەدانـی سـانجەقی سـلێمانی لەگـەڵ مەحمـود ئاغـا بەرێوەبـەری قەزایەکانـی قزلجـە و شـیوەگل بـە گوێـرەی شـوێن پاداشـت دەکرێـن، والـی بەغـداد جەنابـی پاشـای پایەبـەرز نـووسراوی هاتـووە، لەسـەر فەرمانـی جەنابـی پاشـا پێشـکەش کـراوە و راگەیەنـدراوە، بـە گوێـرەی ئامـاژە پێکردنەکـە بـۆ پاداشـت کردنـی ئاغایانـی ناوبـراو بـە گونجـاو زانـراوە، لـە دەرگای عالـی پلـەی قەپوچـی باشـیان پـێ بدرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە هـەر چۆنێـك بێـت جەنابـی شـەهریار بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت بـە گوێـرەی ئـەو جولـە دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی نـووسراو نووسرایـەوە ئەفەنـدم، لـە ١٢ موحـەررەم ٢٧٩.




<table>
<tr><td>MVL.</td><td>00771.00032</td><td>15 شەوال 1280</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ پایەی سەدارەتی پایەبەرز<br>وەڵام ۲۸<br>راگەیەندراوی بەندەیەکی بێ نرخە<br>لە نووسراوی فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ لە مێژووی ۱۱ شەعبان ۱۲۸۰ و لە ۸ کانوونی دووەم ۱۲۷۹ ژمارە ۲۸ هاتووە، لەلایەن پەیوەندیدارانی وەکالەت بە فەرمانامەی پاشا دەرچووە و تێدا هاتووە؛ شەربەتچی عەزیز لە دانیشتوانی سانجەقی سلێمانی بە برینداری کوژراوە، بکوژەکەی بەناوی قادر دوای ناسینەوە، بە ماوەی ۱۵ ساڵ بە سزای سەوڵ لێدان لە بەغداد زیندانی دەکرێت، راگەیاندنی مێژووی زیندانی کردن و کۆتاییەکەی بە ئەمر و فەرمان بووە، لەسەر فەرمانی عالی خدێوانە بکوژی ناوهاتوو بە سزای سەوڵ لێدان زیندانی دەکرێت، لە ئەنجوومەنی گەورە نووسراوی ماوەکە دراوەتە دەستی، هەروەها مێژووی زیندانی ناوبراو لە ساڵی ۷۸ تشرینی دووەم رۆژی ۱۱ بووە، راوبۆچوون بۆ پەیوەندیدارانی سەدارەتە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>لە ۱۵ شەوال ۲۸۰ و لە ۱۱ مارت ۲۸۰<br>بە مۆری محەمەد نامق موشیری لەشکری سێیەم و والی بەغداد</td></tr>
</table>


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT.MHM
335 | 36

A.}MKT.MHM.00335.00036.001

<table>
<tr><td>23 موحەررەم 1282</td><td>00335.00036</td><td>A.MKT.MHM.</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>عەبدولقادر ئەفەندی لە شێخەکانی تەریقەتی قادریە مردووە، تیمارەکان و گەنمەکانی گوندی گۆك تەپە، لە سانجەقی سلێمانی سەر بە تەکیەکەی بووە، هەروەکو جاران بۆ خۆراکی تەکیەی ناوهاتوو بۆ کوڕەکانی شێخ عەبدولکەریم ئەفەندی و محەمەد ساڵح ئەفەندی دابین بکرێت، بەم دابینکردنە ئەوەی ماوەتەوە دەدرێتە خەزینە، ئەو نووسراوانەی کە لە ویلایەتی بەغدادی جەلیلە هاتووە، هاوپێچ بریارنامە لەگەڵ پاکانەی ئەستۆ بەیەکەوە بۆ واڵا نێردراوە، لە جێبەجێ کردنی هیممەت بۆ بەهیەیە.</td></tr>
</table>


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT.MHM
336 52

A.}MKT.MHM.00336.00052.001

| A.MKT.MHM. | 00336.00052 | 8 سەفەر 1282 |
|---|---|---|
| بۆ جەنابی ساڵح پاشا<br>حەسەن ئاغا وەکیلی شەهبەندەری ئێران کە لە ئاماسیا نیشتەجێیە، بە بەڵگە ٥٧٠٠ قوروشی بە قەرز داوەتە عەلی پاشا موتەسەرفی پێشووی سانجەقی سلێمانی، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم قەرزەش نووسراو لە موتەسەرفیەتی ئاماسیا هاتووە، نووسراوی سەرووی ناوهاتوو هاوپێچ لەگەڵ نووسراو بە یەکەوە نێردراوە، دوای خوێندنەوەی بە نووسراو داواکراوە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT.MHM
350 68

A.}MKT.MHM.00350.00068.001

| A.MKT.MHM. | 00350.00068 | 25 شەوال 1282 |
|---|---|---|

بۆ والی بەغداد و نەزارەتی دارایی جەلیلە
عومەر پاشا قائیمقامی سانجەقی سلێمانی لە پلەی چوارەم نیشانی مەجیدی نیشانی پێدراوە، بۆ ئەوەی بگۆردرێت بۆ پلەی سێیەم، لەلایەن جەنابی پاشای والی بەغداد ئاماژەی پێکراوە، بە رەزامەندی جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، هەواڵ و زانیاری لە مێژووی ١٨ شەوال ١٢٨٢ دەرچووە، بۆ جێبەجێ کردنی مامەڵەکەی هیممەت بکرێت، ناوبراو هەر لەگەڵ سەرەتای دەست بەکاربوونی لە ئەرکەکەی لە لیوای ناوهاتوو چاکسازی کردووە و دەست پێشخەری کردووە لە کارەکانی، بۆیە ئەو پلەیەی کە لە پلەی چوارەم بە نیشانی مەجیدی نیشان پێی دراوە، بۆ سێیەم بگۆردرێت، لەم بارەیەوە بە ئاماژەی والا دوای رەزامەندی بە فەرمانی پاشا جەنابی پاشا فەرموویەتی؛ بۆیە نیشانی ناوهاتوو لەگەڵ پاکانەی ئەستۆ بەیەکەوە بۆ والا نێردراوە، هیممەت بکرێت لە ناردنی، فەرمان بۆ ئەفەندیمانە.


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA) ©
İ.DH. 546/37976

2

İ.DH.00546

| 29 رەمەزان 1282 | 00546.037976 | I.DH. |
|---|---|---|

جەنابی ئەفەندم
عومـەر پاشـا قائیمقامـی سـانجەقی سـلێمانی هەر لـە سـەرەتای ئەرکەکەیدا لە چاکسـازی لیـوای ناوهاتـوو پێشرەوی کـردووە و کاروکـردەوەی پاشـای ناوبـراو بیـنراوە، بۆیـە لـە پلـەی چـوارەم نیشـانی مەجیـدی پێـدراوە، بـەڵام بـۆ پلەی سـێیەم بـەرز بێتـەوە، بەمـەش بەختـەوەر دەبێت، لـەم بارەیـەوە جەنابی پاشـای پایەبـەرزی والی بەغـداد پارچەیەك نـووسراوی راگەیانـدووە و پێشکەشـی کـردووە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پاشـا بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت بـە گوێـرەی فەرمانەکـە کار دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی نـووسراوی بـە پەلـە نووسرایـەوە، لـە ٢٩ رەمـەزان ١٢٨٢.



I.DH 547/38054

2

İ.DH.00547

| کۆتا رۆژی شەوال 1282 | 00547.038054 | I.DH. |
|---|---|---|

جەنابی ئەفەندم
لـە پلـەی قەپوچـی باشـیەکان، محەمـەد بـەگ لەگـەڵ قـادر بـەگ و بەهـرام بـەگ کـە لـە سـەرۆکەکانی هـۆزی گـەورەی جافـی هۆزەکانـی سـانجەقی سـلێمانین، زیانـی چەتەکانیـان دوورخسـتۆتەوە و بـۆ حکوومـەت هـەوڵ و کۆشـییان داوە، بۆیـە شـایەنی رێزگرتـن، محەمـەد بـەگ لـە پلـەی چـوارەم بـە نیشـانێکی نیشـانی مەجیـدی و هەرچـی قـادر بـەگ و بەهـرام بـەگ بـە پلـەی قەپوچـی باشـی پاداشـت بکرێـن، بـۆ ئـەم مەبەسـتە نـووسراو لەلایەنـی والـی بەغـداد و موشـیری لەشـکری شەشـەمی همومایـۆن بـە پلـەی میـری میـران جەنابـی پاشـا هاتـووە و هاوپێـچ راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پاشـا فەرمانـی چـی بێـت بـە گوێـرەی ئـەوە کار دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی نـووسراوی بـە پەلـە نووسراوەتـەوە، لـە کۆتایـی شـەوال ١٢٨٢.




MVL.00522.00089.002

| MVL. | 00522.00089 | 5 شەوال 1283 |
| --- | --- | --- |

- بۆ والی بەغداد
لە قەزای گولعەنبەری سەر بە سانجەقی سلێمانی، جامیعی جەنابی سوڵتان سەلیم خان غازی دروست کراوە و زیندووکراوەتەوە، لە بارەی فەرمانی دروست کردن و ئەرکی خزمەتکارەکانی و گشت کارەکانی تر بریار دراوە و لەسەر فەرمانی پاشا لە مێژووی ٢٧ رەبیعی یەکەم ٨٣ نووسراو نووسراوەتەوە، کەچی تا ئێستا وەڵامەکەی نەهاتووە، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە، لێرە بریکار شێخ محەمەد سادق ئەفەندی داوای کردووە ئەرکەکە جێبەجێ بکرێت، هەرچی بابەتەکەیە لە کاروبارە خێرخوازیەکانە، ئارەزوو دەکرێت هەرچی زووە جێبەجێ بکرێت، بە گوێرەی ئاماژەی پێشوو پەلە لە جێبەجێ کردنی بکرێت و کۆتایی پێ بێت، لەم بابەتەدا فەرمان بۆ ئەفەندیمانە.

- لە شارۆچکەی گولعەنبەر و خلنباری سەر بە سانجەقی سلێمانی جامیعی شەریفی سوڵتان سەلیم خان دروست کراوە و زیندووکراوەتەوە، بە نوێ کردنەوە و نۆژەنکردنەوەی جامیعی ناوهاتوو ئەرکی خزمەتکارەکانی کۆتایی پێ هاتووە، لەبەر ئەوەی من لە ساڵی ٧٧ ەوە، وەکیل بوویمە لەسەر دانان و نوێکردنەوەی ئەرکی ئەم نزاکارە دێرینانە، لە وەڵامی ئەو داواکاری و نووسراوە بە زانیاریانەی کە نێردراوە، لە وەڵام لەسەر ئەو بریارنامە و نووسراوانەی کە هاتووە، ماوەی رابردوو جامیعی ناوهاتوو بە جێبەجێ کردنی نۆژەنکردنەوەی ئاماژە بە ناوی خزمەتکارەکانی کراوە، ئەگەرچی لە پایەی سەدری ئەعزەمی پەیوەندیدارانی وەکالەت فەرماننامەی سەدری ئەعزەم بۆ والی بەغداد رۆیشتووە، بەڵام تا ئێستا وەڵام نەهاتووە، هەروەها بۆ ئەم کارەی نزاکاران لێرە بەم پیریەمەوە بە سەرگەردانی و پەرێشانی نیشتەجێ بوومە، جەلالەددین زادە مستەفا ئەفەندی جامیعی ناوهاتوو بەرێوە دەبات، مودەریسەکەی ئەحمەد ئەفەندی و ووتاربێژەکەی مەحمود ئەفەندی و بانگخواز مەحمود کوری محەمەد ئەفەندی لەوێ دامەزراون، تا ئێستاش حاڵەتەکە بەم شێوەیە رۆیشتووە و ئەرکەکەیان جێبەجێ کردووە، داوای بەزەیی و میهرەبانی دەکەین ئەو ناوانەی هاتووە بە ناردنی بریارنامەیان لە بارەی دەست پێکردنی نۆژەنکردنەوەی باسکراو بە گفتوگۆ لەگەڵ قائیمقامی سلێمانی، لە پەیوەندیدارانی وەکالەت بە پارچەیەك فەرماننامەی سەدری ئەعزەم فەرمان بدەن بە دامەزراندنی ئەم نزاکارانە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە رەجەب ٨٣.
شێخ محەمەد سادق بریکاری ناوبراوان



| I.MVL. | 00558.025075 | 14 سەفەر 1283 |
|---|---|---|

بۆ پایەی سەدری ئەعزەم لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
ژمارە ١٦
راگەیەندراوی بەندەیەکی بێ نرخە
چەند زانایەکی ئێران کۆچیان کردووە بۆ سانجەقی سلێمانی و هەر یەکە بە وێنەیەك مووچەیان وەرگرتووە دواتر بە ئارەزووی خۆیان گەراونەتەوە وولاتی خۆیان، بۆ ئەم ٣٦ کەسە لە داهاتی سلێمانی ساڵانە ٢٥٨٣ قوروش و ١٧ پارەیان بۆ دابین کرابوو، کەچی زانایانی لیوای ناوهاتوو شایەنی میهرەبانی و بەزەیین، ئەوانەی ناویان هاتووە و دیارن لە ٣٢ کەس پێك دێن، ئەم مووچەیە بۆ ئەوان دابین بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە لە ئەنجوومەنی گەورەی بەغداد بریارنامە رێکخراوە، لەگەڵ بریارنامەی ئەنجوومەنی خۆچێی هاوپێچ پێشکەش کراوە، هەروەها بریارنامەی پێشوەختەی باسکراو لە باڵاوە نیشان دراوە، ساڵیانەی باسکراو بۆ زاناکانی ناوهاتوو دابین دەکرێت، ئەمەش لەسەر فەرمان و رای عالی جەنابی پەیوەندیداری وەکالەت وەستاوە، لەم بابەتەدا هەروەها لە هەر حاڵەتێکدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١٤ سەفەر ٨٣ و لە ١٥ حوزەیران ٨٢
مۆری محەمەد نامق


OSMANLI ARŞIVI DAIRE BAŞKANLIĞI

i.MVL 566/25436

2

İ.MVL.00566

| I.MVL. | 00566.025436 | 5 ڕەمەزان 1283 |
| --- | --- | --- |

جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم

لــە بابەتــی بڕیارنامــەی ڕاگەیەنــدراوی ئەنجوومەنــی واڵا ڕوون بۆتــەوە، چەتەکانــی هەمەوەنــد کــە لــە قــەزای بازیانــی ســەر بــە ســانجەقی ســلێمانی بوونیــان هەیــە، بــۆ ئــەوەی ڕێگەیــان پــێ نەدرێــت کاری بــەد ئەنجــام بــدەن، ســەربازی نیزامیــە و پیــادە لــە ناوچــەی چەمچەمــاڵ نیشــتەجێ بکرێــن، چونکــە ســەر لــە نــوێ قشــلەیەك دروســت دەکرێــت، بــۆ ئــەم مەبەســتە ٢١٧٢٥ قــورووش و ٣ پــارە خــەرج دەکرێــت و هەژمــار دەکرێــت، هەروەهــا بــۆ جێبەجــێ کردنــی بــە ڕەزامەنــدی ویلایەتــی بەغــداد لــە خەزینــە نــووسراو حەواڵــەی نەزارەتــی دارایــی جەلیلــە کــراوە، بــەڵام جەنابــی پاشــا لــە ئەمــر و فەرمانــی چــی بێــت، بــە گوێــرەی ئــەو جولــە دەکرێــت، بــەم ڕاگەیەنــدراوە نــووسراوی بەپەلــە نووسرایــەوە ئەفەنــدم، لــە ٥ ڕەمــەزان ١٢٨٣.



| 1283 زیلقەعدە 23 | 00570.025600 | I.MVL. |
|---|---|---|

جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم

کرێـی بارگیـر لەگـەڵ خەرجـی خـواردن و پێداویسـتی تـری فەرمانبەرانـی تۆمـاری ناسـنامەی سـانجەقی سـلێمانی و پاشـکۆکانی لـە ژێـر پەسـەند کـردن دایە، نزیکـەی ٨٤٨٠٠ قـوروش قەبـوڵ کـراوە و هەژمارکردنی بە پێویسـت زانراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی مامەڵـەکان حەواڵەی نەزارەتـی دارایی جەلیلە کـراوە، لەوێـش کراوەتە نووسراو لـە ئەنجوومەنی والاش دراوەتە قەڵەم، لەگەڵ هاوپێچی بریارنامە بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، ئەمر و فەرمانی پاشا هەر چییـەك بێـت بـە گوێـرەی ئـەوە جێبەجێ دەکرێـت، بە راگەیاندنـی نـووسراوی بەپەلە کراوە، لـە ٢٣ زیلقەعـدە ١٢٨٣.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
MVL
556 | 103

MVL.00556.00103.001

| MVL. | 00556.00103 | 3 ڕەمەزان 1284 |
|---|---|---|
| نووسراوی نەزارەتی دارایی عالی بۆ پەیوەندیدارانی سەرۆكایەتی<br>عەبدولڕەزاق ئەفەندی لە گوندێكی سانجەقی سلێمانی جامیعێكی شەریفەی بونیات ناوە و لە بارەی داهاتەكانی، بۆ هەندێك داواكاری گشتگیر نووسراوێكی ناردووە و دراوەتە عالی، بە تێروانین لە بابەتەكە دوای لێكۆڵینەوە كارەكە جێبەجێ بكرێت، ئەمر و فەرمان بۆ ئەفەندیمانە. | | |



A.}MKT.MHM.00463.00074.001

| A.MKT.MHM. | 00463.00074 | 14 ڕەجەب 1290 |
|---|---|---|

١٤ ڕەجەب ١٢٩٠
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە و ویلایەتی بەغداد
بـە پێویسـت زانـراوە عـزەت ئەفەنـدی موتەسـەرفی سـانجەقی سـلێمانی بگۆردرێـت، لـە شـوێن ئـەو ئـەشرەف ئەفەنـدی موتەسـەرفی سـانجەقی دلیـم دابنرێـت، هەروەهـا بـۆ موتەسـەرفیەتی لیـوای ناوهاتـوو، غالـب ئەفەنـدی قائیمقامـی سـەماوە ئەرکەکـەی پـێ بدرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لەسـەر ئامـاژەی واڵا دوای مۆڵەتـدان، فەرمانـی پاشـای جەنابـی پاشـا فەرموویەتـی و جێبەجـێ کردنـی بـە ویلایەتـی ناوهاتـوو ڕاگەیەنـدراوە و لـە خەزینـەش هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی، لـە بابـی عالیـش جێبەجـێ کـراوە، بـۆ ئەنجامدانـی مامەڵـەی پێویسـت داوای هیممـەت کـراوە، بـۆ ئەمـەش نـووسراو بکرێـت.


İ.DH 845/67872

2

İ.DH.00845

| I.DH. | 00845.067872 | 9 رەبیعی یەکەم 1299 |
|---|---|---|

جەنابی ئەفەندم
مەجید بـەگ قائیمقامـی قـەزای مەرگـەی سـەر بـە سـانجەقی سـلێمانی دادگایـی دەکرێـت، بۆیـە لـە ئەرکەکـەی دوورخراوەتــەوە، لــە شــوێن ئــەو حەقــی ئەفەنــدی قائیمقامــی پێشــووی عەنــە دامــەزراوە، بــە راگەیاندنــی پەسـەند کردنـی ئەرکەکـەی لـە وەکالەتـی والـی ویلایەتـی موسـڵ ئامـاژەی پێکـراوە، هەروەهـا خوێندنـەوەی بـۆ کـراوە کـە پەسـەند کردنـی ئەرکـی ناوبـراو گونجـاوە، دوای راگەیاندنـی، رەزامەنـدی دراوە لەسـەر جێبەجـێ کردنـی کارەکـە، بۆیـە بریارنامـەی قۆمیسـیۆنی هەڵبـژاردن و کاغـەزی زانیـاری کەسـێتی ناوبـراو بەیەکـەوە پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پاشـا لـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت بەپەلـە جێبەجـێ دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی نـووسراوی بەپەلـە کـرا ئەفەنـدم، لـە ٩ رەبیعـی یەکـەم ١٢٩٩ و لـە ١٧ کانوونـی دووەم ١٢٩٧.


I.DH 846/67938

İ.DH.00846

| 20 رەبیعی یەکەم 1299 | 00846.067938 | I.DH. |
| --- | --- | --- |
| نەزارەتی داد و مەزهەبەکان<br>بەرێوەبەرایەتی تۆماری فەرمانبەران<br>ژمارە ٣٣٧<br>حوسێن ئەفەندی یاریدەدەری داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی سانجەقی سلێمانی، ئەرکەکەی بە خراپی ئەنجام داوە و هەستاوە بە ئازادکردنی چەند تاوانبارێك هەروەها کار و کردەوەی نەگونجاوی ئەنجام داوە، بە پێویست زانراوە هەر ئێستا لە کارەکەی دوور بخرێتەوە و بدرێتە دادگا، لەسەر ئەو سکاڵانەی کە لە خۆچێیەوە هاتووە، لە مەرکەزی ویلایەت لێکۆڵینەوە ئەنجام دراوە و دەرکەوتووە قسەکان راست و دروستن، جگە لەمە سامی ئەفەندی و مەعروف ئەفەندی و ساڵح ئەفەندی سەرۆکەکانی فەرمانگەی سزای دادگا سەرەتاییەکانی سانجەقەکانی موسڵ و شارەزوور و سلێمانی، لەو شوێنانەی کە ئەرکیان جێبەجێ دەکەن لە خەڵکی ناوچەکەن، بۆیە لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکەیان سەرکەوتوو نین، لە دادی پشکنینی موسڵ ئاماژەی پێکراوە و دەرکەوتووە لە کاتی پشکنین و گەران، لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەی کراوە، گۆرینەوەی شوێنەکانیان پەسەند کراوە، هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانەی لە نەزارەتیش کراوە ئەم ئاماژانەی پەسەند کردووە، یاریدەدەری ناوهاتوو دەدرێتە دادگا، یەکسەر بە دوورخستنەوەی لە شوێن ئەو سامی سەرۆکی سزای موسڵ و بۆ شوێنی ناوبراویش ساڵح سەرۆکی سزای سلێمانی و بۆ شوێنی ئەمەشیان مەعروف سەرۆکی سزای شارەزوور و بۆ شوێنی ئەمەش ناجی ئەفەندی سەرۆکی سزای عەمارە کە ئەرکەکەی هەڵوەشاوەتەوە و لە زاناکانی عیراقە و لە خانەدانی لێهاتووە، دامەزرێن، بۆ ئەمەش لە ئەنجوومەنی هەڵبژاردنی فەرمانبەرانی داد نووسراو رێکخراوە و هاوپێچ پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی هاوکاری جەنابی پەیوەندیدارانی وەکالەتی پێویستە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٠ رەبیعی یەکەم ٩٩ و لە ٢٧ کانوونی یەکەم ٩٧.<br>مۆری ئەحمەد جەودەت | | |



١٤٦

i.DH. 856/68644

İ.DH.00856

<table dir="rtl">
<tr><td>I.DH.</td><td>00856.068644</td><td>16 شەعبان 1299</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٤٦ ٦<br>لەبەر بێ توانایی ڕەسول ئاغا قائیمقامی قەزای شەهربازاری سەر بە سانجەقی سلێمانی دوور دەخرێتەوە و لە شوێن ئەو محەمەد ساڵح بەگ قائیمقامی پێشووی زێبار دادەمەزرێت، هەروەها کاغەزی وەرگێردراوی باری کەسێتی نێردراوە، پەسەند کردنی ئەرکەکەی لە وەکالەتی ویلایەتی موسڵ بە هاتنی نووسراوی مێژووی ١٨ جەمادی کۆتایی ١٢٩٩ ژمارە ٥ حەواڵەی قۆمیسیۆن کراوە، ئاماژەی پێکراوە، کە ساڵح بەگ لە هەڵبژێردراوەکان نییە، ئەگەرچی پەسەند کردنی ئەرکەکەی بە گونجاو نەزانراوە، بەڵام گرنگی ناوچەکە و توانای ناوبراو و لێهاتوویی باسکراوە، بۆیە کاغەزی پەسەند کردنی ئەرکەکەی پێشکەش کراوە، ئەو کاتەی سەروو خستیانە دەنگدانەوە جێبەجێ دەکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>لە ١٦ شەعبان ٢٩٩ و لە ٢١ حوزەیران ٢٩٨<br>مۆری ئیسماعیل غالب، سەید محەمەد محەمەد، سەید محەمەد سورەیا، ئەمین بەگ، محەمەد ئەمین، ئەحمەد جەلال</td></tr>
</table>



| 5 شەوال 1299 | 00862.069029 | I.DH. |
|---|---|---|

جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
حەقــی ئەفەنــدی قائیمقامــی قــەزای مەرگــەی ســەر بــە ســانجەقی ســلێمانی، لەبــەر خراپــی بەڕێوەبردنــی کارگێریەکــەی دوور خراوەتــەوە، لــە شــوێن ئــەو عەبدوڵــڵا بــەگ ئەندامــی ئەنجوومەنــی کارگێــری دامــەزراوە، ئەگەرچــی بــەم ڕاگەیاندنــە بــە نــووسراو پەســەندکردنی ئەرکەکــەی لــە وەکالەتــی ویلایەتــی موســڵ کۆتایــی پێهاتــووە، بــەڵام ناوبــراو لــە قائیمقامیــەت کاری نەکــردووە و لــە قۆمیســیۆنیش لــەو کەســانە نییــە کــە بــە تاقیکردنــەوە هەڵبژاردننامــەی وەرگــرت بێــت، بۆیــە پەســەند کردنــی ئەرکەکــەی گونجــاو نییــە، بــە گونجــاو زانــراوە بــۆ قائیمقامیەتــی ناوهاتــوو لــە قائیمقامیەتــی چینــی ســێیەم عوســمان نــوری بــەگ قائیمقامــی پێشــووی بوغازلیــان دابمەزرێــت، بــەم ڕاگەیەنــدراوە جێبەجــێ کردنــی کارەکــە بڕیارنامــەی قۆمیســیۆنی هەڵبژاردنــی فەرمانبــەران و نــووسراوی باســکراو و کاغــەزی وەرگێــردراوی بــاری کەســێتی هاوپێــچ ڕاگەیەنــدراوە و پێشــکەش کــراوە، لــە بــارەی جێبەجــێ کردنــی کارەکــەش ئەمــرو فەرمانــی هومایۆنــی جەنابــی ملوکانــە چــی بێــت، جێبەجــێ دەکرێــت، بــە ڕاگەیاندنــی نــووسراوی بــە پەلــە کــراوە ئەفەنــدم، لــە ٥ شــەوال ٢٩٩ و لــە ٧ ئۆغســتۆس ٩٨.




ŞD.02905.00028.001

<table>
<tr><td>5 رەجەب 1299</td><td>02905.00028</td><td>ŞD.</td></tr>
<tr><td colspan="3">٥ رەجەب ١٢٩٩<br>نووسراوی پەیوەندیدارانی سەرۆکایەتی بۆ نەزارەتی داد<br>لە گوندی عەبدالانی سەر بە سانجەقی سلێمانی، خۆراکی تەکیەی شێخ عەبدالان بە شێوەی مەشروت و پەیوەندیدار بە دە یەکی هەندێك قەزا و زەوی بەگایەتی دابین دەکرێت، لەسەر هەندێك ووتە و داواکاری کە لەلایەن شێخ حوسێن ئەفەندی پێشکەش کراوە، داواکاریەکە حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، کاتێك لە فەرمانگەی ناوخۆ خوێندنەوەی بۆ کراوە، دەرکەوتووە شێخ جەواد ئەفەندی بە فەرمانی پاشا لە شورای دەوڵەت کارەکە بەرێوەدەبات، هەرچی داواکاری ناوبراوە دەگەرێتەوە بۆ مافی تاکەکەسی، سەرەتا لە دادگای پشکنین دادگاییکردن و بەرزکردنەوەی بۆ کراوە، داواکاری ئەم کارە لە دادگا بینراوە و دەنێردرێتەوە ئەو دادگایەی کە پەیوەندی پێوە هەیە، داواکاری ناوبراو بە هاوپێچ رەوانەی پەیوەندیدارانی نەزارەتی عالی کراوە.</td></tr>
</table>



| 9 موحەررەم 1300 | 00868.069433 | I.DH. |
|---|---|---|

جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
حەقی ئەفەندی قائیمقامی قەزای مەرگە سەر بە سانجەقی سلێمانی، لەبەر خراپی بەڕێوەبردنی کارگێری ناوچەکە دوورخراوەتەوە، لە شوێن ئەو عەبدوڵلا بەگ ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێری دامەزراوە، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم مامەڵەیە، کارەکە بە نووسراو لە بریکاری ویلایەتی موسڵ کۆتایی پێ هاتووە، بەڵام ناوبراو لەو کەسانەیە کە لە قۆمیسیۆن لێهاتووی پەسەند نەکراوە، لەلایەکی تر عوسمان نوری بەگ قائیمقامی پێشووی بوغازلیان کە بە فەرمانی پاشا لە قائیمقامیەتی ناوهاتوو دامەزراوە، بۆ شوێنێکی تر بگوازرێتەوە و نووسراویش کراوە کە بۆ ئەم قائیمقامیەتە لە چینی دووەم خەلیل سدقی ئەفەندی قائیمقامی پێشووی بارکیری دامەزرێت، بڕیارنامەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردن هاوپێچ لەگەڵ کاغەزی زانیاری کەسێتی و نووسراوی ناوهاتوو بەیەکەوە پێشکەش بکرێت و رابگەیەندرێت، لە بارەی ئاماژەی جێبەجێ کردنی جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت پەلە دەکرێت لە جێبەجێ کردنی، بە راگەیاندنی نووسراو نووسرایەوە ئەفەندم، لە ٩ موحەررەم ٣٠٠ لە ٩ تشرینی دووەم ٩٨.




| I.DH. | 00886.070627 | 7 شەعبان 1300 |
| --- | --- | --- |

لــە نــاو ســانجەقی ســلێمانی، داهاتــی دە یەکــی ناحیەکانــی ســەرچنار و ســەروچك، لەســەر نــاوی شــێخ ســەید کاك ئەحمــەد ئەفەنــدی دانیشــتووی ســلێمانی، کــە لەســەر تەریقەتــی قادریەشــە، نــاوی گوندەکانــی نووسراوە لەسـەر نـاوی ناوبـراوە، بـۆ دەرچوونـی پاکانەکـەی لەلایـەن شـێخ محەمـەد ئەفەنـدی نـەوەی ناوبـراو تــکای کــردووە پاکانــەی پــێ بدرێــت، بــە پێشــکەش کردنــی هاوپێچەکــەی لەگــەڵ داواکاریەکــە بەیەکــەوە نێردراوەتــە پەیوەندیدارانــی ســەدارەت، بــە فەرمانــی جەنابــی پاشــای عالــی و جێبەجــێ کردنــی مامەڵەکــە ئەنجامەکـەی بـە پایەبـەرزی ملوکانـە رابگەیەندرێـت، بـە بوونـی ئەمـر و فەرمانـی جەنابـی پاشـا لـەم بابەتـەدا ئەمــر و فەرمــان بــۆ جەنابــی ئــەو کەســەیە کــە فەرمــان دەردەکات، لــە ٧ شــەعبان ٣٠٠ لــە ٣١ مایــس ٩٩.


نظارت امور داخلیه

عدد ٤٠٤

I.DH 924/ 73239

3

İ.DH.00924

| 1301 ڕەمەزان 28 | 00924.073239 | I.DH. |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٤٠٤
بۆ لایەنی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
ڕاگەیەندراوی بەندەیەکی بێ نرخە
دەرکەوتووە داود ئەفەندی قائیمقامی قەزای شەهربازاری سەر بە سانجەقی سلێمانی، پارەوپولی میری بە خراپی بەکارهێناوە و پێچەوانەی ڕەزامەندی عالی ڕەفتاری کردووە، بۆیە دەستی لە کار کێشاوەتەوە و دراوەتە دادگا، بۆ شوێنی ئەویش وەکیلێك نێردراوە، بەڵام قەزای ناوهاتوو لیواکەی لە خاڵە گرنگەکانە، بۆیە کارگێڕیەکەی لەلایەن کەسێکی لێهاتووەوە بەڕێوە بچێت و لێرە کەسێکی لێهاتوو دابمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە لە ویلایەتی موسڵ نووسراو هاتووە لە دەستەواژەیەکی کۆتایی پێ هێناوە، کە بۆ ئەم قائیمقامیەتە لە چینی سێیەم حافز ڕوشدی ئەفەندی قائیمقامی پێشووی قەزای جیدە زیاد لە پێویست ئاماژە بە ئەرکەکەی کراوە و بڕیارنامەش لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران دەرچووە و لەگەڵ کاغەزەکانی وەرگێردراوی زانیاری کەسێتی بەیەکەوە پێشکەشی پێشەوای پەیوەندیدارانی سەدارەت کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢٨ ڕەمەزان ١٣٠١ و لە ٩ تەممووز ١٣٠٠
ئەدهەم بەگ


İ.DH 963/76185

İ.DH.00963

| 27 زیلحیجە 1302 | 00963.076185 | I.DH. |
| --- | --- | --- |

باش کیتابەتی مابەینی هومایۆن
تایبەتی
سـانجەقی سـلێمانی لەگـەڵ ئێـران هاوسـنووره لەگـەڵ ئـەوەش دانیشـتوانەکەی لە هـۆز و کـوردەکان پێـك هاتوون، بۆیـە گرنگیەکـەی دیـار و روونـە، عـالم پاشـا موتەسـەرفەکەی لـە رووی کارگێریـەوە بـێ دەسـەڵاتە و بەهـۆی کارە خراپەکانـی پێویسـتە بگۆردرێـت، رۆژی رابـردوو لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلـە بە تەلەگراف راگەیەنـدراوە، هەروەها ناوبـراو بەهـۆی رەفتـاری خراپـی هەمـوو لایەکـی سـانجەقە ناجێگیـرە و تێکچـووە، دەرکەوتـووە لـەم رۆژانـەدا ئـەم بارودۆخـەی تێـدا دەرکەوتـووە، ئەمنیـەت و ئاسایشـی ناوچەکـە تێکچـووە، بـۆ چاککردنـەوەی هـەر ئێسـتا جەنابـی تەحسـین پاشـا والـی ویلایەتـی موسـڵ خـودی خـۆی بـەرەو سـلێمانی جولـەی کـردووە، لـە وەڵامـدا وێنەی تەلەگرافنامـەی بـە شـیفرەی ناوبراو هاتـووە، جەنابی پەیوەندیدارانـی خەلافەت بە گرنگیەوە دەروانننە ئـەم کارە و بە پەلـە کارەکـە ئەنجام بدرێـت و ئەمـر و فەرمانـی جەنابی پاشـا بـۆ جێبەجێ کردنـی کارەکە دەرچـووە، لـەم بابەتەدا ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ٢٧ زیلحیجـە ١٣٠٢ و لـە ٢٥ ئەیلـوول ١٣٠١.
سورەیا


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1353 | 76

DH.MKT.01353.00076.001

| DH.MKT. | 01353.00076 | 5 شەوال 1303 |
| --- | --- | --- |

٥ شەوال ١٣٠٣
٢٥ حوزەیران ١٣٠٢
بۆ ئەمین ئەفەندی کاتبی شارەوانی سانجەقی سلێمانی
بـۆ ئـەوەی هەندێك زانیـاری تایبەتـی کارگێـری حکوومەتـی سـانجەقی سـلێمانی رابگەیەندرێـت، بـە خـەرج کردنـی خەرجـی رێـگا و لـە ژێـر پاراسـتنەوە دەهێنرێنـە دەرسـەعادەت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە تەلەگرافنامـەی مێـژووی ١٦ نیسـان ١٣٠٢ خوێندراوەتـەوە، بـەڵام پێـش ئـەوەی بگەنـە ئێـرە ئـەو شـتە تایبەتیانـەی کـە مەبەسـتتانە لێـرە باسـی بکـەن، پێشـوەختە بـە نـووسراو رایبگەیەنـن، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش نـووسراو کـرا.

| 2 رەجەب 1304 | 00018.00045 | MV. |
|---|---|---|

٢ رەجەب ١٣٠٤
١٥ مارت ١٣٠٣
پوختەی دارایی
بردنە دەرەوەی زەخیرەی سانجەقەکانی شارەزوور و سلێمانی قەدەغە کراوە، بە بیانووی کاتی دوورینەوە تا کۆتایی نیسان قەدەغەکردنی درێژکراوەتەوە، لەم بارەیەوە لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە وەرگیراوە، رەزامەندی جێبەجێ کردنی کارەکە لە نەزارەتی ناوەخۆ لە نووسراوی مێژووی ٢٧ جەمادی کۆتایی ١٣٠٤ خوێندنەوەی بۆ کرا.

بریارنامە
بە گوێرەی وێنەی ئاماژە پێکردنەکە کە قەدەغەی کردووە زەخیرە بچێتە دەرەوە، دەرکەوتووە لەبەر ئەوەی بە تەواوەتی هیچی نەماوە، بۆیە ئەو قەدەغەکردنەی کە باسکراوە تا کۆتایی نیسان درێژ کراوەتەوە، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە، نووسراو حەواڵەی نەزارەتی ناوهاتوو کراوە تا وەڵام بۆ ویلایەت بنووسرێتەوە.

T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

Y__A___HUS_.00204.00011.002

| Y.A.HUS. | 00204.00011 | 3 شەوال 1304 |
|---|---|---|
| بۆ پایەی سەدارەتی پایەبەرز<br>چەکی میری وەکو مارتنی بە قەپاغ و نێجیستیر لەلای دانیشتوانی سانجەقەکانی شارەزوور و سلێمانییە، بە کۆکردنەوەیان ژمارەی چەکەکان گەیشتۆتە ٢٠٠٠ دانە، لەلایەکی تر لە کۆکردنەوەی پێشوەچوونی پێوە دیارە، هیوادارین ژمارەکەی بگاتە ٣٠٠٠ تا ٤٠٠٠، راگەیەندراوە فەرمان، لە ١٣ حوزەیران ١٣٠٣.<br>موشیری چاکسازی ئیسماعیل حەقی | | |

İ.DH.01012

| 19 رەبیعی یەکەم 1304 | 01012.079888 | I.DH. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
فەرمی
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
نوری ئەفەندی لە ژمێریاری داهاتی ویلایەتی ئایدین لەگەڵ زوهتی ئەفەندی ژمێریاری سانجەقی سلێمانی بەهۆی خزمەتە باشەکانیان و دێرینیان جێگەی پاداشت کردنن، بۆ ئەم مەبەستە نووسراوی نەزارەتی دارایی جەلیلە ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، ناوبراوان نوری ئەفەندی بە ئاماژە پێکردنەوە پلەکەی بەرز دەبێتەوە، هەرچی زوهتی ئەفەندی سەر لە نوێ پلەی سێیەمی پێ دەدرێت، هەر چۆنێك بێت ئەمر و فەرمانی جەنابی هومایۆن چییەك بێت جێبەجێ دەکرێت، لەگەڵ ڕاگەیاندنی نووسراوی بەپەلە نووسرایەوە ئەفەندم.
لە ١٩ رەبیعی یەکەم ١٣٠٤ و لە ٤ کانوونی یەکەم ١٣٠٢
سەدری ئەعزەم



DH.MKT.01369.00108.001

| 3 موحەررەم 1304 | 01369.00108 | **DH.MKT.** |
|---|---|---|

٣ موحەررەم ١٣٠٤
٢٠ ئەیلوول ١٣٠٢
بۆ نەزارەتی دەرەوەی جەلیلە
لەلایەن هۆزی جاف کە سەر بە سانجەقی سلێمانین، تا ئێستا بۆ یەك رۆژیش بێت لە سنووری ئێران سەرپێچیان نەکردووە، بە نووسراو وێنەی کاغەزەکە لەلایەن جەنابی دادوەری سنە نێردراوە و نووسراوی ناوهاتوو لەگەڵ نوسراوی ویلایەتی موسڵی بەهیە کە هاتووە بەیەکەوە هاوپێچ بۆ عالی نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردن و هیممەتی عالی.



DH.MKT.01406.00052.001

| 27 جەمادی كۆتایی 1304 | 01406.00052 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٧ جەمادی كۆتایی ١٣٠٤
١٠ مایس ١٣٠٣
بۆ جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
لە ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێكراوە كە لە سانجەقەكانی شارەزوور و سلێمانی زەخیرە وون بووە، تا مانگی مارت قەدەغەكراوە لەوێ زەخیرە بۆ بەغداد بنێردرێت، چۆنیەتی راگەیاندنی بە ویلایەتی موسڵ راگەیەندراوە، لە وەڵامدا تەلەگرافنامە دەرچووە و وێنەیەكی راگەیەندراوە و پێشكەش كراوە، ئەو ماوەیەی كە قەدەغەكراوە بە كاتی ئابلوقە هەژمار دەكرێت، داوا كراوە تا كۆتایی نیسان درێژ بكرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە جێبەجێ كردنی بە فەرمانی عالی دەكرێت.



DH.MKT.01407.00009.001

| 29 جەمادی کۆتایی 1304 | 01407.00009 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٩ جەمادی کۆتایی ١٣٠٤
١٢ مارت ١٣٠٣
جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
ئیسماعیل پاشا لە مێژووی ٦ی مارتەوە لە سانجەقەکانی شارەزوور و سلێمانی لەگەڵ هەندێك شوێنی ویلایەتی بەغداد کارگێری عورفی راگەیاندووە، تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵەوە نێردراوە، هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1427 12

DH.MKT.01427.00012.001

<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>01427.00012</td><td>14 شەوال 1304</td></tr>
<tr><td colspan="3">٤ شەوال ٣٠٤<br>١٣ حوزەیران ٣٠٣<br>بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>داهاتی گشتی چەند ساڵێکی سانجەقی سلێمانی لە ١٥ یوك قوروش پێك هاتووە، کەچی خەرجی سەربازی و مولکیەی ٥٥ یوك بووە، لە بەرامبەر ئەو داهاتوو و خەرجیەدا هیچ شوێنگرەوەیەك نییە، بۆیە لە رووی کارگێریەوە کێشەیە، بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك لە موتەسەرفیەتی سلێمانی تەلەگرافنامە وەرگیراوە، وێنەیەکی بۆ پەیوەندیدارانی نەزارەت نێردراوە، لەم بابەتەدا بە تێروانینی زانیاری خەزینەی جەلیلە جێبەجێ بکرێت و لەگەڵ خوێندنەوەی پەیوەندیدارانی نەزارەت بەیەکەوە رابگەیەندرێت و ئاماژەی پێ بکرێت.</td></tr>
</table>




DH.MKT.01432.00115.001

| DH.MKT. | 01432.00115 | 25 شەوال 1304 |
|---|---|---|

٢٥ شەوال ١٣٠٤

٤ تەمموز ١٣٠٣

بۆ جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت

داهاتی سانجەقی سلێمانی لەگەڵ خەرجی مولکیە و سەربازی یەك ناگرتەوە، لەبەر ئەوەی چارەسەرێکی بەپەلەش نەدۆزراوەتەوە، لایەنی کارگێری زیانی پێ دەگات، لەبەر ئەم هۆکارەوە بە شێوەیەکی سروشتی بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەك لەم بابەتەدا هەندێك ووتە هەیە بە تەلەگرافنامە لەلایەن موتەسەرفیەتی سلێمانی نێردراوە، هاوپێچ ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بارەیەوە سەرەتا ئەو تەلەگرافنامانەی کە لەلایەن موتەسەرفیەتی ناوهاتووەوە دەرچووە، بە نووسراوی بەندە بۆ نەزارەتی دارایی نێردراوە، بەم ووردبینانەی کە ئەنجام دراوە، روون بۆتەوە لە ویلایەتەکانی دەوروبەر گواستنەوە و ناردنی زەخیرە بۆ ئەوێ مەحاڵە، بۆیە دەرکەوتووە هیچ چارەیەکی تر نییە تەنیا ئەوە نەبێت کە بە پێشینە پارەکە وەربگیرێت، لەبەر گرنگی ناوچەکە ڕاگەیەندراوە و بڵاوکراوەتەوە، بۆ ناردنی ئاقچە بۆ ناوچەی باسکراو ئەو ئامادەکاریانەی پێویستە بکرێت و بەپەلە جێبەجێ بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش لە نەزارەتی ناوهاتوو فەرمانی تایبەت دەردەچێت و فەرمانیش لەلایەن پەیوەندیدارانی سەدارەتەوە دەبێت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
ŞD
2158 27 2

ŞD.02158.00027.002

<table>
<tr><td>19 رەبیعی کۆتایی 1304</td><td>02158.00027</td><td>ŞD.</td></tr>
<tr><td colspan="3">لەلایەن مەلیك ئەفەندی ژمێریاری پێشووی سانجەقی سلێمانی، پارەی دەوڵەت بەهەدەر براوە و دزی کراوە، بۆ ئەمەش لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەت بریار و هاوپێچەکانی لە مێژووی ٢٦ کانوونی یەکەم ٣٠٢ ژمارە ١١٨ بۆ لای ئێمە هاتووە، ووردبینی بۆ کراوە، دەرکەوتووە لەگەڵ یاسا گونجاوە، بۆ رۆژێکیش بێت لەلایەنی بریارەوە رەخنەم نەبووە، کاغەزەکانی نێردراو داواکراوە بدرێتە سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی جەلیلە، لەم بابەتەدا فەرمان، لە ٣ کانوونی دووەم ٣٠٢.<br>مۆری سەید حەسەن داواکاری گشتی ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەت</td></tr>
</table>

| MV. | 00025.00058 | 13 سەفەر 1305 |
|---|---|---|

١٣ سەفەر ١٣٠٥
١٨ تشرینی یەکەم ١٣٠٣
پوختەی دارایی
بۆ دانیشتوانی هەژار و دەستکورتی سانجەقەکانی موسڵ و سلێمانیەی سەر بە ویلایەتی موسڵ، وەکو قەرەبوو کردنەوە خواردن و دانەوێڵە دابەش دەکرێت، بە کۆکردنەوەی بری ٢٥٠٠٠٠ قیە زەخیرە بەسەریاندا دابەش دەکرێت و پێیان دەدرێت، لەم بارەیەوە لەلایەن والی ویلایەتی ناوهاتووەوە تەلەگرافنامە هاتووە لەسەر ئەم تەلەگرافنامەیە لەگەڵ نەزارەتی دارایی قسە کراوە و دوای پرس و را نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆ لە ٧ سەفەر ١٣٠٥ خوێندنەوەی بۆ کرا.

بریار
لەم نووسراوەدا راگەیەندراوە بەهۆی هەژاری و پێویستی دانیشتوان، ٢٥٠٠٠٠ قیە زەخیرەی باسکراو لە ئەنجوومەنی خۆچێی ئامادەیە، ساڵی داهاتوو هەژاری هەموو گوندێك وەریدەگرێت، لە لایەن والی ویلایەتی ناوهاتوو رەزامەندی دراوە، لە وەڵامی نەزارەتی ناوەخۆش ئاماژەی پێکراوە و زانیاری لە نەزارەتی دارایی دەرچووە، بە یەکگرتووی نووسراو نووسراوەتەوە.




| 2 سەفەر 1305 | 00040.00017 | Y.A.RES. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ١١٠٩
بۆ جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
ڕاگەیەندراوی بەندەتانە کە هیچ نرخێکی نییە
جەنابی عەبدولقادر کەمالی پاشا ماوەی رابردوو لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی دامەزرا، بەڵام دوای ئەوەی نووسراوی ناوبراو پێشکەشی پەیوەندیدارانی سەدارەت کرا، حەواڵەی نەزارەتی عاجیزانە کرا، بەڵام تێدا هاتووە ناوبراو لەگەڵ کەشوهەوای ناوچەکە ناگونجێت و پێشووتریش ئەم ئەزموونەی هەبووە، بۆیە داوای کردووە لە موتەسەرفیەتی باسکراو بووردرێت، لە ئەنجامدا بە پێویست زانراوە لە شوێن ئەو کەسێکی تر دابمەزرێت، سەرەتا عومەر پاشا کە لە موتەسەرفیەتی جەبەل بەرەکەت بوونی هەیە و خانەدان و لێهاتووە، خەریکی نیشتەجێ کردنی تاقمێك هۆزی کەللە رەقە، هەروەها چەند ساڵێك پاشکۆی ئەندامانی رەدیفی کۆکردۆتەوە و سەرکەوتووە بووە لە رێکخستنیان، بۆیە شایەنی پاداشت کردن بووە، سەرەتا لە پایەی ویلایەتی ئەدەنە پلەکەی بەرز بۆتەوە، هەروەها دامەزراندنی ناوبراو لە موتەسەرفیەتی سلێمانی و لە چاو گرنگی لیوای ناوهاتوو گونجاوە، هەرچی پلەکەیەتی بۆ میری میرانی روم ئیلی بەرز بکرێتەوە و ئەمەش بە هاوکاری پەیوەندیدارانی سەدارەتەوە دەبێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢ سەفەر ١٣٠٥ و لە ٧ تشرینی یەکەم ١٣٠٣.
نازری کاروباری ناوەخۆ





| MF.MKT. | 00099.00043 | 17 جەمادی کۆتایی 1305 |
|---|---|---|

- ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ١٢٦
نەزارەتی مەعاریفی جەلیلە
لەسەر تەلەگرافنامەی پەیوەندیداری نەزارەت لە مێژووی ٢٧ تەمموز ٣٠٣ نووسراو لە ئەنجوومەنی کارگێری کراوە، کە لە سانجەقەکانی شارەزوور و سلێمانییەی ویلایەت هێشتا دەستپێشخەری نەکراوە لە دامەزراندنی مەکتەبەکانی دواناوەندی، بەڵام مەرکەزی ویلایەت کە موسڵە، بە تێپەربوونی رۆژگار مەکتەبی دواناوەندی ناوچەی ئیچ قەلعە تێکچووە و ئێستا بە کەڵکی حکوومەت نایەت، بە مەبەستی دروست کردن، وێنەی بریارنامەی مێژووی ٢٣ کانوونی دووەم ٣٠١ ژمارە ٢١٨ لەگەڵ زانیاری بە پەیوەندیدارانی نەزارەت راگەیەندراوە، بەڵام تا ئێستا وەڵامەکەی لە عالیەوە نەهاتووە، بۆیە کارەکە ئەنجام نەدراوە، بۆ دەست کردن بە دروست کردنی مەکتەبی باسکراو، بەپەلە وەڵامی بریارنامەی نێردراو بنێردرێت و دووبارە بە جەنابی سەدری ئەعزەم راگەیەندراوە، لە هەر حاڵەتێکدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٧ جەمادی کۆتایی ٣٠٥ و ١٧ شوبات ٣٠٣.
مۆری فائیق مستەفا والی ویلایەتی موسڵ

- ژمێریاری لە ٢١ مارت ٣٠٤
ئەو نووسراوانەی کە لەسەر بریارنامە راگەیەندراوە، بری داهاتی ساڵەکانی ٣٠٠ و ٣٠١ ی مەعاریفی موسڵ لەگەڵ سانجەقەکانی تر، بۆ دروست کردنی مەکتەبی دواناوەندی ئیچ قەلعە دابین دەکرێت، بە سەیرکردنی تۆمارەکان دەرکەوتووە، لەسەر راگەیەندراوی ٢٨ نیسان ٣٠٤ لەگەڵ تەلەگرافنامەی پەیوەندیدارانی نەزارەت پرس و را کراوە، کەچی تا ئێستا وەڵامەکەی نەهاتووە، هەروەها لەسەر بریارنامەی باسکراو ئەو بریارەی لە ئەنجوومەن دەدرێت، لەسەر ئەو وەڵامە وەستاوە کە دەردەچێت، چۆنیەتی دووپاتکردنەوەکەش بە رای عالی دەبێت، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٣ شەوال ٣٠٥ و لە ١١ حوزەیران ٣٠٤.

بۆ قەڵەمی تۆمارکردن لە ١٤ حوزەیران ٣٠٤


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
Y.A. HUS 207/78

Y.A.HUS.00207.00078.001

<table>
<tr><td>Y.A.HUS.</td><td>00207.00078</td><td>3 سەفەر 1305</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>.... دیوانی هومایۆن<br>١<br>ماوەی پێشوو لە ناو سانجەقی سلێمانی، زەکەریا بەگ قائیمقامی رەدیف لەگەڵ هاوەڵانی لە سەربازانی شاهانە لەلایەن پشدەریەکانەوە ئابلۆقەدراون و تووشی تەنگ پێ هەڵچنین بوونەتەوە، دواتر ئەم پشدەریانە بۆ ئێران رۆیشتوون، ئەو کاتەی کە دەگەرێنەوە بۆ گوندەکەیان، چەکەکانیان وەربگیرێتەوە و ئەوانەی دەستیان لە کارەکە هەبووە، تەمبێ بکرێن، بۆ ئەمەش ئامادەکاری پێویست کراوە، تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ هاتووە، بە فەرمانی عالی راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لە ٣ سەفەر ١٣٠٥ و ٨ تشرینی یەکەم ١٣٠٣.<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

Y.A.HUS 207 /105

Y.A.HUS.00207.00105.001

| 17 سەفەر 1305 | 00207.00105 | Y.A.HUS. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
..... دیوانی هومایۆن
٣
ماوەی رابردوو لە سانجەقی سلێمانی، زەکەریا بەگ قائیمقامی رەدیف لەگەڵ سەربازانی شاهانە ئەرکیان پێ درابوو، ئەو پشدەریانەی کاری چەتەییان ئەنجام دابوو، چوونەتە ئێران، هەر هەموویان بە فەرمانی جەنابی پاشا گەرێندراونەتەوە گوندەکانی خۆیان و ملکەچیان کردوون، ئەو چەکە میریانەی کە لە ژێر دەستیان بووە، بەشێکی لێیان وەرگیراوەتەوە، ئەوەی لەم رووداوەش دەستی هەبووە، دەستگیر کراوە، هەموو هۆزەکانیش بە گشتی لە شوێنەکانی خۆیان پەرشوبڵاوبوونەتەوە، ئاسایش بەرقەرار بووە، هەروەها جانەوەرەکانیش دادگایی دەکرێن و لەسەر سزادانی سەرپێچی کەرانیش فەرمانبەرانی ناوەخۆ ئاگادار کراونەتەوە، ناوبراوان گەراونەتەوە مەرکەزی ویلایەت، ئەو تەلەگرافنامەیەی کە لە والی موسڵ وەرگیراوە، لەسەر فەرمانی عالی راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە ئەفەندم، لە ١٧ سەفەر ١٣٠٥ و لە ٢٢ تشرینی یەکەم ١٣٠٣.
سەدری ئەعزەم



İ.DH.01051

| 7 موحه‌ررەم 1305 | 01051.082537 | I.DH. |
| --- | --- | --- |

كۆشكی یڵدزی هومایۆن
فه‌رمانگه‌ی باش كیتابه‌ت
لـه ناوچـه‌ی پشـده‌ری سـه‌ر بـه سـانجه‌قی سـلێمانی رووبه‌رووبوونـه‌وه لـه نێـوان سـه‌ربازی شـاهانه و پشـده‌ریه‌كان روویـداوه، بـۆ ئـه‌م مه‌بەسـته لـه ویلایه‌تـی موسـڵ ته‌له‌گرافنامـه لـه ٧ ئه‌یلـوول ١٣٠٣ له‌گـه‌ڵ ئامـاژه‌ی په‌یوه‌ندیدارانـی سـه‌داره‌ت بـۆ نه‌زاره‌تـی ناوه‌خـۆی جه‌لیلـه نێـردراوه، فه‌رمانـی ئـه‌وه دراوه رووبه‌رووبوونه‌وه‌كـه یه‌كلایی بكرێتـه‌وه، ئه‌گه‌رچی لـه خۆچێـی ئامـاده‌كاری سـه‌ربازی كـراوه، بـه‌ڵام ژماره‌كـه‌ی تـه‌واو نییـه و پێویسـته برێكـی تـر سـه‌ربازی شـاهانه ره‌وان بكرێـت، لـه بریـكاری موشیره‌تی له‌شكری شه‌شـه‌می هومایۆن ئاماژه كـراوه ئـه‌م ئـاژاوه كۆتایـی پـێ بهێنرێـت، لـه وێنـه‌ی ئـه‌م ئاماژه‌یـه كـه لـه ٤ موحـه‌رره‌م ١٣٠٥ له‌گـه‌ڵ نـووسراوی تایبه‌تـی سـه‌ر عه‌سـكه‌ر دوو پارچـه ته‌له‌گرافنامـه پێشـكه‌ش كـراوه تێـدا ئامـاژه‌ی پێكـراوه و راگه‌یه‌نـدراوه، بـه فه‌رمانـی پاشـای جه‌نابـی پاشـا لێكۆڵینـه‌وه كـراوه، ئه‌نجامه‌كـه‌ی له‌سـه‌ر ناردنـه، له‌لایـه‌ن جه‌نابـی شـه‌هریار ده‌رویـش پاشا پێشـكه‌ش كـراوه، كـه ئـه‌و داواكاریـه‌ی بـۆ چاكسـازی سـه‌روو فه‌رمووبه‌تـی، بـۆ هۆزه‌كانـی ئـه‌و لایه موشـیر ئیسـماعیل حه‌قـی پاشا ئه‌ركـی پێـدراوه و ده‌بـێ له‌لایـه‌ن ناوبـراوه‌وه چه‌نـد چه‌كـی میـری لـه‌لای هـۆزه‌كان هه‌یـه، بـه ته‌واوه‌تـی وه‌ربگیرێـت و بگه‌رێندرێتـه‌وه، لـه‌م كاره‌ش سـه‌ركه‌وتوو بوونـه، ئـه‌م رووداوه لـه ناحیـه‌ی پشـده‌ر بخرێتـه ژێـر ئابڵوقـه‌وه، لـه كۆتاییـدا قائیمقـام زه‌كه‌ریا بـه‌گ گه‌راوه‌تـه‌وه بـه گوێـره‌ی زانیـاری ناوبـراو، یـه‌ك خه‌یـل چـه‌ك كۆكراوه‌تـه‌وه، بـه تێپه‌ربوونـی كات موته‌سـه‌رفی سـلێمانی پاشـكۆی ئه‌منیه‌تـی ٣٠ سـاڵه‌ی خسـتۆته ته‌نگانـه و بـه په‌لـه ده‌سـتپێشـخه‌ری كـردووه لـه كاره‌كانـدا و تێكه‌ڵـی كاره‌كان بـووه، هه‌روه‌هـا والـی موسـڵ بـۆ به‌رژه‌وه‌نـدی زاتـی خـۆی تێروانینـه پیسـه‌كه‌ی بـه هه‌نـد وه‌رنه‌گرتـووه و لـه‌م كاتـه ناسـكه‌دا له‌گـه‌ڵ ئاغاكانـی ناحیـه‌ی پشـده‌ر سـه‌رپێچیه‌كه‌ی بـه داوه‌ت كردنیـان كۆتایـی پـێ هێنـاوه، ئه‌مـه‌ش وایكـردووه هـۆكار بداتـه ده‌سـت بـۆ رووداونـی ئـه‌م رووداوه، بۆیـه راگه‌یه‌نـدراوه و په‌سـه‌ند كـراوه كـه مانـه‌وه‌ی والـی و موته‌سـه‌رفی ناوبـراو هیـچ سـوودێكی نابێـت، لـه رێگـه‌ی ئـه‌م خوێندنـه‌وه‌وه بیـنراوه، رێگـه نه‌درێـت یـه‌ك رووداو سـه‌رهه‌ڵبداته‌وه و هه‌رچـی زووه ئـه‌م كاره كۆتایـی پـێ بهێنرێـت، بۆیـه كاری پێویسـت و ئاماده‌كاری تـه‌واو بكرێـت، بـه فه‌رمانـی هومایۆنـی جه‌نابـی فه‌رمانـره‌وا فه‌رمـان دراوه، لـه‌م بابه‌تـه‌دا ئه‌مـر و فه‌رمـان بـۆ جه‌نابـی ئـه‌و كه‌سـه‌یه كـه فه‌رمـان ده‌رده‌گات، لـه ٧ موحـه‌رره‌م ١٣٠٥ و لـه ١٣ ئه‌یلـوول ١٣٠٣.
جه‌نابی شه‌هریاری سه‌ر كاتیب سوره‌یا


İ.DH.01053

| I.DH. | 01053.082642 | 9 موحەررەم 1305 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
.... دیوانی هومایۆن
بۆ جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لەبەر ئەوەی جەنابی رەئوف پاشا موتەسەرفی سانجەقی سلێمانی؛ لە رووی بەرێوەبردنی کارگێرییەوە لاوازە و لە ئەنجامدا هەندێك رووداو روویداوە، بۆیە بە پێویست زانراوە گۆرینەوەی پێ بکرێت، هەروەها جەنابی پاشا و نازری ناوەخۆ، عەبدولقادر کەمالی پاشایان بە گونجاو زانیوە، لە موتەسەرفیەتی ناوهاتوو دابمەزرێت، ناوبراو لە موتەسەرفیەتی سانجەقی گۆمونجە جیابۆتەوە جگە لەمە کەسێکە خەڵکی بینیوە، لە بارەی دامەزراندنی عەبدولقادر کەمالی پاشا ئەمر و فەرمانی جەنابی پاشا هەر چییەك بێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراوی بەپەلە نووسرایەوە ئەفەندم.
لە ٩ موحەررەم ١٣٠٥ و لە ١٥ ئەیلوول ١٣٠٣
سەدری ئەعزەم



İ.DH 1053/82657

İ.DH.01053

| I.DH. | 01053.082657 | 16 موحەررەم 1305 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
..... دیوانی هومایۆن
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم

لە ناو سانجەقی سلێمانی، بەهۆی لێنەهاتوویی و بێ توانایی دەرویش ئەفەندی قائیمقامی قەزای مەرگە دوور دەخرێتەوە و لە شوێن ئەو مەحمود بەگ بەرێوەبەری ناحیەی سەرچنار دادەمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر ئاماژەی ویلایەتی موسڵ نووسراوی پێکراوە، بریارنامەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران دراوەتە قەڵەم لەگەڵ کاغەزی زانیاری کەسێتی نێردراوە، بەم راگەیەندراوە بۆ جێبەجێ کردنی مامەڵەکە لە نەزارەتی ناوخۆی جەلیلە نووسراو راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیدارانی خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو نووسرایەوە ئەفەندم.

لە ١٦ موحەررەم ١٣٠٥ و لە ٢٢ ئەیلوول ١٣٠٣

سەدری ئەعزەم


يلدز سراى همايونى
باش كتابت دائرەسى

I.DH 1069/83888

İ.DH.01069

| 1305 جەمادی کۆتایی 10 | 01069.083888 | I.DH. |
| --- | --- | --- |

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
شێخ عوسمان ئەفەندی زادە ئەحمەد شەمسەددین ئەفەندی تەویڵەیی ئەو تەکیە و مەدرەسەیەی کە لە گوندی ئەحمەد ئابادی قەزای گولعەنبەری سەر بە سانجەقی سلێمانی دروستی کردووە، بۆ بەڕێوەچوونی مورید و فێرخوازەکانی، لە سنووری ئێران بە بری ٤٠ تا ٥٠ هەزار قوروش ترێ و دە یەکی شەرعی زەوی بابا کوچك و پریس کە خاڵیە پێی بدرێت، لە جیاتی شوێنگرەوەش بە سێ بەش جێبەجێ بکرێت، هەروەها شایەد ئەگەر ئەم زەوی و زارە رۆژێك لە رۆژان کێشەی هەبوو، ئەو کاتە بۆ خانەقای ناوهاتوو زەوی گونجاوتری دەوروبەری بە شێوازی شوێنگرەوە و مەرجی نووسراو پێی بدرێت، فەرمانی پاشای جەنابی پاشا کە دەرچووە جێبەجێ بکرێت، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١٠ جەمادی کۆتایی ٣٠٥ و لە ١٠ شوبات ٣٠٣
سورەیا سەرکاتبی جەنابی شەهریار


I.DH 1070/83974 3

İ.DH.01070

| I.DH. | 01070.083974 | 9 جەمادی کۆتایی 1305 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
.... دیوانی هومایۆن
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
جەمیل ئەفەندی یاریدەدەری داواکاری گشتی سانجەقی سلێمانی بوێری هەندێك کار و مامەڵەی کردووە کە لە دەرەوەی یاسا بووە، لەسەر ئەم سکاڵایانەی لەسەری بەرزکراوەتەوە، لە خۆچێی ئەو هەواڵەی هاتووە تێدا دەرکەوتووە، لابردنی بە پێویست زانراوە، لە شوێن ئەو دەرچووی مەکتەبی شاهانەی یاسا حافز عوسمان ئەفەندی هەڵبژێردراوە، لە ئەنجوومەنی دادی فەرمانبەران بریارنامە رێکخراوە لەگەڵ هاوپێچەکەی پێشکەشی نەزارەتی دادی جەلیلە کراوە، لەم بابەتەدا فەرمانی پاشای جەنابی پاشا چ بفەرمووێت بەپەلە جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو نووسرایەوە ئەفەندم.
لە ٩ جەمادی کۆتایی ١٣٠٥ و لە ٩ شوبات ١٣٠٣
سەدری ئەعزەم


İ.DH. 1090/
85454
İ.DH.01090

| I.DH. | 01090.085454 | 14 زیلقەعدە 1305 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
..... دیوانی هومایۆن
جەنابی ئەفەندم
بەهـۆی هـەوڵ و کۆششـەکانی محەمـەد رەفعـەت ئەفەنـدی بەرێوەبـەری فەرمانگـەی رەژی سـانجەقی سـلێمانی، بـە پلـەی سـێیەم رێـزی لـێ بگیرێـت، لـەم بارەیـەوە نـووسراوی نەزارەتـی دارایـی جەلیلـە هاوپێـچ راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی شـەهریار بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی، نـووسراوی بـە پەلـە نووسرایـەوە ئەفەنـدم.
لە ١٤ زیلقەعدە ١٣٠٥ و لە ١١ تەمموز ١٣٠٤
سەدری ئەعزەم



DH.MKT.01452.00035.001

| 13 موحەررەم 1305 | 01452.00035 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٩ ئەیلوول ١٣٠٣
تەلەگرافنامە بۆ ویلایەتی موسڵ
عەبدولقادر كەمال پاشا كە لە موتەسەرفیەتی گومولجینە جیا بۆتەوە، لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی دادەمەزرێت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1456 44

DH.MKT.01456.00044.001

| 2 سەفەر 1305 | 01456.00044 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢ سەفەر ٣٠٥
٧ تشرینی یەکەم ٣٠٣
بۆ جەنابی لایەنی عالی لە پەیوەندیداری سەدارەت
ماوەیەك پێش ئێستا لە پلەی میری میران، جەنابی عەبدولقادر کەمال پاشا لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی دامەزراوە، نووسراوەکەی پێشکەشی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت کراوە و دواتر حەواڵەی نەزارەت کراوە، لەبەر ئەوەی ناوبراو لەگەڵ کەشوهەوای ئەوێ ناگونجێت و پێشووتر ئەزموونی هەبووە، بۆیە داوای کردووە لە موتەسەرفیەتی باسکراودا بووردرێت و بە پێویست زانراوە کەسێکی گونجاوی تر لە شوێنی ئەو دابنرێت، هەروەها پێشەکی میری میران عومەر پاشا کە لە موتەسەرفیەتی جەبەل بەرەکەت بووە و کەسێکی لێهاتوو و بە توانایە، لەو کاتەی لەسەر ئەرکەکەی بووە، فەرمانی نیشتەجێ کردنی تاقمێك هۆزی کەللە رەقی داوە و چەند ساڵێك کاریگەری لەسەر ئەندامانی رەدیفە و پاشکۆکانی هەبووە، بۆیە شایەنی ئەوەی رێزی لێ بگیرێت، کاری بەرزکردنەوەی پلەکەی لە ویلایەتی ئەدەنە کۆتایی پێهاتووە، ناوبراو لە موتەسەرفیەتی سلێمانی دابمەزرێت، چونکە بۆ گرنگی ستراتیژی لیوای ناوهاتوو کەسێکی گونجاوە، پلەکەشی بۆ پلەی میری میرانی رومەلی بەرز بکرێتەوە، شایەنی ئەوەیە پەیوەندیداری سەدارەت بفەرموێت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1505 117

DH.MKT.01505.00117.001

| DH.MKT. | 01505.00117 | 21 شەعبان 1305 |
|---|---|---|

٢١ شەعبان ٣٠٥
٢٠ نیسان ٣٠٤
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
لە ناحیەی سورتاشی سەر بە سانجەقی سلێمانی؛ محەمەد فکری ئەفەندی مولازمی خاوەن هەڵبژاردننامە وەکو بەڕێوەبەری ناحیەی سورتاش دادەمەزرێت، لەسەر ئەو بڕیارەی کە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران دراوە، هەروەها بۆ ئەم کارەی مانگانە ٥٠٠ قوروش مووچەی بۆ براوەتەوە، ناوبراو لەگەڵ مێژووی دەست بە کاربوونی مووچەکەی پێ دەدرێت، تۆمارەکەی ڕێکخراوە و لەوێش هەر لەگەڵ مێژووی جێبەجێ کردنی کارەکە رادەگەیەندرێت و هەروەها مانگانە ئەو مووچەیەی ناوبراو وەریدەگرێت بە گوێرەی بڕیارنامە نیوەی مووچەکەی بۆ سندوقی خانەنشینی تەرخان دەکرێت، جگە لەمە خەرجی ڕێگاکەی کە لە ١٨٦٠ قوروش پێك دێت، بە گوێرەی ڕێنمایی لە دارایی خۆچێی ڕێك دەخرێت لەگەڵ ڕێکخستنی خشتەی خەرجی تێدا دەنووسرێتەوە، بەڵام بە تۆمار دەرکەوتووە بەڕێوەبەرایەتی ناوهاتوو لەسەر عەبدولقادر بەگە، لە بارەی عەبدوڵڵا ئاغا بەڕێوەبەری پێشوو، والا ئاگادار کراوەتەوە ئاخۆ کێ لە شوێن کێ دامەزراوە، هەروەها لە ژمێریاریش گفتوگۆی لەسەر کراوە، هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی.



DH.MKT.01540.00014.001

| DH.MKT. | 01540.00014 | 22 زیلحیجه 1305 |
|---|---|---|

٦٧٩
نزیکـەی ١٠٠٠ چەتـە هێرشـیان کردۆتـە سـەر شـارۆچکەی قـەرەداغ سـەر بـە سـانجەقی سـلێمانی، پارەوپـول و کەلوپەلـی دانیشـتوانیان تـاڵان کـردووە، هەروەهـا جۆرەهـا سـەرپێچیان ئەنجـام داوە، بـۆ چاکسـازی و سـزادانی ئـەو چەتـە هەمەوەندانـەی کـە ناویـان نـووسراوە، لـە پلـەی میـری میـران جەنابـی ئیسـماعیل پاشـا و هاوکارەکـەی ئەرکیـان پـێ سـپێردراوە، بـۆ ئەمـە مەبەسـتەش بریارنامەیـان نـاردووە، دوای پەسـەند کردنـی ئـەو سـزایانەی نیشـان دراون، لێـرە لـە دیوانـی جەنگـی کارگێـری عورفـی بریـاری لەسـەر دراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی کارەکـە، ووتـەی سەرعەسـکەری والا نێـردراوە، لەگـەڵ هاوپێچـی نـووسراو بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، بـە تێروانیـن لـە نـووسراوەکان، دەوڵـەت خوێندنـەوەی بـۆ کـردووە، بـە گوێـرەی ئامـاژە پێکردنەکـە هیممـەت بکرێـت، بـۆ ئەمەش نـووسراو کـراوە.
لە ٢٢ زیلحیجه ٣٠٥ و له ١٨ ئۆغستۆس ٣٠٤

<table>
<tr><td>Y.A.HUS.</td><td>002007.00076</td><td>2 سەفەر 1305</td></tr>
<tr><td colspan="3">
- بابی عالی<br>
فەرمانگەی دەرەوە<br>
قەڵەمی تۆمارکردن<br>
ژمارە ٦٥٥<br>
بۆ جەنابی پەیوەندیدارانی سەدارەت<br>
ڕاگەیەندراوی بەندەیەکی بێ نرخە<br>
دانیشتوانی پشدەر لە ناو سانجەقی سلێمانی بوێری ئەوەیان کردووە جموجۆڵی نەشیاو بەرامبەر سەربازی شاهانە ئەنجام بدەن، بۆ ئەم مەبەستە فەرمان و ئاماژەی جەنابی پەیوەندیدارانی سەدارەت ڕەوان کراوە، بۆ ئەوەی دانیشتوانی پشدەر لێیان قەبوڵ نەکرێت بچنە ئێران و لە ئێران دانیشتوانی بانە و سەردەشت کە بەشداریان لە کارەکە کردووە، پاشەکشەیان پێ بکرێت، لە وەڵامدا باڵیۆزخانەی تاران لە مێژووی ٩ موحەررەم ١٣٠٥ تەلەگرافنامەی ناردووە، نوسراوی بەندە پێشکەش کراوە و تەلەگرافنامەی باسکراو لەم بارەیەوە ئاگاداری داوەتە حکوومەتی ئێران، بەڵام هیچ ڕوونیەکی تێدا بەدی ناکرێت، بۆ ئەوەی حکوومەتی شاهانە ئاگاداری توندتر دەربکات، بە دووپاتکردنەوە باڵیۆزخانەی ناوهاتوو ئاگادار کراوەتەوە، کە بانە و سەردەشتیەکان بکشێنەوە لەگەڵ ئەمەش ڕێگە نەدرێت پشدەریەکان ڕوو بکەنە ئێران، بۆ ئەم مەبەستەش لەلایەن حکوومەتی ناوهاتووەوە فەرمانی پێویستی دەرکردووە و ئەمجارە لە باڵیۆزخانەی ناوهاتوو تەلەگرافنامە لە مێژووی ٩ تشرینی یەکەم ١٢٨٧ ژمارە ٨٨ پێشکەش دەکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٥ موحەررەم ١٣٠٥ و لە ١ تشرینی یەکەم ١٣٠٣.<br>
نازری دەرەوە<br>
<br>
- بابی عالی<br>
فەرمانگەی سەدارەت<br>
.... دیوانی هومایۆن<br>
ماوەی ڕابردوو لە ناو سانجەقی سلێمانی، پشدەریەکان بوێری ئەوەیان کردووە زەکەریا بەگ قائیمقامی ڕەدیف لەگەڵ هاوەڵانی لە سەربازانی شاهانە ئابڵوقە بدەن و تووشی تەنگانەیان بکەن، لە ئێرانیەکان دانیشتوانی بانە و سەردەشتیش بەشداریان کردووە، بەو ئاگاداریەی پێشووتر نێردراوە، ئەوان بکشێنەوە و ڕێگە نەدرێت پشدەریەکانیش بچنە ناو ئێران، بۆیە حکوومەتی ئێران فەرمانی داوەتە پەیوەندیداران، لەم بارەیەوە لە باڵیۆزخانەی تاران تەلەگرافنامە وەرگیراوە، لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی دەرەوەی جەلیلە ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لە ٢ سەفەر ١٣٠٥ و لە ٧ تشرینی یەکەم ١٣٠٣.<br>
سەدری ئەعزەم
</td></tr>
</table>

<table>
<tr><td>3 سەفەر 1306</td><td>00218.00008</td><td>Y.A.HUS.</td></tr>
<tr><td colspan="3">
- ویلایەتی موسڵ<br>
قەڵەمی تۆمارکردن<br>
ژمارە ٨١<br>
بۆ لایەنی عالی لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>
لە ١٠ی ئۆغستۆسی رۆژی پێنج شەممە کاتژمێر ٨:٣٠ لە گوندی جیشانە و دەورووبەری سەر بە ناحیەی سەرچناری رۆژئاوای سلێمانی لەسەر گردێك لە شێوەی ئەهرام ئاگرێك داگیرساوە، بە سوتاندنی ماددەی خۆڵ و بەرد، لەگەڵ هەوا تێکەڵ بووە و بەرز بۆتەوە، ئەم دووکەڵە لە رۆژهەڵاتی سلێمانی بۆ لای گوندی دیلەور رۆیشتووە و لەبەر ئەوەی ئەم گوندە لەسەر پردێکە لە ژێر ئەم پردە دوو کەس هەبووە، یەکیان مردووە و ئەوی تریان بۆتە دیلی سەر جێگا، هەروەها لە گوندی گولعەنبەر لە گوندی خورماڵر شتێکی وا روویداوە لە جیاتی باران بارین نزیکەی ٥ تا ١٠ خولەك بەرد باریوە، ئەلحەمدولیللا کەس زیانی پێنەگەیشتووە و زیانی نەبووە، تەنیا زیانی بە کشتوکاڵ گەیاندووە نموونەیەك لە بەردەکانیش نێردراوە، لە موتەسەرفیەتی سلێمانی بە نووسراو ئاماژەی پێکراوە، نموونەکەش بۆ ئەوەی بدرێتە پەیوەندیدارانی نەزارەت، رادەستی پۆستە کراوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٧ موحەررەم ١٣٠٦ و لە ١ ئەیلوول ١٣٠٤.<br>
والی ویلایەتی موسڵ<br>
<br>
- بابی عالی<br>
فەرمانگەی سەدارەت<br>
.... دیوانی همایۆن<br>
٤<br>
لە ئۆغستۆسی رابردوو لە ناو سانجەقی سلێمانی لەسەر گردێکی سەر بە گوندی جیشانە ئاگر کەوتۆتەوە، دووکەڵەکەی بۆ ئاسمان بەرز بۆتەوە و لەگەڵ هەوا تێکەڵ بووە، لە گوندی دیلە کاریگەری لەسەر دوو کەس دروست کردووە، یەکێکی مردووە، هەروەها لە گوندی خورماڵری قەزای گولعەنبەر نزیکەی ٥ تا ١٠ خولەك بەرد باریوە، لە رووی خەڵکەوە هیچ زیانی نەبووە، لەم بەردانەش نموونەیەکی وەرگیراوە و پارچەیەکی نێردراوە، لەو نووسراوانەی لە ویلایەتی موسڵ نێردراوە لەسەر فەرمانی عالی نووسراوی ویلایەتی موسڵ و پارچە بەردەکە لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە پێشکەش کراوە، لە ٣ سەفەر ١٣٠٦ و لە ٢٧ ئەیلوول ١٣٠٤.<br>
سەدری ئەعزەم
</td></tr>
</table>

T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)©



OSMANLI ARŞİVİ
ŞD
892 63 2

ŞD.00892.00063.002

<table dir="rtl">
<tr><td>ŞD.</td><td>00892.00063</td><td>13 شەوال 1306</td></tr>
<tr><td colspan="3">فەرمانگەی خانەنشینی مولکیە<br>ژمارە ٣١٢٠<br>عالم پاشا پێش مردنی موتەسەرفی سانجەقی سلێمانی بووە، بۆیە خێزانەکەی شەمس نور خان داواکاری بۆ سندوقی خانەنشینی ناردووە و داوای کردووە مووچەی خانەنشینی بۆ ببڕێتەوە، لە ژمێریاری کاغەزی پەیوەست بەم بابەتە پەراوێزی بۆ ڕێکخراوە و بە کۆکردنەوەی هەژماری پۆستە وردبینی بۆ کراوە. لە پۆستەی ناوهاتوو دەرکەوتووە کۆچکردووی ناوبراو مانگانە لە سندوق ٢٨٤٢ قوروش مووچەی وەرگرتووە، لە مێژووی ٢٧ نیسان ١٣٠٥ خانەنشینی ڕێکخراوە، هەروەها بە بڕیارنامەی فەرمانبەرانی مولکیە ماددەکانی ٣٤ و ٣٥ و ٣٨، بڕی ٩٦٠ قوروش نیشان دراوە، مامەڵەی مووچەی باسکراو بە ماددەی ٣٤ جێبەجێ دەکرێت، نووسراو کراوە کە لە سندوق دابین بکرێت، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>لە ١٣ شەوال ١٣٠٦ و لە ٣٠ مایس ١٣٠٥</td></tr>
</table>

T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1545 56

DH.MKT.01545.00056.001

| 15 موحەررەم 1306 | 01545.00056 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٥ موحەررەم ١٣٠٦
١٠ ئەیلوول ١٣٠٤
بۆ نەزارەتی سندوقی خانەنشینی جەلیلە
لە بارەی خانەنشینیەوە جەنابی رەئوف پاشا موتەسەرفی پێشووی سانجەقی سلێمانی داواکاری پێشکەش کردووە، بە حەواڵە کردنی لە قەڵەمی فەرمانبەران نووسراو رێکخراوە لەگەڵ خشتەی کاغەزەکان بەیەکەوە بۆ عالی نێردراوە، بە پشت بەستن بە یاسای بریارنامەی تایبەتی پێویستە جێبەجێ بکرێت.




DH.MKT.01568.00044.002

| DH.MKT. | 01568.00044 | 22 رەبیعی یەکەم 1306 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٩٣
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم

لە ناو سانجەقی سلێمانی، ئەمین ئاغا بەرێوەبەری ناحیەی سوریجك لە لایەنی بەرێوەبردنی کارگێرییەوە کەموکوری هەبووە، بۆیە دوورخراوەتەوە و لە شوێن ئەویش مستەفا بەگ دادەمەزرێت، ئەگەرچی لە والا بە نووسراو ئاماژەی پێکراوە، بەڵام ناوبراو لە تاقمی هەڵبژێردراوەکان نییە، بۆیە پەسەند کردنی ئەرکەکەی بە گوێرەی نیزام سەرپێچیە، دەبێ بۆ بەرێوەبەرایەتی ناوهاتوو بەرێوەبەری مولازم خاوەن هەڵبژاردننامە هەروەها موعەلیمی مەکتەب عوسمانی ساڵح مەزهەر ئەفەندی دامەزرێت و بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکەشی بە بریاری قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران جێگیر کراوە، جگە لەمە بۆ ئەم کارە لەگەڵ مێژووی دەست بە کار بوونی مانگانە ٥٤٠ قوروش مووچەی پێ دەدرێت و تۆمار کرا، لەوێ لەگەڵ جێبەجێ کردنی مێژووی دەست بەکار بوونەکەی رادەگەیەندرێت و هەروەها ئەو مووچەی مانگانە وەریدەگرێت، نیوەی بە بریارنامە بۆ سندوقی خانەنشینی دەروات، ناوبراو خەرجی رێگای هەیە، کە دەکاتە ١٨٦٠ قوروش بە شێوەیەکی بنەرەتی لە پارەوپولی خۆچێی دابین دەکرێت و لە خشتەی خەرجی تۆمار دەکرێت، سەبارەت بە مێژووی دەست لە کار کێشانەوەی ئەمین ئاغا بە نووسراو والا ئاگادار کراوەتەوە، بە ووتەی نەزارەتی ژمێریاری هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی، فەرمان بۆ ئەفەندیمە، لە ٢٢ رەبیعی یەکەم ١٣٠٦ و لە ١٤ تشرینی دووەم ٣٠٤.
مۆری سەید ئەحمەد مونیر نازری کاروباری ناوەخۆ


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1592 43

DH.MKT.01592.00043.001

| DH.MKT. | 01592.00043 | 6 جەمادی کۆتایی 1306 |
|---|---|---|

٦ جەمادی کۆتایی ٣٠٦
٢٦ کانوونی دووەم ٣٠٤
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
ئەم ساڵە لە دوو شوێنی سانجەقی سلێمانی چوار تابوری سەربازی نیزامیە جێگیر کراوە، داهاتەکەشی تا مانگی مارت دابین دەکرێت، بەڵام لەو لێکۆڵینەوەیەی کە لە دامەزراوەی قۆمیسیۆن ئەنجام دراوە، دەرکەوتووە یەك ئاقچە نەماوە، ئەگەرچی لە سندوقی دارایی مەرکەزی ویلایەت لەگەڵ دارایی شارەزوور ٣٠٠٠٠٠ قوروش دابینکراوە، بەڵام تا ئێستا یەك ئاقچە نەهاتووە، هەروەها لە بارەی دابین کردنی مووچەیەکی سەربازی شاهانە، لەسەر ئەو برەیەی کە لە فەرمانی پاشا دیاری کراوە، ئەو مووچەیەی کە دەدرێتە سەربازی نیزامیە دەنێردرێت و بۆ ساڵی ٣٠٥ ی داهاتوو داهاتی لیوایەکانی موسڵ و شارەزوور و سلێمانی دەکرێتە یەك و بۆ هەر لیوایەك بە گوێرەی خەرجیەکەی برێکی بۆ ڕێك دەخرێت، لەم بابەتەدا لەسەر هەندێك ووتە لەلایەن ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی سلێمانی تەلەگرافنامە دەرچووە و وێنەیەکی نێردراوە، بە گوێرەی گرنگی و بایەخی بابەتەکە جێبەجێ بکرێت و هیممەت بکرێت لە ڕاگەیاندنی، ئەمەش بە ڕاگەیاندنی پەیوەندیدارانی نەزارەت دەبێت.



ŞD.02587.00020.001

<table>
<tr><td>ŞD.</td><td>02587.00020</td><td>26 جەمادی یەکەم 1306</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ فەرمانگەی دادگانی جەلیلە<br>لە دژی مەلیك ئەفەندی ژمێریاری پێشووی سانجەقی سلێمانی داوای بوختان بەرز کراوەتەوە، بە فەرمانی پاشا لە شورای دەوڵەت دادگاییەکەی جێبەجێ دەکرێت، لەسەر ئەو نووسراوەی کە عەلی رزا ئەفەندی سەرۆکی سزای شارەزووری پێ ئاگادارکراوەتەوە، تەلەگرافنامە دەرچووە، ئاماژەی پێکراوە دەست لە کار کێشانەوەی ناوبراو لەسەر مۆڵەتی نەزارەتی دادی جەلیلە وەستاوە، لەسەر راستی ئاماژەکە کارەکە بە گونجاو زانراوە، هەروەها لە بارەی لێپرسینەوەی ناوبراو بانگی دەرسەعادەت دەکرێت، ئەمە بە تەلەگرافنامە مۆڵەتی پێ دراوە، بۆ ئەم مەبەستەش لە نەزارەتی ناوهاتوو ئاماژەی پێکراوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٦ جەمادی یەکەم ٣٠٦ و لە ١٦ کانوونی یەکەم ٣٠٧.<br>مۆری دادگای سەرەتایی شورای دەوڵەت</td></tr>
</table>


İ.DH 1171/91571

İ.DH.01171

| I.DH. | 01171.091571 | 20 ڕەجەب 1307 |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
لەلایەن دانیشتوان و فەرمانبەرانی خۆچێی ۱۰۰۰ لیرە کۆکراوەتەوە، وەکو پارەی کاش پەلە کراوە لە دروست کردنی، ئەم جامیعە شەریفەی کە باپیرم سەید شێخ کاك ئەحمەد ئەفەندی تێدا نێژراوە، بەڵام بەبێ منارە بووە، بۆ زیادکردنی منارەیەکیش لە خەرجی جەنابی پاشای میهرەبان جێبەجێ کراوە، هەروەها بە واژووی محەمەد سەعید بەرزنجی داواکراوە و بە تەلەگرافنامە لە سلێمانی دەرچووە، جامیعی شەریفی ناوهاتوو ناوەکەی بگۆردرێت، بەپەلە منارەی باسکراو لەلایەن خەرجی خەزینەی تایبەتی شاهانە دروست دەکرێت و بۆ جامیعی ناوهاتوو لەگەڵ پارچەیەکی گەورە لە دەستنووسێکی قورئانی شەریفە تابلۆکان نەخشێنراون، بەڵام هێشتا نەرۆیشتووە، لەم بارەیەوە جەنابی ملوکانە بە فەرمانی پاشا چۆنیەتی جێبەجێ کردنی کارەکەی دیاری کردووە، نەزارەتی خەزینەی تایبەتی شاهانەی جەلیلەش ئاگادار کراوەتەوە، هەروەها لە بارەی گۆڕینی ناوی جامیعی شەریفەی ناوهاتوو بۆ حەمیدیە بە ناوی زاتی جەنابی فەرمانڕەوای جیهان پێویستی بە یارمەتی جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بفەرمووێت، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ۲۰ ڕەجەب ۳۰۷ و لە ۲۸ شوبات ۳۰۵.
سورەیا جەنابی سەرکاتبی شەهریار


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1656 114

DH.MKT.01656.00114.001

| 18 موحەررەم 1307 | 01656.00114 | **DH.MKT.** |
|---|---|---|

١٨ موحەررەم ١٣٠٧
٢ ئەیلوول ١٣٠٥
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
سـەرەتا محەمـەد بەهجەتددیـن ئەفەنـدی لـە رووسـیاوە هیجرەتـی کـردووە و هاتۆتـە لایەنـی سـەڵتەنەتی پاشـا، لە چاوشی شارەوانی سانجەقی سلێمانی کاری کردووە، هەروەها ئەو ماوەیە بژێوی کەوتۆتە تەنگوچەڵەمەوە، بۆیە داوای کـردووە لـە ئەرکێکـی گونجـاو دابنرێت و بە هەندێك ووتـەوە ناوبراو داواکاری پێشـکەش کردووە، بۆ والآ نێـردراوە، بە گوێـرەی بابەتەکـە هیـچ گرفتێك لە بەکارهێنانـی ناوبراو نییە، بۆیە کارێکـی گونجاوی پێ بدرێـت و بەختەوەر بکرێت.




DH.MKT.01659.00038.001

<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>01659.00038</td><td>23 موحەررەم 1307</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٣ موحەررەم ٣٠٧<br>٧ ئەیلوول ٣٠٥<br>بۆ لایەنی واڵای سەر عەسکەریمان<br>لە ناحیەی سورتاشی سەر بە سانجەقی سلێمانی بە شێوەی تیروپشك ئەندامی رەدیفە هەڵبژێردراون، لەگەڵ ئەمانە، لەگەڵ ئەو ئەندامانەی رەدیف کە پێویستە بە زۆری بەکار بهێنرێن، دوای کۆکردنەوە و دەستگیرکردنیان رادەستی تابوری سەربازی شاهانە بکرێن، ئەگەرچی ئەمە لەلایەن ئەفسەرانی رەدیف داواکراوە، بەڵام زۆربەی دانیشتوانی ناحیەی ناوهاتوو تووشی برسێتی و ووشکەساڵی و چەندین شتی تر بوونەتەوە، لەم شوێنە لە رێژەی سەدا ٦٠ نزیکەی ١٥٠ ئەندامی رەدیف بوونی هەیە، بە یەك هەنگاو داواکردنی ئەم رێژەیە جێگای زوڵمە، بۆیە بە شێوەیەکی کاتی هاکاری بکرێن و دواتر داوای هەر چەندی بکەن، بە شێوەی زۆرەملێ هەنگاو بە هەنگاو دەست بەسەر دەکرێن و دەدرێنە تابورەکان، حاڵی حازر لە ناحیەی ناوهاتوو تەنیا پاشکۆی تیروپشك وەربگیرێت، بۆ ئەمەش لە ویلایەتی موسڵ ئەو نووسراوانەی کە نێردراوە، هاوپێچ پێشکەش کراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارەش پێویستی بە هاوکاری سیپاهیدارە.</td></tr>
</table>



DH.MKT.01688.00014.001

| 16 جەمادی کۆتایی 1307 | 01688.00014 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٦ جەمادی کۆتایی ٣٠٧
٢٧ کانوونی یەکەم ٣٠٥
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
پێشـووتر هەندێـك ووتارخوێنـی ئایینـی نێردراوەتـە ویلایەتـەکان، وەکـو ئەمانە موسـڵیش پێویسـتی بـە ووتارخوێنی دینییـە، هەروەهـا لـە زانـاکان شـێخ رەسـول ئەفەنـدی خـودی خـۆی بـە ووتارخوێـن و ئامۆژگاریکردنەوە سـەرقاڵە، یا ئەوەتـا مووچـەی ١٥٠٠ قوروشـی بـۆ ببرێتـەوە و بە شـێوەی گـەرۆك لـە ویلایەتەکانی بەهیـە دابمەزرێت، یاخود برە پـارەی ناوهاتـوو بـۆ سـێ بـەش دابـەش ببێـت، یەکێـك بـۆ موسـڵ و دوو کەسـی تریـش بـۆ سـانجەقەکانی کەرکووك و سـلێمانی دابمەزرێـت، بـە شـێوەیەك کـە رەسـول ئەفەنـدی بنێردرێتـە سـلێمانی، هەروەهـا دوو کەسـی ئایینـی هەڵبژێردرێـن و لـە موسـڵ و کەرکـووك دابمەزرێـن، پێشـەکی ئـەو نووسراوانـەی لـە ویلایەتـی بەهیـە نێـردراوە، لـەم بابەتـەدا خوێندنـەوەی عالـی بـۆ دەکرێـت و ئاماژەی پـێ دەکرێـت، بـە تێروانیـن لـە وێنـەی ئامـاژە پێکردنەکـە بـە گوێـرەی ئـەو خوێندنـەوەی واڵا بـۆی دەکات، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی ئامـاژە پێکردنەکـە.



DH.MKT.01731.00023.001

| 23 شەوال 1307 | 01731.00023 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٣ شەوال ١٣٠٧
٢٩ مایس ١٣٠٦
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
شێخ مەعروف وەکیلی بەڕێوەبەری ناحیەی قەرەداغ سەر بە سانجەقی سلێمانی، لەبەر جموجۆڵی نەگونجاو و کارە نەشیاوەکان، هەروەها لەبەر ئەوەی ڕۆژانە مامەڵەی سەرپێچی کارانە ئەنجام دەدات، سکاڵای لەسەر تۆمار کراوە، بۆ ئەم مەبەستەش لەلایەن دانیشتوانی چەند گوندێکی سەر بەم ناحیەیە، کاغەز هاتووە و تێدا روون کراوەتەوە، بە تێروانین لە نووسراوەکان لێکۆڵینەوە ئەنجام بدرێت و دروستی بابەتەکە رابگەیەندرێت، هیممەت بکرێت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1748 11

DH.MKT.01748.00011.001

| 18 جەمادی کۆتایی 1307 | 01748.00011 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٨ جەمادی کۆتایی ١٣٠٧
٢٣ تەمموز ١٣٠٦
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
لە ناو سانجەقی سلێمانی، لەسەر دەست بە کار بوونی ئەمین ئاغا بەڕێوەبەری ناحیەی سەنگاو و تۆفیق ئاغا بەڕێوەبەری سەرچناری ڕۆژهەڵات لەگەڵ عەبدولفەتاح بەگ بەڕێوەبەری ناحیەی سەرچناری ڕۆژئاوا، نووسراو لە مێژووی ١٤ نیسان ١٣٠٦ هاتووە حەواڵەی نەزارەتی ژمێریاری کراوە، بۆ هەندێك بابەتی ئەم ناحیانەی کە ناویان هاتووە، نووسراو لە مێژووی ٢١ شەعبان ١٣٠٣ و ٢٩ موحەررەم ١٣٠٦ نووسراوەتەوە، کە هێشتا وەڵامیان نەهاتووە، هەرچی ڕێکخستنی تۆمارەکانیانە، لەسەر وەڵامی ئەو نووسراوانەی لەسەر ئەو بەڵگە وەستاوە کە دێت، چۆنیەتی کارەکە دووپاتکراوەتەوە، بەپەلە وەڵامی نووسراوە باسکراوەکان بنێردرێت.


İ.DH 1195/93507

İ.DH.01195

| I.DH. | 01195.093507 | 21 سەفەر 1308 |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
لە ناو سانجەقی سلێمانی دانیشتووی گوندی وەرانە سەر بە قەزای شەهربازار بووە، پێنج ساڵ پێش ئێستا لەسەر تاوانێك زیندانی کراوە، پێش دوو ساڵ و نیو کاغەزەکانی بە هەڵە نێردراوەتە دەرسەعادەت، هەروەها بۆ ناردنەوەی کاغەزی باسکراو، پەیوەندی کراوە، بەڵام هیچ سوودێکی نەبووە، بە خۆی لە زیندانە و ماڵ و منداڵەکەشی بە برسێتی ماونەتەوە، بە ناردنەوەی کاغەزەکانی ئەو تەنگانەیی و پەرێشانیە کۆتایی پێ دێت، محەمەد حەسەن خەڵکی گوندی وەرانە داوانامەی بە واژووی بۆ عالی ناردووە و سوێندی خواردووە و تکای کردووە، بۆ خاتری خوا بەدواداچوون بۆ کاری ئەم پیاوە بکرێت، بۆیە بە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت کێ بە رەوایی رەفتار نەکات بە توندی بەرپرس دەبێت، بە فەرمانی پاشا پەلە کراوە لەسەر زانیاری تری بخرێتە سەر، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢١ سەفەر ٣٠٨ و لە ٢٤ ئەیلوول ٣٠٦.
جەنابی سورەیا سەر کاتیبی شەهریار



| 12 رەمەزان 1308 | 01224.095855 | I.DH. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
.... دیوانی هومایۆن
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
عوسمان عەزمی ئەفەندی یاریدەدەری گشتی سانجەقی سلێمانی پێچەوانەی یاسا جولاوەتەوە، بۆیە لە مەرکەزی لیوا، دەستەی تاوانباران دامەزراوە، لەسەر ئەو گومانانەی کە لەسەری بووە، بێ بەری دەرچووە، بەڵام دراوەتە دادگا تا دادگایی بکرێت، لەوێش سزای پارەی دراوەتێ، دوور دەخرێتەوە و لە شوێن ئەو خالد بەگ دەرچووی مەکتەبی یاسای شاهانە و کاتیبی دادگای پێداچوونەوە هەڵبژێردراوە، بۆیە بریارنامە لە ئەنجوومەنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران رێکخراوە تا لەگەڵ کاغەزی وەرگێردراوی زانیاری کەسێتی بەیەکەوە بنێردرێت، ئینجا نووسراوی نەزارەتی دادی جەلیلە رادەگەیەندرێت و پێشکەش دەکرێت، لەم بابەتەدا جەنابی ملوکانە لە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو نووسرایەوە و ژمارەی لەسەر تۆمار کرا ئەفەندم، لە ١٢ رەمەزان ٣٠٨ و لە ٩ نیسان ٣٠٧.
سەدری ئەعزەم


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1754 | 49

DH.MKT.01754.00049.001

| DH.MKT. | 01754.00049 | 7 موحەررەم 1308 |
|---|---|---|

7 موحەررەم 308
11 ئۆغستۆس 306
بۆ نەزارەتی دەرەوەی جەلیلە
لەسەر ئاماژەی عالی و زانیاری بەندە، پێشوەختە لە وەڵامی نووسراوی بە زانیاری هاتووە؛ ئەو تەلەگرافنامەیەی کە لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە، ئەو عوسمان بەگە نییە کە لە دەرسەعادەتە، بەڵکو برادەرەکەیەتی بە ناوی مەحمود پاشا، عوسمان بەگ قائیمقامی قەزای گولعەنبەر و سەرۆکی هۆزە، سەرکەشەکانی جاف چ لە لایەنی ئێران و چ لەلایەنی ئێمە بە ئەنجامدانی خراپەکاری ناوبانگیان دەرکردووە، لەم چەتانە بە ناوی میکە و 12 کەس لە هاوەڵانی دەستگیر کردووە و رادەستی حکوومەتی سلێمانی کردووە، هەروەها ناوبراو ئارەزووی ئەوەیە ئەمنیەتی سنوور بپارێزێت، فەرمانبەرانی ئێران و دانیشتوانەکەشی کاریگەریان هەبووە و نیشان دراوە کە نزایان کردووە.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1774 65

DH.MKT.01774.00065.001

| DH.MKT. | 01774.00065 | 9 ڕەبیعی یەکەم 1308 |
|---|---|---|

٩ ڕەبیعی یەکەم ٣٠٨
١١ تشرینی یەکەم ٣٠٦
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
لەسەر ئەو هەواڵەی کە لە نەزارەتی تەندروستی جەلیلە دەرچووە، بە نووسراو بۆ عالی نێردراوە، بە خوێندنەوەی ئاشکرایە، لە ناوچەی پێنچوین سەر بە سانجەقی سلێمانی شوێنی هێڵی پاراستن لە مێژووی جیاوازدا کاری پێکراوە، ئەم شوێنە دراوەتە ٥ گاردیان و لە ویلایەتی موسڵ پرس کراوە، لەگەڵ شوێنگرەوەی کرێ بە کۆکراوەیی ٨٧٣ قوروش خەرج کراوە، ئەم برەش لە خەزینەی جەلیلە ڕێکخراوە و بە پێویست زانراوە خەرج بکرێت، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




DH.MKT.01794.00086.001

| DH.MKT. | 01794.00086 | 11 جەمادی یەکەم 1308 |
|---|---|---|
| ١١ جەمادی یەکەم ١٣٠٨<br>١١ کانوونی یەکەم ١٣٠٦<br>نووسراو بۆ ژمێریاری<br>ئـەم سـاڵە سـاڵح سـالم ئەفەنـدی لە مەکتەبـی مولکیـەی شـاهانە دەرچووە، لـەم کاتەشـدا لـە بەڕێوەبەرایەتـی تۆماری سـانجەقی سـلێمانی جێگیر کراوە، پێویسـتە مامەڵەکـەی جێبەجێ بکرێت، بۆ ئـەم کارە نووسراوەکـە دراوەتە ژمێریاری. | | |




DH.MKT.01795.00036.001

| DH.MKT. | 01795.00036 | 13 جەمادی یەکەم 1308 |
|---|---|---|

١٣ جەمادی یەکەم ١٣٠٨
١٣ کانوونی یەکەم ١٣٠٦
جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
سالح ئەفەندی باش کاتیبی کاغەزەکانی سانجەقی سلێمانی، لەبەر دێرینی و خزمەتە باشەکانی، ڕێزی لێگراوە و پلەی سێیەمی پێ بەخشراوە، ئەو نووسراوانەی لە ویلایەتی موسڵەوە هاتووە، هاوپێچ پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی بە هاوکاری پەیوەندیدارانی سەدارەتی جەلیلەوە دەکرێت، ئەمر و فەرمان.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1796 72

DH.MKT.01796.00072.001

| DH.MKT. | 01796.00072 | 18 جەمادی یەکەم 1308 |
|---|---|---|
| ١٨ جەمادی یەکەم ١٣٠٨<br>١٨ کانوونی یەکەم ١٣٠٦<br>بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>سالح سالم ئەفەندی لە بەرێوەبەرایەتی تۆماری سانجەقی سلێمانی دامەزراوە، خەرج کردن و دابین کردنی خەرجی ڕێگای پێویستە، بۆ ئەم مەبەستە لە داهاتی ساڵی ٣٠٦ ی ناوەخۆ ٢٢٣٢ قوروش هەژمار کراوە، بۆ ئەوەی بەپەلە بنێردرێت، لە ژمێریاری گفتوگۆی لەسەر کراوە، کە بۆ عالی نووسراو بکرێت، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1818 104

DH.MKT.01818.00104.001

| 5 شەعبان 1308 | 01818.00104 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٥ شەعبان ١٣٠٨
٤ مارت ١٣٠٧
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
بەهجەت ئەفەندی کە لە بەڕێوەبەرایەتی تۆماری سانجەقی سلێمانی دوورخراوەتەوە، بۆیە لە بارودۆخێکی زۆر خراپ دایە و خۆشی لە کەسایەتە لێهاتووەکانە و شایەنی ڕێز گرتنە، بۆیە لەوێ لەسەر ئەرکێك دابنرێت، لە بارەی دڵخۆش کردنی هیممەت بکرێت.



DH.MKT.01845.00125.001

| 23 زیلقەعدە 1308 | 01845.00125 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٣ زیلقەعدە ٣٠٨
١٨ حوزەیران ٣٠٧
بۆ نەزارەتی پۆلیسی پاراستنی عالی
لەبەر بارودۆخی ناوچەکە بە پێویست زانراوە رەزامەندی بدرێت تاوەکو لە دانیشتوانی ناوەخۆ ٣ پۆلیس دابمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی ئاماژەی پێکراوە، نووسراو لە پایەی موسڵ نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.


Y.PRK.UM.00024.00067.001

| 7 شەوال 1309 | 00024.00067 | Y.PRK.UM. |
|---|---|---|

١٤٧
لە مابەینی هومایۆن بۆ جەنابی شاهنشاهی باش کیتابەتی جەلیلە
بۆ جەنابی ئەفەندم
حەسەن زوهدی ئەفەندی لە دانیشتوانی سانجەقی سلێمانی و هۆزی هەورامی لە ئەدرنە نیشتەجێ بووە، لەبەر ئەوەی سابونی مسکی دروست کردووە، جەنابی شاهنشاهی هومایۆن میهرەبانی نیشان داوە و مەدالیای شانازی لەگەڵ پاکانەی عالی پێداوە، میهرەبانی و سۆزی جەنابی والی جێگەی جۆش و خرۆشە، بە راگەیاندنی بە پەلە سوپاسگوزاری کردووە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٧ شەوال ١٣٠٩ و لە ٢٢ نیسان ١٣٠٨
والی ئەدرنە
مۆری سەید ئەحمەد عزەت کوڕی عوسمان



| 2 زيلحيجه 1309 | 000027.001966 | BEO. |
|---|---|---|

٢ زیلحیجه ١٣٠٩
١٥ حوزەیران ١٣٠٩
بۆ جەنابی لایەنی عالی لە پەیوەندیدارانی فەتوا
لـە سـەیدەکانی بەرزنجـی و مودەریسـی سـانجەقی سـلێمانی و زاناکانـە، لـە بڵاوکردنـەوە و وانەبێـژی بەردەوامـە، بـەڵام پارەکـەی بەشـی نـاکات، بۆیـە لـە رووی بژێویـەوە کەتۆتـە تەنگانـەوە، هەروەهـا لـەم ناوچەیـە لەبـەر مەرجـی وەرگرتنـی ئـەرك و کێشـەی دیارنەبوونـی زانـاکان، داوای کـردووە هەروەکـو پێشـوو لـە مەملەکەتـی خۆیـدا لـە وانەبێـژی بـەردەوام بێـت، جگـە لەمـە برێـك مووچـە و ئەرکێکـی بدرێتـێ، بـە مـۆری سـەید محەمـەد داواکاری پێشـکەش کـراوە، نـووسراو بـۆ پەیوەندیـدارای فەتـوا کـراوە و بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە جێبەجـێ کردنـی لەسـەر رای پەیوەندیدارانـی شـێخایەتی وەسـتاو، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
28 | 2095

| BEO. | 000028.002095 | **4 زیلحیجه 1309** |
|---|---|---|

٤ زیلحیجه ١٣٠٩
١٧ حوزەیران ١٣٠٨
بۆ نەزارەتی دارایی بەهیە
محیەددیــن لــە دانیشــتوانی ســانجەقی ســلێمانی و ســەیدەکانی بەرزنجییــە، لەبــەر ئــەوەی ژمــارەی خێزانەکــەی زۆرە، لــە بەخێوکــردن و دابیــن کردنــی بژێــوی ژیانــی ئەندامانــی خێزانەکــەی تووشــی کێشــە و تەنگانەیــی بۆتــەوە، بۆیــە داوای کــردووە بــە چــاوی میهرەبانیــەوە ســەیر بکرێــت، ســاڵێك لەمەوبەریــش هاتۆتــە دەرســەعادەت و داوای کــردووە برێــك مووچــەی بــۆ ببرێتــەوە، ئــەو داواکاریــەی بــە واژووی ناوبــراو پێشــکەش کــراوە و لەگــەڵ هاوپێچەکانــی نێــردراوە، بــە تێروانیــن لــە بابەتەکــە هیممــەت بکرێــت لــە جێبەجــێ کردنــی، نووســراویش کــراوە.

| 12 رەبیعی کۆتایی 1309 | 00068.00027 | MV. |
|---|---|---|

١٢ رەبیعی کۆتایی ٣٠٩
تشرینی دووەم ٣٠٧
کاغەزی بڕیارنامەی تایبەتی لە دانیشتنی ئەنجوومەنی بریکارەکان دەرچووە
پوختەی دارایی
ئـەو کاتـەی مەلیـك ئەفەنـدی لـە ژمێریـاری سـانجەقی سـلێمانی بـووە، لەسـەر هەندێـك سـەرپێچی میـری کـە ئەنجامـی داوە، بۆتـە هـۆی تەنگژەیەکـی تونـد دروسـت بێـت، بۆیـە ناوبـراو لەگـەڵ تەحسـین پاشـا والـی پێشـووی موسـڵ و موختـار بەگـی مەکتوبچـی و ئەوانـەی لەگەڵیـان بوونـە بـە فەرمانـی پاشـا لـە شـورای دەوڵـەت داوایـان لەسـەر بـەرز کراوەتـەوە، هاتنـی داواکـە پێویسـتی بـە کاتـە، لەسـەر ئـەو داواکاریـەی کـە لـە لەلایـەن مەلیـك ئەفەنـدی دراوەتـە شـورای دەوڵـەت و ئـەو داواکاریـەی کـە حەواڵـە کـراوە، داوای مووچـەی دوورخـراوان دەکات، ئـەو بریارنامەیـەی کـە لـە نەزارەتـی ناوەخـۆ دراوەتـە قەڵـەم خوێندنـەوەی بـۆ کـرا.

بریار
بـە گوێـرەی ووتـەکان، دەرکەوتـووە ژمێریـاری سـلێمانی لەسـەر جموجـۆڵ و رەفتارەکانـی خراوەتـە ژێر لێپرسـینەوە و دراوەتـە دادگاش، ئەنجامـی ئـەو مامەڵەیـەی کـە جێبەجـێ کراوە، سـەبارەت بـە لێکۆڵینـەوە و ئاماژەپێکردنەکـە، بریار دراوە دووبـارە حەواڵـەی شـورای دەوڵـەت بکرێتەوە.

T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.ŞFR
153 | 12

DH.ŞFR.00153.00012.001

| DH.ŞFR. | 00153.00012 | **29 سەفەر 1309** |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>هەواڵی بڕوا پێکراو هاتووە؛ کە مەحمود پاشای جاف لە پاشکۆی ویلایەتی موسڵ چۆتە گوندی ئەبا عوبێدە، لە قەزای گولعەنبەری سەر بە سانجەقی سلێمانی، لە ویلایەتی ناوهاتوو نووسراو کراوە کە ناوبراو دەستگیر بکرێت، لە ٢٢ ئەیلوول ١٣٠٧.<br>حەسەن والی بەغداد | | |


İ.DH.01241

| I.DH. | 01241.097201 | 17 موحەرڕەم 1309 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
.... دیوانی هومایۆن
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لەبەر ئەوەی مەحمود شوکری ئەفەندی مودەریسی سانجەقی سلێمانی تووشی تەنگانە و پەرێشانی بۆتەوە، داواکاری پێشکەش کردووە، بە گوێرەی ئەو وەڵامەی لە نووسراوی زانیاریەکان نێردراوە، لە ویلایەتی موسڵیش تەلەگرافنامە وەرگیراوە، تێدا هاتووە ناوبراو جێگەی میهرەباتی جەنابی عالیە، چونکە روون بۆتەوە لە زانایانی خودایە، بۆیە لە دارایی ناوەخۆ، لە مووچەی دەستکورتانی خەزینەی جەلیلە، لە مووچەیەکی بێ خاوەن ۲۰۰ قوروشی بۆ دابین بکرێت، لەم بارەیەوە جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو نووسرایەوە ئەفەندم.
لە ۱۷ موحەرڕەم ۳۰۹و لە ۱۰ ئۆغستۆس ۳۰۷
سەدری ئەعزەم

İ.DH 1250/98057

İ.DH.01250

| I.DH. | 01250.098057 | 19 ڕەبیعی کۆتایی 1309 |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
ژمارە ٢٠٩٨
ڕاگەیەندراوی بەندەیەکی بێ نرخە
لەسەر ئاماژە و ڕاگەیەندراوی سەر عەسکەر هاتووە، جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، ڕاسم بەگ میری ئالآی ٤١ی نیزامیە، لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی دامەزراوە، بەڵام فرقەی ١٢ سەر بە لەشکری شەشەمی هومایۆن، لیوای ٢٣ سلێمانی پلەکەی خاڵیە، لەوێ بە قوماندان دامەزراوە و پلەکەی بۆ میری لیوا بەرز بۆتەوە، بەمەش فەرمانگەی سەربازی جەلیلە ئاگادار کراوەتەوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٩ ڕەبیعی کۆتایی ٣٠٩ و لە ١٠ تشرینی دووەم ٣٠٧.
سورەیا جەنابی شەهریاری سەر کاتیب




DH.MKT.01908.00025.001

| DH.MKT. | 01908.00025 | 5 جەمادی کۆتایی 1309 |
|---|---|---|

٥ جەمادی کۆتایی ٣٠٩
٢٤ کانوونی یەکەم ٣٠٧
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە

پێشوەخت مەعروف ئەفەندی لە ناو سانجەقی سلێمانی بۆ بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی قەرەداغ دامەزراوە، ئاشکرایە بە باشی کارەکانی بەڕێوەبردووە، لە بارەی وەرگرتنی مووچەی تەواو و پەسەندکردنی ئەرکەکەی نووسراوی بەهیە حەواڵەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران کراوە، تێدا دەرکەوتووە کە ناوبراو لە تاقمی هەڵنەبژێردراوەکانە، بە گوێرەی ماددەی ٩١ی نیزامنامە وەرگرتنی بەرپرسیارێتی شوێنەکەی پێ دەدرێت بۆ پەسەندکردنی ئەرکەکەی لە قۆمیسیۆنی ناوهاتوو بە بریارنامە حاڵەتەکەی ئاسایی بینراوە و مووچەکەی بە تەواوەتی پێ دەدرێت، لە مێژووی دەست بە کار بوونی و بە بەبریاری تۆمارکردن مانگانە ٦٠٠ قوروش مووچەی بۆ دابین کراوە، بە جێبەجێ کردنی راگەیاندنی مێژووی ناوهاتوو و پشت بەستن بە کۆڵکەی بریارنامە مانگانە نیوەی مووچەکەی بە دەست بەسەرداگرتن بۆ خانەنشینی دەروات و ئەو مووچە تەواوەی کە باسیش کراوە، لە ١٠٪ی بۆ سندوقی قۆمیسیۆنی دراوی مولکیەی ئاگرکوژێنەوە دەروات، بە ئاماژەی والا لە ژمێریاری گفتوگۆی لەسەر کراوە، بە گوێرەی ئەمە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



| 1309 ڕەجەب 4 | 01918.00091 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٤ ڕەجەب ١٣٠٩
٢٢ کانوونی دووەم ١٣٠٧
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
لـە بـارەی بوونـی گومـان لەسـەر جێگیـر کـردن و پاراسـتنی مولکـی هومایـۆن و دروسـتکردنی کێشـە لـە داهـات، هەروەهـا لـە وەرگرتنـی داهاتـی مولکـی تایبەتـی پاشـا و ڕێگەگرتـن لـە پەرشـوبڵاونەکردنەوەی دانیشـتوان، عەلـی ڕزا پاشا موتەسـەرفی پێشـووی سـانجەقی سـلێمانی لەگـەڵ عوسـمان بـەگ قائیمقامـی قـەزای گولعەنبـەر هـەوڵ و کۆششـیان نەبـووە، ئەگەرچـی پاشـای ناوهاتـوو جیابۆتـەوە، بـەڵام دەسـتی هەبـووە، قائیمقامـی ناوهاتـووش ڕەفتار و جموجۆڵـی گومانلێکـراوی هەبـووە، کـە وایکـردووە سـەرنج ڕابکێشـن، لەسـەر هەندێـك ووتـە لـە قۆمیسـیۆنی مولکی هومایۆنـی موسـڵ بڕیارنامـە نێـردراوە، لـە نەزارەتـی خەزینـەی تایبەتـی شـاهانەی عالیـە بە نـووسراو ئاماژەی پێکـراوە، هەروەهـا بـە تێروانیـن لـە نـووسراوی ناوهاتـوو بۆتـە سـەرنج ڕاکێشـان و هاوپێـچ وێنەیەکـی نێـردراوە، بـە تێروانیـن لـە نـووسراوەکان بەپەلـە چـارەی کارەکـە بکرێـت، لەسـەر ئەنجامەکەشـی زانیـاری بدرێـت، هیممـەت بکرێـت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1920 104

DH.MKT.01920.00104.001

| 10 رەجەب 1309 | 01920.00104 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

١٠ رەجەب ١٣٠٩
٢٨ کانوونی دووەم ٣٠٧
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
لەبەر ئەوەی ئەحمەد تۆفیق بەگ ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی سلێمانی نزیکایەتی ژن و ژنخوازی لەگەڵ مەحمودی جاف هەیە، لە ئەرکەکەی دوورخراوەتەوە، بۆیە لەلایەن ناوبراوەوە داواکاری هاتووە و هاوپێچ بۆ سەروو نێردراوە، بە خوێندنەوەی ئاشکرا دەبێت کە بۆ رۆژێکیش بێت ناوبراو پەیوەندی نزیکایەتی لەگەڵ مەحمودی جاف نییە، جگە لەمەش ئەو خزمەتانەی کە تا ئێستا کردوویەتی زۆر سوودی لێوەرگیراوە، هەروەها دانیشتوانی لیوا لێی رازین، لەلایەکی تر سەبارەت بە بارودۆخ و خوی ناوبراو پرسیار لە جەنابی عەلی رزا پاشا موتەسەرفی پێشووی لیوای ناوهاتوو کراوە، خۆی هاورێی بەندەیە، دەرکەوتووە بۆ رۆژێکیش بێت جموجۆڵی نەبینراوە، ئەگەر لەسەر پەیوەندی نزیکایەتی نێوانی لەگەڵ مەحمودی جاف لە ئەندامیەتی باسکراو لادراوە، ئەوا ئەم بابەتە خوێندنەوەی بۆ بکرێت و دواتریش زانیاری خوێندنەوەی بەهیە رادەگەیەندرێت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1960 | 111

DH.MKT.01960.00111.001

| DH.MKT. | 01960.00111 | **17 زیلقەعدە 1309** |
|---|---|---|

١٧ زیلقەعدە ١٣٠٩

٣١ مایس ١٣٠٨

بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە

لە کاتی خۆیدا شێخ جەواد لە سانجەقی سلێمانی، پاکانەی ئەستۆی تەکیەی عەبدئالانی خستۆتە ژێر دەستی خۆی و بەم بیانویە دەستی بەسەر زەوی داگرتووە، بۆیە بە واژووی عەبدولقادر پۆست نشینی تەکیەی ناوهاتوو تەلەگرافنامە هاتووە و سکاڵای بەرز کردۆتەوە، وێنەی هاوپێچ نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە بە لێکۆڵینەوە راستیەکە دەردەکەوێت، ئاماژەی پێ بکرێت و رابگەیەندرێت.



| DH.MKT. | 00046.00001 | 7 زیلقەعدە 1310 |
|---|---|---|

٧ زیلقەعدە ١٣١٠
١١ مایس ١٣٠٩
بۆ لایەنی والآی جەنابی سەر عەسکەریمان
راسم پاشا میری لیوا لە موتەسەرفیەت و قوماندانیەتی سانجەقی سلێمانی، ئاسایشی هۆزەکانی بەرقەرار کردووە و سنووری پاراستووە، بەمەش کارە باشەکانی بینراوە، بۆیە پلەکەی بەرز بکرێتەوە، بە نیشان و پلەوە پاداشت بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە بە نووسراوی ویلایەتی موسڵ لە مێژووی ١٥ نیسان ١٣٠٩ ژمارە ١٨ کە نێردراوە لە پلەی پێنجەم نیشانی مەجیدی پێ دەدرێت، ئەم نووسراوەش بۆ سوپاسالار نێردراوە، بە هاوکاری سەر عەسکەری عالی جێبەجێ دەکرێت.



| 26 رەجەب 1310 | 000091.006782 | BEO. |
|---|---|---|

٢٦ رەجەب ١٣١٠
٥ تشرینی یەکەم ١٣٠٨
بۆ نەزارەتی دارایی بەهیە
لە سانجەقی سلێمانی، لە ساڵانی کۆنەوە فەرمانبەران و کاتیبەکان پێچەوانەی یاسا لە سندوقی داهات ٤١٥٩١ قوروشیان لە خەرجی ناوەخۆ خەرج کردووە، لەبەر ئەوەی لیواکەی داهاتی کەمە و خەرجی زۆرە، لە خۆچێی راگەیەندراوە مەحاڵە ئەو داهاتە رەوان بکرێت، هەروەها داهاتی باسکراو دەبووایە لە کاتی خۆیدا لە کاتی دەستگرتنەکە لە سندوقی دارایی دەستی بەسەردانەگیرابووایە و لە کۆتا شوێن خەرج نەکرابووایە و لە کات و شوێنی خۆیدا رەوان بکرابووایە، کەچی لە لیوای ناوهاتوو بە پێچەوانەی نیزام ئەوەی پەیوەست بووە بە خەزینەی جەلیلە بە خەرجی خۆچێی خەرج کراوە، بەم شێوەیە چەندین ساڵ بە خراپی بەکارهاتووە و نەنێردراوە، سندوق زیانی پێگەیشتووە، لەگەڵ ئەوەش داهاتی باسکراو لەبەر ئەوەی لە خەرجی ناوەخۆ خەرج کراوە، لە خەزینەی جەلیلە قەرزی هەیە، بۆیە لە خەزینەی ناوهاتوو ئەوەی پێویستە ئەنجام بدرێت، بڕە پارەی باسکراو لە خەزینەی جەلیلە بۆ سندوق بنێردرێت و لە ناوەخۆ ئەو پارەیەی لەلایەن فەرمانبەرانەوە خەرج کراوە، لە پارەی فەرمانبەران دەستی بەسەردا بگیرێت و لە کاتی خۆیدا لە خەزینەی جەلیلە بۆ سندوق بنێردرێت، واتە بە گوێرەی نیزام ئەوانەی هۆکاری ئەم کارەن پارەکەیان لێ وەربگیرێت و رەوان بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە نووسراو لە نەزارەتی سندوقی خانەنشینی مولکیەی جەلیلە لە مێژووی ١٩ رەبیعی یەکەم ١٣١٠ ژمارە ٨٥ هاتووە و بۆ سەروو نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە هیممەت بکرێت لە راگەیاندن و جێبەجێ کردنی.



| BEO. | 000130.009744 | 9 جەمادی کۆتایی 1310 |
|---|---|---|

٩ جەمادی کۆتایی ١٣١٠
١٧ کانوونی یەکەم ١٣٠٨
بۆ لایەنی والآی سەر عەسکەر
بەهۆی گرنگی و ستراتیژیەتی قەزای شەهربازار سەر بە سانجەقی سلێمانی، کە لە سنووری ئێران نزیکە، مەفرەزەی سەربازی لە خاڵێکی ناوەندی مەرکەزی قەزا قایم بکرێت، ئەمەش بۆ بەرژەوەندی هەموو لایەك باشە، بۆ ئەم مەبەستە ئەو مەفرەزە سەربازیەی کە لە شیوەگلە بە مەرجی نیشتەجێ کردنی لە مەرکەزی قەزا، گوند و کەنارەکانی ناوچەکەش بکرێتە مەرکەزی حکوومەت، بۆ ئەمەش بریارنامە لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی موسڵ نێردراوە، هاوپێچ لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە کە لە مێژووی ٤ جەمادی کۆتایی ١٣١٠ ژمارە ١٨١٥ نێردراوە، بۆ ئەم بابەتە ئەو خوێندنەوەی لە سپاهیداری عالی دەکرێت، ئاماژەی پێ دەکرێت.



| BEO. | 000168.012592 | 19 شەعبان 1310 |
|---|---|---|

١٩ شەعبان ١٣١٠
٢٧ شوبات ١٣٠٨
نەزارەتی دادی جەلیلە
لەلایەن هەندێك كەسی مەبەستدار، بابەتی كوشتن بەسەر بەكر ئەفەندی سەرۆكی سزای سانجەقی سلێمانی سەپێنراوە، بە بێ لێكۆڵینەوەش بە سزای ١٥ ساڵ حوكم دراوە، خۆشی هەرگیز لەم كارەدا دروستكەر و دەستی نەبووە، بۆیە بە واژوو و مۆری محەمەد سەعید دانیشتووی سلێمانی داواكاری نێردراوە، تێدا داوا دەكات بێتاوانی ناوبراو بسەلمێنرێت، ئەم داواكاریە بۆ لایەنی دەوڵەت نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەكە هیممەت بكرێت لە جێبەجێ كردنی.



| 2 زیلقەعدە 1310 | 000203.015172 | BEO. |
|---|---|---|

٢ زیلقەعدە ١٣١٠
٦ مایس ١٣٠٩
بۆ نەزارەتی دادی جەلیلە
هـەواڵ هاتـووە کـە ئەبوبەکـر ئەفەنـدی سـەرۆکی سـزای دادگای سـەرەتایی سـانجەقی سـلێمانی هەروەهـا یاریـدەدەری داواکاری گشـتی عەزمـی ئەفەنـدی بەرتیـل وەردەگـرن، بۆیـە بەبـێ لێکۆڵینـەوە و وەرگرتنـی وتەیـان سـێ مانگـە لـە زینـدانـن، بـۆ ئـەوەی کارەکەیـان بخرێتـە بـەردەم دادگا و پەسـەند بکرێـت، هەروەهـا بـۆ ئـەوەی بێتاوانـی ئەوانـە لـە دادگا روون بێتـەوە، عەبدولغفـور بازرگانـی سـلێمانی داواکاری بـە مـۆر و واژووی بـۆ دەوڵـەت ناردووە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە دوای لێکۆڵینـەوە هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.



| 19 زیلقەعدە 1310 | 000214.015976 | BEO. |
|---|---|---|

٢٣ مایس ١٣٠٩
بۆ لایەنی جەنابی پاشای لە پەیوەندیدارانی فەتوا
سانجەقی سلێمانی کە گشتی لەسەر مەزهەبی شافعین، مەلا رەسول ئەفەندی کە لە زاناکانە ئامۆژگاری و ووتاری ئایینی پێویستی داوەتە هۆزەکانی، بۆیە برێکی گونجاو مووچەی بۆ دابین بکرێت، جگە لەمە بۆ ئەوەی وەکو ووتارخوێن دابمەزرێت، لە ویلایەتی موسڵ نووسراو نێردراوە، هاوپێچ لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە لە مێژووی ١٥ زیلقەعدە ١٣١٠ ژمارە ٦٣٢ بەیەکەوە بۆ پەیوەندیدارانی شێخایەتی نێردراوە، بە تێروانین لە وێنەی ئاماژە پێکردنەکە ئەو خوێندنەوەی لەلایەن پەیوەندیدارانی فەتوا بۆی دەکرێت دەخرێتە بواری جێبەجێ کردنەوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.



DH.MKT.00331.00009.001

<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>00331.00009</td><td>14 جەمادی کۆتایی 1310</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی کاروباری دارایی<br>ژمێریاری گشتی<br>ژمارە ٨٥٧<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>جەنابی ئەفەندم<br>لە ویلایەتی موسڵ خشتەی بابەتەکانی هەژماری ساڵی ١٣٠٨ی شوبات نێردراوە، لە سانجەقی سلێمانی ئەو فەرمانبەرانەی کاریان کردووە مووچەی دە یەکیان ماوە بدرێت، بۆیە نووسراوی مێژووی ٥ کانوونی یەکەم ١٣٠٨ ژمارە ١٢٦ پێشکەشی نەزارەتی جەلیلە کراوە، تێدا ئاماژە بە هاتنی ٣٠٠ قوروش دەکرێت، لە مێژووی رادەست کردنی، لەگەڵ ووتەی ژمێریاری گشتی دارایی خوازراوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٤ جەمادی کۆتایی ١٣١٠ و لە ٣٠ تشرینی دووەم ١٣١٠.<br>نازری دارایی</td></tr>
</table>




DH.MKT.02006.00001.001

| DH.MKT. | 02006.00001 | 6 ره‌بیعی یه‌كه‌م 1310 |
|---|---|---|

٦ ره‌بیعی یه‌كه‌م ١٣١٠
١٥ ئه‌یلوول ١٣٠٨
بۆ ویلایه‌تی موسڵی به‌هیه
له ناو سانجه‌قی سلێمانی عه‌بدولفه‌تاح ئاغا به‌ڕێوه‌به‌ری ڕۆژئاوای سه‌رچنار، ئه‌ركه‌كه‌ی بۆ به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی ناحیه‌ی سورتاش بگوازرێته‌وه، بۆ شوێنه‌كه‌ی ئه‌ویش فه‌تحوڵلا به‌گ دابمه‌زرێت، بۆ ئه‌م مه‌به‌سته له پله‌ی ویلایه‌تی به‌هیه نووسراو له مێژووی ١١ ته‌مموز ١٣٠٨ هاتووه و تێدا ئاماژه‌ی پێكراوه، به‌ڵام له ناو ویلایه‌ت بۆ ڕۆژێكیش بێت ڕێكخستنی ناحیه له‌گه‌ڵ دابینكردنی مووچه‌ی به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تیه‌ك به ناوی ڕۆژئاوای سه‌رچنار تۆمار نه‌كراوه و زانیاری نییه، دواتر بۆ جێبه‌جێ كردنی ئه‌م مامه‌ڵه‌یه ئاماژه به مێژووی ڕێكخستنی ناحیه‌ی ناوهاتوو بكرێت و ده‌ست نیشان بكرێت كه كه‌وتۆته چ لایه‌ك، نووسراو بۆ واڵا كراوه، له ژمێریاریش گفتوگۆی له‌سه‌ر كراوه، له ڕاگه‌یاندن و چۆنیه‌تی جێبه‌جێ كردنی هیممه‌ت بكرێت.




DH.MKT.02007.00003.001

| DH.MKT. | 02007.00003 | 11 رەبیعی کۆتایی 1310 |
| --- | --- | --- |

١١ رەبیعی یەکەم ٣١٠
٢٠ ئەیلوول ٣٠٨
بۆ ویلاتی موسڵی بەهیە
لە ناو سانجەقی سلێمانی سەلیم ئاغا بەرێوەبەری ناحیەی پشدەر لە ئەرکەکەی لێبووردراوە، لە شوێن ئەو عەلی ئاغا دامەزرێت، ئەگەرچی لە نووسراوی ویلایەتی بەهیە لە مێژووی ٥ تەمموز ٣٠٨ نێردراوە، تێیدا ئاماژەی پێکراوە، بەڵام لە هەڵبژێردراوەکان نییە، بۆیە پەسەند کردنی ئەرکەکەی پێچەوانەی یاسایە، بەڵام لەو بریارنامەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران کە نێردراوە، سلێمان ئەفەندی دامەزراندنەکەی پەسەند کراوە، چونکە ناوبراو لە بەرێوەبەرە هەڵبژێردراوەکانە، هەروەها بۆ بەرێوەبەرایەتی باسکراو مانگانە مووچەی ٥٠٠ قوروشی دابین کراوە، ناوبراو لە مێژووی دەستبەکاربوونی لە ئەرکەکەی ئەو برە مووچەی پێ دەدەرێت، تۆماریشی رێکخراوە، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە بە پشت بەستن بە راگەیاندنی مێژووی دیاریکراو و بریارنامەی فەرمانرەوا، ئەو مووچەی مانگانە وەریدەگرێت، نیوەی، جگە لەمە هەموو مانگ لە سەدا پێنجی هەروەها لە سەدا یەکی بۆ خانەنشینیەکەی دەگێردرێتەوە، لە مووچە تەواوەکەشی لە سەدا دەی دەست بەسەر دەکرێت بۆ سندوقی قۆمیسۆنی مولکیەی هاوکاری، لەبەر ئەوەی سەلیم ئاغاش لە هەڵنەبژێردراوەکانە، بۆیە باشترە لە بریکاری داد دامەزرێت بەڵام جگە لە نیوە مووچە، هیچ شتێکی تری پێ نەدرێت، لە ژمێریاری گفتوگۆی لەسەر ئەم بابەتە کراوە و بۆ سەروو نووسراو نێردراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




| 7 ڕەبیعی کۆتایی 1310 | 02045.00015 | DH.MKT. |
|---|---|---|
| ٧ ڕەبیعی کۆتایی ١٣١٠<br>١٤ کانوونی دووەم ١٣٠٨<br>بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە<br>وەکو پاداشتی حەرەمەین (دیاری پاشا بووە، کە لە پارە و کەلوپەل پێك هاتبوو، بۆ مەککە دەنێردرا) لە مێژووی ١٤ تشرینی دووەم ١٣٠٨ نووسراوی بەهیە نێردراوە، ٣٥ قوروش و نیو لە ژمێریاری ڕێکخراوە، سەنەدەکەشی بە هاوپێچ نێردراوە، لە سانجەقی پاداشتی حەرەمەینی ساڵەکانی ٣٠٤ و ٣٠٥ و ٣٠٦ درەنگ نێردراوە، بۆ ئەم مەبەستە هۆکاری درەنگ ناردنەکە و بری پارەی باسکراو لەگەڵ ناوی ئەو کەسانەی کە داهاتەکەیان ناردووە بە پەلە ناوەکانیان بنووسرێتەوە و بە پۆستە بنێردرێت. | | |



| 2 شەعبان 1310 | 02053.00095 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢ شەعبان ١٣١٠
٨ شوبات ١٣٠٨
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
بەهــۆی ئــەم خزمەتــە باشــانەی کــە ســاڵح ســالم ئەفەنــدی بەڕێوەبــەری تۆمــاری ســانجەقی ســلێمانی ئەنجامــی داوە، بــە پلەیەکــی گونجــاو ڕێــزی لــێ بگیرێــت، لــە نــووسراوی بەهیــە لــە مێــژووی ٢٦ کانوونــی یەکــەم ١٣٠٨ هاتــووە و ئامــاژەی پێکــراوە، بــەڵام هێشــتا کاغــەزی وەرگێــردراوی زانیــاری کەســێتی ناوبــراو نەهاتــووە، بۆیــە لــە ڕووی ڕێساویاســاوە ڕێزگرتنەکــەی بــۆ ئەنجــام نادرێــت.


MİLLİ ARŞİV
FETVA EMİNLİĞİ (FE)
6 | 46 | 61 | 1

| 29 رەبیعی کۆتایی 1311 | 06.46.61 | KB.MAA.FE. |
|---|---|---|

بابی فەتوا
فەرمانگەی شێخایەتی ئیسلام
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ١٠٤
بۆ نائیبی شەرعی دوورگەی قوبرس
ئەفەندم
لەسەر سکاڵای فەرمانبەران و خەڵکی گشتی و کەسانی خانەدان، بە فەرمانی پاشا کە لەلایەن جەنابی پاشاوە دەرچووە، داوای مەلیك ئەفەندی ژمێریاری پێشووی سانجەقی لەگەڵ جەنابی تەحسین پاشا والی پێشووی موسڵ، لە فەرمانگەی دادگاکانی شورای دەوڵەت سەیر کراوە و ووردبینی بۆ کراوە، بەم زووانەش بریارەکە رادەگەیەندرێت، بە نووسراو وێنەیەکی لە سەرۆکایەتی وەکالەتی جەلیلەی شورای ناوهاتوو نێردراوە، بە ووتەی ئەنجوومەنی هەڵبژاردنی دادوەرەکان هاوپێچ نێردراوە، وێنەی باسکراو وەردەگیرێت و زانیاری و هەواڵەکە واژوو دەکرێت و مۆری لێ دەدرێت و رەوان دەکرێت، بۆ ئەم مەبەستە نووسراوی نووسراوە ژمارەی لەسەر تۆمارکرا، لە ٢٩ رەبیعی کۆتایی ١٣١١ و لە ٢٧ تشرینی یەکەم ١٣٠٩.
مۆری شێخولئیسلام محەمەد جەمالەددین


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

موصل ولايتنه

Y.PRK.MYD.00014.00019.001

| Y.PRK.MYD. | 00014.00019 | 23 جەمادی یەکەم 1311 |
| --- | --- | --- |

بۆ ویلایەتی موسڵ

لە گوندی پشدەری سەر بە سانجەقی سلێمانی، لە ناحیەکانی پالاوی و مەرگە و سورتاش، زەوییەکانی شیلەخان و پاوەمەیدان خراوەتە زیادکردنەوە، ئەم هەواڵەش دراوە، کۆتا شوێنگرەوەی زیادکردنەکە قەڵەم بە قەڵەم ئاماژەی پێکراوە.

٢٠ تشرینی دووەم ١٣٠٩



| 24 زيلحيجه 1311 | 00054.00042 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٤ زیلحیجه ٣١١
١٦ جوزەیران ٣١٠
بۆ جەنابی لایەنی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
لەبەر ئەوەی هۆز و نەتەوەكانی سانجەقی سلێمانی نەزانن، كاروكردەوەی ناهەموار ئەنجام دەدەن، بۆیە لە زاناكان مەلا رەسول ئەفەندی سەرقاڵی ئامۆژگاری كردن و ووتارخوێندنەوەیە، بۆ ئەم مەبەستە مووچەیەكی دیاریكراوی بۆ ببرێتەوە و بە ووتارخوێن لە لیوای ناوهاتوو دابمەزرێت، پێشەكی لە ویلایەتی موسڵ نووسراو هاتووە، لەگەڵ هاوپێچەكانی لە مێژووی ١٩ مایس ٣٠٩ پێشكەش كراوە، بۆ دڵنیابوونەوە لە جێبەجێ كردنی، ئەمجارە لە ویلایەتی ناوهاتووەوە نوسراو لە مێژووی ١٤ مایس ٣١٠ هاتووە، لەگەڵ هاوپێچەكانی بەیەكەوە پێشكەش كراوە، بە تێروانین لە نووسراوەكان و راگەیاندن و ئاماژەی پێشوو، جێبەجێ كردنی دەگەڕێتەوە بۆ هاوكاری جەنابی پەیوەندیدارانی وەكالەت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

İ.TAL.00056.00004.002

| 22 زیلحیجه 1311 | 00056.00004 | I.TAL. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
.... دیوانی هومایۆن
٢٩٤١
جەنابی ئەفەندم
ئەمجارە جەنابی جەمیل ئەفەندی باش کاتیبی ووردبینی شەرعی، پایەی ئیستەنبۆڵی پێدراوە، بەڵام گۆردراوە پایەی حەرەمەین و دووەمی پێدراوە، هەروەها سەر لە نوێ ئەبوبەکر ئەفەندی سەرۆکی دادگای سزای سانجەقی سلێمانی لە پلەی سێیەم نیشانی مەجیدی نیشانی پێ دەدرێت، بۆ ئەم مەبەستە نووسراوی عالی پەیوەندیدارانی شێخایەتی راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیدارانی خەلافەت لە فەرمانی پاشا چ بفەرموێت ئەو جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراوی بەپەلە کراوە.
لە ٢٢ زیلحیجە ١٣١١ لە ١٤ حوزەیران ١٣١٠
سەدری ئەعزەم و هاوکارەکەی


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

Y.MTV 83/1

Y.MTV.00083.00001.001

| 2 ڕەبیعی یەکەم 1311 | 00083.00001 | Y.MTV. |
|---|---|---|

پایەی سەر عەسکەر
قەڵەمی تۆمارکردن
تایبەتی
لە سلێمانی مەکتەبی ڕوشدییەی سەربازی دەکرێتەوە، کە ڕێکەوتە لەگەڵ بۆنەی ڕۆژی هاتنە سەر تەختی جەنابی خەلافەتپەناهیمان، بەم بۆنەیەوە لە موتەسەرفیەتی سلێمانی بە تەلەگراف ڕاگەیەندراوە و بە نووسراو لە نەزارەتی مەکتەبەکانی سەربازی شاهانەی جەلیلە ئاماژەی پێکراوە، لەسەر فەرمانی عالی بەپەلە زانیاریەکان ڕاگەیەندراوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢ ڕەبیعی یەکەم ١٣١١ و لە ٣١ ئۆغستۆس ١٣٠٩.
ڕزا سەر عەسکەر



| 28 رەبیعی یەکەم 1311 | 00087.00007 | HH.I. |
|---|---|---|

خەزینەی تایبەتی شاهانە
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٤٥٩
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لە ناو ویلایەتی موسڵ، گشت زەوی و زاری سەگردکانی سەر بە سانجەقی سلێمانی بێ خاوەنە و خراوەتە زیادکردنەوە، هەروەها ئەم زەوی و زارانە بە مولکی همایۆن هەژمار کراوە، بۆیە لە جیاتی ئەوەی بخرێتە زیادکردنەوە بە ٦٠٠٠ قوروش فرۆشراوە و بەم شێوەیە ئەو زەوییانەش خراوەتە سەر مولکەکانی پاشا کە لە دەوروبەری زەوییەکە هەیە، بەم گفتوگۆیەی کە لەگەڵ قۆمیسیۆنی ئەملاکی همایۆنی موسڵ کراوە، دەرکەوتووە بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە ئەمر و فەرمان همایۆن هەر چییەك بفەرموێت دەست بە کار دەکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢٨ رەبیعی یەکەم ٣١١ و لە ٢٧ ئەیلوول ٣٠٩
نازری خەزینەی تایبەتی



T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

DH.MKT.00148.00024.002

<table>
<tr><th>DH.MKT.</th><th>00148.00024</th><th>23 رەبیعی یەکەم 1311</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز<br>قەڵەمی تۆمارکردن<br>ژمارە ١٨٩٧<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>جەنابی میری میرانی ئەفەندم<br>گومانلێکراوەکانی هۆزی پشدەر لە ناو سانجەقی سلێمانی و لەسەر سنووری ئێران هەندێك تاوانکاریان ئەنجام داوە، دواتر زیاتر لە ٢٠٠ گومانلێکراوی هۆزی پشدەر لەگەڵ سێ لە سەرۆکەکانیان هاتوونەتە سلێمانی، بەڵێننامەی ئەوەیان لێوەرگیراوە کە هیچ کێشەیەك دروست نەکەن، بە ئاماژەی ویلایەتی موسڵ دەرکەوتووە بە مەرجی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی حکوومەت، پاراونەتەوە و ملکەچ بوونیان قەبوڵ کراوە، هەروەها دڵنیاکردنەوەی یەکلاییکەرەوەیان لێ وەربگیرێت کە بۆ رۆژێکیش دژی یاساورێسای عالی جولە نەکەن، لەسەر وەرگرتنی تکاوپارانەوەی هۆزی ناوهاتوو و بە بریاری ئەنجوومەنی تایبەتی بریکارەکان، جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا رەزامەندی داوە، جێبەجێ کردنی کارەکە بە تەلەگرافنامە بە ویلایەتی ناوهاتوو راگەیەندراوە، بەم راگەیەندراوە نوسراو نووسراوەتەوە و ژمارەی لەسەر تۆمار کرا ئەفەندم، لە ٢٣ رەبیعی یەکەم ٣١١ و لە ٢١ ئەیلوول ٣٠٩.<br>سەدری ئەعزەم و یاوەری</td></tr>
</table>



| DH.MKT. | 00165.00043 | 29 ڕەبیعی کۆتایی 1311 |
|---|---|---|

٢٩ ڕەبیعی کۆتایی ٣١١
٢٧ تشرینی یەکەم ٣٠٩
بۆ ویلایەتی موسڵی جەلیلە
لە ناو سانجەقی سلێمانی، مەحمود ئاغا لە سەرۆکەکانی هۆزی پشدەر ملکەچی حکوومەت بووە، بۆیە بە پلەی ئیستەبڵی عامیرە و سەلیم ئاغا و عەلی ئاغاش بە پایەی قەپوچی باشی، هەروەها بابەکر ئاغا زادە مەمەند ئاغا و ئەحمەد ئاغازادە عەبدوڵڵا ئاغا و عباس ئاغازادە بابەکر ئاغا و ڕەسوڵ ئاغازادە عەبدوڵڵا ئاغا لە پلەی پێنجەم هەر یەکە بە نیشانی مەجیدی پاداشت بکرێن، بۆ ئەم مەبەستە لە پایەی ویلایەتی جەلیلە نووسراو لە مێژووی ٢٩ ئەیلوول ٣٠٩ ژمارە ١٠٥ هاتووە و ئاماژەی پێکراوە، بەڵام پێش دوو ساڵ لە نێوان پشدەریەکان و شیوەگلیەکان شەڕ ڕوویداوە، بۆیە دەبێ تێبینی ئەوە بکرێت کە ئەمانە شایەنی ئەوەن پاداشت بکرێن یاخود نەکرێن، بۆ ئەمەش پرس بە سەروو کراوە.



| 6 جەمادی یەکەم 1311 | 00169.00014 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

٦ جەمادی یەکەم ٣١١
٣ تشرینی دووەم ٣٠٩
بۆ ویلایەتی موسڵی جەلیلە
ئەو مووچەیەی کە بە پێویست زانراوە بۆ کاتیبی تۆماری قەزای شەهربازاری سانجەقی سلێمانی دابین بکرێت، لە خۆچێی ناوهاتوو شوێنگرەوەی ئەم مووچەیە هەیە، لە وەڵامی ئەو نووسراوەی کە پێشووتر نێردراوە و لەسەر هەندێك ووتە، لە پایەی ویلایەتی جەلیلە نووسراو لە مێژووی ١٨ ئەیلولی ٣٠٩ ژمارە ١٠٠ هاتووە، کە بری مووچەکە لە تۆماری مووچەکان نووسراوەتەوە و لە نەزارەتی ژمێریاری رێکخراوە و دەفتەرەکەش نێردراوە، بە تێروانین لە نووسراوی خانەی تێبینی دەفتەری ناوهاتوو بەپەلە جێبەجێ بکرێت، چۆنیەتی کارەکەش رابگەیەندرێت.

رەوانی ژمێریاری کراوە





DH.MKT.00170.00019.002

| 10 جەمادی یەکەم 1311 | 00170.00019 | DH.MKT. |
|---|---|---|

- ١٠ جەمادی یەکەم ٣١١
٧ تشرینی دووەم ٣٠٩
بۆ ویلایەتی موسڵی جەلیلە
محەمەد ئەفەندی خانەدانی سلێمانی ماوەی دوو ساڵە بێ کارە، هەروەها بژێوی کەوتۆتە تەنگانە، بۆ ئەم مەبەستە ناوبراو داواکاری بەرز کردۆتەوە، داوای کردووە، ئەرکێکی پێ بدرێت، لەبەر ئەوەی ناوبراو هیچ ڕێگریەك نییە لە بەکارهێنانەوەی، هیممەت بکرێت.

- بۆ لایەنی عالی لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی ئەفەندم
بەندەتان ماوەی ٣٠ ساڵە لە سانجەقی سلێمانی سەر بە ویلایەتی موسڵی جەلیلە وەکو کاتیبی ناحیە لەگەڵ قەڵەمی ژمێریاری لیوا دواجاریش بە سەر پشکنینی پۆلیسی پاراستنی ناوچە و بەڕێوەبەری ناحیەی شوان لە زۆر ئەرکی تر ئەرکم وەرگرتووە، لە فەرمانگەی دلخوای عالی لە ئەرکەکەم سەرکەوتوو بوومە، بە قەدەر ماوەی دوو ساڵە، هاتوومەتە دەرسەعادەت، بژێوی ژیانم خراپە و لەبەر نەگوزەراندنم، هێشتا کارم دەست نەکەوتووە، هەروەها وەکو بەندەکانی تر ئەمەکدار و لەگەڵ دانیشتوانی دەورووبەری عیراق شارەزای زمان و حاڵی هۆزەکانم، لە کاروباری نووسراو و هەژمارەکان ئاشنام، ئەم جۆرە بەندانەش لەلایەنی پەیوەندیدارانی نەزارەتی عالی دوورخستنەوەیان گونجاو نییە، بۆیە کۆتایی بەم نەهامەتیەی بەندەتان بهێنن و لە ئەرکێك دابنرێت، لە بارەی دامەزراندن و ئاسانکاری، لە داواکارکردنەکەم بوێریم کردووە کە لە موسڵ جەنابی پەیوەندیداری نەزارەت داواکاریەکەم بە شایەن بزانێت، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢ تشرینی دووەم ٣٠٩
بەندە محەمەد خانەدانی سلێمانی


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
DH.MKT 179/3 2

DH.MKT.00179.00003.002

| 13 جەمادی یەکەم 1311 | 00179.00003 | DH.MKT. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی دەرەوە
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٣٢٣
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی میری میرانی ئەفەندم
لە بازرگانانی ئێرانی، ئیسحاق ساوچبۆلاقی و دوو هاوەڵی لە ناو سانجەقی کەلوپەلی بازرگانیان دزراوە و هێشتا نەدۆزراوەتەوە، هەروەها لە گوندی موش ٣ کوردی بەگزادە کوژراوە، بکوژەکانیان قائیمقامی شەهربازار رەسول ئاغا و کورەکەی سلێمانە، بۆ دەستگیرکردنی ئەمانە و جێبەجێ کردنی مامەڵەی یاسایی لە بارەیانەوە، بەم راگەیاندنە راپۆرتی باڵیۆزخانەی ئێران وەرگیراوە، وێنەکەی لەگەڵ نووسراوی مێژووی ٢٣ نیسانی ٣١٠ نێردراوە، بەڵام ئەو وەڵامەی وەرگیراوە هێشتا نەنێردراوە، لەم بابەتەدا هێشتا ئەنجامێك دەستنەکەوتووە، بازرگانانی ناوبراو لەگەڵ میراتگری کوژراوەکان هەمیشە پەیوەندی دەکەن، بۆ ئەوەی کارەکە بەپەلە جێبەجێ بکرێت، لە باڵیۆزخانەی نووسراو نووسراوەتەوە، ئەمجارەش لە باڵیۆزخانەی ناوهاتوو داواکار نووسراوی داوە، وێنەیەکی هاوپێچ نێردراوە، بە تێروانین لە نووسراوەکان و ئاماژەی پێشوو کارەکە جێبەجێ بکرێت و کۆتایی پێ بهێنرێت، هیممەت بۆ پەیوەندیدارانی نەزارەتی عالیە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١٣ جەمادی یەکەم ١٣١١ و لە ١٠ تشرینی دووەم ٣٠٩
نازری دەرەوە



| DH.MKT. | 00198.00017 | 14 رەجەب 1311 |
|---|---|---|

١٤ رەجەب ٣١١

١٠ کانوونی دووەم ٣٠٩

جەنابی لایەنی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت

لە سلێمانی، مەلا رەشید ئەفەندی لە خانەدانەکانی بابانە و بە بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری سەرقاڵە، لەبەر ئەوەی ئەمر و فەرمانی پەسەند کراوە، بریارنامەی ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی سلێمانی وەرگیراوە تاوەکو مووچەیەکی گونجاوی بۆ دابین بکرێت، بە راستی شایەنی میهرەبانیە، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکەی لە ویلایەتی موسڵ نووسراوی مێژووی ١٦ ئەیلوول ٣٠٩ ژمارە ٩٩ لەگەڵ بریارنامە بەیەکەوە پێشکەش کراوە، هەروەها جێبەجێ کردنیشی دەگەرێتەوە بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت.



| 1311 ڕەجەب 27 | 00202.00046 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٧ ڕەجەب ١٣١١
٢٢ کانوونی دووەم ١٣٠٩
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
بە مەبەستی ڕێزگرتنی عەبدوڵڵا ئەفەندی کاتیبی قەڵەمی تۆماری سلێمانی و جەودەت ئەفەندی کاتیبی ئەنجوومەنی کارگێری، لە مێژووی ١٦ و ٢٣ی کانوونی یەکەم ١٣٠٩ دوو پارچە نووسراوی عالی بە پۆستە حەواڵەی تۆماری زانیاری/ کارگێری گشتی کراوە، کە تێدا نیشان دراوە هێشتا کاغەزی زانیاری کەسێتی نەهاتووە، لەم بارەیەوە کارەکە جێبەجێ بکرێت.



| 1311 شەعبان 29 | 00213.00079 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٩ شەعبان ١٣١١
٢٣ شوبات ١٣٠٩
بۆ جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
لەبەر ئەو خزمەتە باشەی كە عەلی بەگ ئەندامی ئەنجوومەنی كارگێری سانجەقی سلێمانی كردوویەتی، بە پلەیەكی گونجاو رێزی لێ بگیرێت، بۆ ئەم مەبەستە لە ویلایەتی موسڵ نووسراو لە مێژووی ٢٥ كانوونی دووەم ١٣٠٩ ژمارە ٩٢ لەگەڵ هاوپێچی تر پێشكەش كراوە، هەروەها ئەگەرچی بە گونجاو زانراوە كە ناوبراو بە پلەی چوارەم رێزی لێ بگیرێت، بەڵام جێبەجێ كردنی بە هاوكاری لایەنی پەیوەندیداری سەدارەتپەناهییەوە دەبێت.



| 5 شەوال 1311 | 00223.00005 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٥ شەوال ١٣١١
٣٠ مارت ١٣١٠
بۆ جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەتمان
عەبدولرەحمان بەگ ئەندامی ئەنجوومەنی كارگێری پێشووی سانجەقی سلێمانی، خزمەتی باشی كردووە، بۆیە بە پلەیەكی گونجاو رێزی لێ بگیرێت، لە ویلایەتی موسڵی جەلیلە نووسراو لە مێژووی ٥ شوبات ١٣٠٩ ژمارە ٢٠٢ لەگەڵ هاوپێچی تر پێشكەش كراوە، بە گونجاو زانراوە ناوبراو پلەی چواری پێ بدرێت، بەڵام بە هاوكاری پەیوەندیدارانی سەدارەت دەبێت.



DH.MKT.00227.00023.002



DH.MKT.00227.00023.003

<table>
<tr><th>DH.MKT.</th><th>00227.00023</th><th>13 ڕەمەزان 1311</th></tr>
<tr><td colspan="3">
- ویلایەتی موسڵ<br>
قەڵەمی تۆمارکردن<br>
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>
جەنابی ئەفەندم<br>
لەبەر ئەوەی مەعروف ئەفەندی فەرمانبەری ناسنامەی سانجەقی سلێمانی خزمەتی باشی کردووە و کارەکانی بە ڕێکوپێکی بەڕێوەبردووە، قسە کراوە پلەکەی بۆ پلە چوار بەرز بکرێتەوە، لە موتەسەرفی لیوای ناوهاتوو نووسراو هاتووە و هاوپێچ پێشکەش کراوە، هەروەها ئەم جۆرە کەسانە بە نیشانی عالی ڕێزیان لێ دەگیرێت، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارەش هاوکاری نەزارەتپەناهی جەلیلەی پێویستە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٣ ڕەمەزان ١٣١١ و لە ٧ مارت ١٣١٠.<br>
والی موسڵ<br>
<br>
- بابی عالی<br>
فەرمانگەی تۆماری ناسنامەی گشتی<br>
لە مێژووی ١٣ ڕەمەزان ١٣١١ بە نووسراوی ویلایەتی موسڵ ئاماژە بە ڕێزلێنانی مەعروف ئەفەندی فەرمانبەری ناسنامەی سانجەقی سلێمانی کراوە، بەڵام زانیاری وەرگێردراوی نییە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>
١٠ شەوال ١٣١١
</td></tr>
</table>





<table>
<tr><td>1311 شەوال 16</td><td>00228.00014</td><td>DH.MKT.</td></tr>
<tr><td colspan="3">

- ١٦ شەوال ١٣١١
١٠ نیسان ١٣١٠
بۆ ویلایەتی موسڵی جەلیلە
بەهۆی ئەم خزمەتە باشەی کە کەریم ئاغا بەڕێوەبەری ناحیەی قزلجە سەر بە سانجەقی کردوویەتی، بە وەرگرتنی پلەی سێیەم پاداشت بکرێت، لە نووسراوی مێژووی ٧ مارت ١٣١٠ ئاماژەی پێکراوە، بەڵام کاغەزی وەرگێردراوی باری کەسێتی ناوبراو هێشتا نەهاتووە.

- ٩ شەعبان ١٣١٢
٢٣ کانوونی دووەم ١٣١٠
بۆ لایەنی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
کارە باشەکانی کەریم ئاغا بەڕێوەبەری ناحیەی قزلجەی سەر بە سانجەقی بینراوە، بۆ پاداشت کردنی ناوبراو، لە ویلایەتی موسڵی جەلیلە نووسراو لە ٧ مارت و ١٧ ئەیلوول ١٣١٠ نێردراوە، لەگەڵ تۆماری کەسێتی بەیەکەوە پێشکەش کراوە، بە گونجاو زانراوە ناوبراو بە پلەی چوارەم پاداشت بکرێت، بەڵام جێبەجێ کردنی دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندیدارانی سەدارەت.

</td></tr>
</table>



| DH.MKT. | 00236.00025 | 10 زیلقەعدە 1311 |
|---|---|---|

١٠ زیلقەعدە ١٣١١
٤ مایس ١٣١٠
بۆ جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەتەکەمان
کوڕەکانی سەرۆکی هۆزی جاف مەجید بەگ و تاهیر بەگ لەگەڵ عوسمان بەگ قائیمقامی گولعەنبەر، کە سەر بە سانجەقی سلێمانین، لە بارەی کاروبارەکانی هۆزی ناوهاتوو و کارە تایبەتمەندییەکان و ئەو بابەتانەی پەیوەستن بە حکوومەت، کاری باش و خزمەتی باشیان ئەنجام داوە، بۆیە پایەی ئستەبڵی عامیرەیان پێ بدرێت، بۆ ئەم ڕێزگرتنە لە ویلایەتی موسڵ نووسراو لە مێژووی ١٢ مارت ١٣١٠ پێشکەش کراوە و تێدا هاتووە؛ ئەم جۆرە پایەیە نموونەیەکی گونجاو نییە، بەڵکو بە پایەی قاپوچی باشی ڕێزیان لێ بگیرێت، لەم بابەتەدا هاوکاری سەدارەتپەناهی پێویستە.



DH.MKT.00240.00033.001

| 17 زیلقەعدە1311 | 00240.00033 | DH.MKT. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمارکردن
وێنەی تەلەگرافنامە

ماوەیەکە لە سانجەقەکەمان ئەمنیەت و ئاسایش نەماوە، زۆربەی شەوان چەند خانەیەکمان لەلایەن دزەکانەوە دزی لێ دەکرێت، بە رۆژیش کوشتن و برینداركردن بەردەوامە، کەلوپەلی بازرگانەکانیش تەنیا بە پێشکەش کردنی چەند ئاقچەیەك، چەتەی ئەسپ سوار یاخود دزیکەری سەر سنوورەکان رازی دەکرێن ئینجا دەتوانین کەلوپەلەکانمان بنێرینە بەغداد و شوێنەکانی تر، بۆ دەرباز بوون لەم بارودۆخە، راسم پاشا موتەسەرفی سلێمانی لێهاتوو و بێ توانایە، چەند جارێك سەرداغمان کردووە، بەڵام بێ ئەنجام بووە، چونکە کاروباری ناوچەکەی داوەتە دەست ئاغای بلۆك بە ناوی حوسێن ئاغا و ناوبراو لەگەڵ زۆربەی فەرمانبەرانی ناوچەکە و ئەندامانی کارگێری نزیکایەتی و دۆستایەتی هەیە، لەبەر خەریك بوون بە خۆشی خۆی، کوشتن و بریندار بوون زیادی کردووە، ئەم کارەش لە ناوەوە و دەرەوە زیاد دەکات، بە سوپاسەوە دەوڵەتی عالیە هەموو کاروبارێکی دەوڵەت ئەنجام دەدات، جگە لەمە گەرانەوەی ئەمنیەت و ئاسایشمان دەگەرێتەوە بۆ پەیوەندیدارانی خەلافەت، لە پێناو خوا چارەسەرێك بۆ دەردەکەمان بدۆزنەوە، بە ناوی بازرگان و زوڵملێکراوان تکا دەکەین، فەرمان.

بازرگان مەحمود، بازرگان عەبدولرەحمان، بازرگان عزەت، بازرگان ئەحمەد، بازرگان عەبدوڵلا، بازرگان حەسەن، بازرگان سەعید، بازرگان سەید، بازرگان عەبدوڵلا، بازرگان محەمەد، بازرگان مەعروف، بازرگان مەحمود، بازرگان سەعید، بازرگان محەمەد، بازرگان ئەبراهام یەهودی، بازرگان ئۆلدمۆ یەهودی، بازرگان مستەفا، بازرگان شەریف، بازرگان مەحمود، بازرگان سالح، بازرگان پاترۆس کرستیان، بازرگان کرستیان عەلکە، بازرگان عەبدا یەهودی



| 25 موحەررەم 1311 | 000254.019048 | BEO. |
|---|---|---|

٢٥ موحەررەم ١٣١١
٢٩ تەمموز ١٣٠٩
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
هاووڵاتـی سـانجەقی سـلێمانی و لـە سـەیدەکانی بەرزنجـی بـە نـاوی محیەددیـن، ئەندامانـی خێزانەکـەی زۆرە و لـە رووی بژێـوی ژیانـەوە تووشـی تەنگوچەڵەمـە بۆتـەوە، بـۆ داواکردنـی میهرەبانـی پاشـا سـاڵێك پێـش ئێسـتا هاتۆتـە دەرسـەعادەت داوای کـردووە برێـك مووچـەی بـۆ ببرێتـەوە، لـە مێـژووی ٨ زیلحیجـە ١٣٠٩ داواکاری بـە واژووی ناوبـراو لەگـەڵ نـووسراو بـۆ نەزارەتـی جەلیلـە نێـردراوە، بـەڵام ئەمجـارە بـە ناردنـەوەی داواکاری ناوبـراو لـە مووچـەی دەسـتکورتانی بـێ خـاوەن ٤٠ قـوروش ببرێتـەوە، نـوسراو بکرێـت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

DH.MKT.00267.00002.001

| DH.MKT. | 00267.00002 | 9 موحەررەم 1311 |
|---|---|---|

شورای دەوڵەت
دادگای بەدواداچوون
ژمارە ٦٧
جەنابی سەدری ئەعزەم لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەیەکی بێ نرخە
بوختـان بـە مەلیـك ئەفەنـدی ژمێریـاری پێشـووی سـانجەقی سـلێمانی، محەمـەد کامیـل نائیبـی پێشـووی لیـوای ناوهاتـوو، عەلـی رزا سـەرۆکی پێشـووی دادگای سـزا، سـلێمان فائیـق یاریـدەدەری پێشـووی داواکاری گشـتی، حەسـەن نـوری بـاش کاتیبـی پێشـووی دادگای ناوهاتـوو، شـێخ ئەحمەد ئەفەنـدی بریـکاری ژمێریاری ئاوقاف، سـاڵح بـەگ بـاش کاتیبـی دە یەکـی پێشـوو لەگـەڵ حەسـەن ئەفەنـدی و سـلێمان ئەفەنـدی فەرمانبەرانـی لێکۆڵینـەوە، کـراوە، لـە سـەر داواکاری بوختانکردنەکە بڕیارنامـەی پەیوەنـدی نەبوونیـان لـە دەسـتەی تاوانـی شـورای دەوڵـەت رێکخـراوە، بـۆ پەسـەندکردنی ئـەم بڕیارنامەیـە، نـووسراوی بـە بڕیـار لـە دادگای پێداچوونـەوە دەرچـووە، هاوپێـچ پێشکەشـی جەنابـی سـەدری ئەعـزەم لـە پەیوەندیدارانـی سـەدارەت کـراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی نـووسراوی بـە بڕیارەکـە ویلایەتـی موسـڵ ئـاگادار کراوەتـەوە، هەروەهـا زانیـاری حەواڵـەی نەزارەتـی ناوەخـۆ و بـۆ لایەنـی واڵای پەیوەندیدارانـی شـێخایەتی لەگـەڵ نەزارەتـی داد و سـەرۆکایەتی گشـتی قۆمیسـیۆنی تۆمـاری کەسـێتی نێـردراوە، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ٩ موحـەررەم ١٣١١ و لـە ٣٠ حوزەیـران ٣١٠.
وەکیلی سەرۆکی شورای دەوڵەت



| BEO. | 000270.020198 | 22 سەفەر 1311 |
|---|---|---|

٢٢ سەفەر ١٣١١
٢٢ ئۆغستۆس ١٣٠٩
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بـە ئامـاژەی ویلایەتـی موسـڵ، دانیشـتوانی موسـڵ بـە نـاوی سـەعید بـەگ و رەئـوف بـەگ لەگـەڵ حاجـی محەمەد لەسـەر کارە نەگونجاوەکانیـان، ماوەیـەك لـە سـانجەقەکانی کەرکـوك و سـلێمانی نیشـتەجێ بکرێـن و ئەرکیـان پـێ بدرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە فەرمانـی پاشـای جەنابـی خەلافەتپەناهـی دەرچـووە، بـە نـووسراوی تایبەت لـە مابەینی هومایۆنـی بـاش کیتابەتـی جەلیلـە ئامـاژەی پێکـراوە، بـە تەلەگرافیـش نـووسراو بـۆ ویلایەتـی ناوهاتـوو رۆیشـتووە، کـە چـۆن کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت، بۆیـە لـە نەزارەتـی جەلیلـەش هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.


OSMANLI ARŞIVI
BEO
287 21488

| BEO. | 000287.021488 | 23 رەبیعی یەکەم 1311 |
| --- | --- | --- |

٢٣ رەبیعی یەکەم ١٣١١
٢١ ئەیلوول ١٣٠٩
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
هۆزی پشدەر کە لە ناو سانجەقی سلێمانی و سنووری ئێران بوونیان هەیە، هەندێك کاروچالاکی بەد و تاوانیان ئەنجام داوە، پاشان زیاتر لە ٢٠٠ کەس لەگەڵ سێ لە سەرۆکەکانیان هاتوونەتە سلێمانی، بەڵێنیان داوە زیان و هیلاکی دروست نەکەن و ملکەچی فەرمانەکانی حکوومەت بن، ، بۆیە لە ئاماژەکانی ویلایەتی موسڵ دەرکەوتووە، بە مەرجی سەرپێچی نەکردن و ئەنجام نەدانی کاروچالاکی پارانەوەیان قەبوڵ دەکرێت، بە بڕیاری ئەنجوومەنی تایبەتی بریکارەکان، جەنابی خەلافەتپەناهی فەرمانی پاشای دەرکردووە و بە تەلەگراف جێبەجێ کردنی بە ویلایەتی ناوهاتوو راگەیەندراوە، بە راگەیاندنی نووسراو بکرێت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
321 | 57 | 1

DH.MKT.00321.00057.001

| 15 ڕەمەزان 1311 | 00321.00057 | DH.MKT. |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمارکردن
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
مەعـروف ئەفەنـدی بەرێوەبـەری قەرەداغـی سـەر بـە سـانجەقی سـلێمانی، یەکێکـە لـە سـەیدەکانی بەرزنجـی و لێهاتـوو و بـە توانایـە، لـە ئەرکەکەیـدا کاروبـاری دەوڵـەت بـە ڕێکوپێکـی بەڕێـوە دەبـات و هـەوڵ و کۆششـی دیـارە، دەرکەوتـووە ئـەو فەرمانبـەرەی لـە ئەرکەکەیـدا کاروبـاری بیبرابێـت، بـە نیشـانی عالـی شـایەنی ڕێزگرتنـە، بۆیـە لـە وێنـەی تایبەتـی موتەسـەرفیەتی لیـوای ناوهاتـوو ئامـاژەی پێکـراوە و بـە پلـەی سـێیەم ڕێـزی لێگیـراوە، هەروەهـا وێنـەی ئامـاژە پێکردنەکـە گونجـاوە، ناوبـراو بـە پێشـکەش کردنـی پلـەی سـێیەم بـە هـاوکاری جەنابـی پەیوەندیـداری نـەزارەت دەبێـت، لـەم بابەتـەدا لـە هـەر حاڵەتێکـدا ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ١٥ ڕەمـەزان ٣١١ و لـە ١٠ مـارت ٣١٠.
مۆری والی موسڵ سەید ئەحمەد عەزیز



| BEO. | 000344.025728 | 7 رەجەب 1311 |
|---|---|---|

٧ رەجەب ١٣١١
بۆ سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی جەلیلەی بە وەکالەت
لەسەر ئەو داوایانەی کە لەلایەن فەرمانبەرانەوە لەسەر مەلیك ئەفەندی ژمێریاری پێشووی سانجەقی سلێمانی لەگەڵ جەنابی تەحسین پاشا والی پێشوو تۆمارکراوە، لە فەرمانگەی دادگاکانی شورای دەوڵەت بە نووسراو چۆنیەتی سزادانەکەیان رێکخراوە، بەڵام بەهۆی کاروکردەوەی ناوبراوان بە پێویست زانراوە بە سزای تری یاسایی سزا بدرێن، لەسەر جێبەجێ کردنی دادگایی کردنیان لە فەرمانگەی ناوهاتوو نووسراوی ٢٠ رەبیعی یەکەم ١٣١١ و ٩ رەبیعی کۆتایی ١٣١١ ژمارە ٨٩ و ١٠٥ هاتووە، هەردوو نووسراو لە ئەنجوومەنی تایبەتی وەکیلەکان خوێندنەوەی بۆ کراوە، لە شورای دەوڵەتیش فەرمانی دەستگیرکردنیان بۆ دەرچووە، بە ووتەکان دەردەکەوێت ئەو بریارەی لەسەریان جێبەجێ دەکرێت، سەرووی لێ ئاگادارکراوەتەوە.



| 1311 زیلقەعدە 4 | 000400.029956 | BEO. |
|---|---|---|

٤ زیلقەعدە ١٣١١
٢٨ نیسان ١٣١٠
بۆ سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی جەلیلەی بە وەکالەت
بـۆ ئـەو چاکسـازیانەی کـە پێویسـتە لـە بارودۆخـی سـانجەقی سـلێمانی بکرێـت، لیسـتی تـەواوی هەندێـك ووتـە و تێبینـی لـە ویلایەتـی موسـڵ بـە مێـژووی ٢ شـەوال ١٣١١ بـۆ دەوڵـەت نێردراوە، لەبـەر ئـەوەی سـانجەقی ناوهاتـووش لەگـەڵ ئێـران هاوسـنووره و دراوسـێیە، گرنگیەکـی تایبەتـی هەیـە، بـە تێروانیـن لـەو لیسـتەی کـە نـاوی هاتـووه لـە شـورای دەوڵـەت سـەیر کـراوە، بـە ووردبینـی کـردن و گفتوگـۆ کـردن جێبەجـێ دەکرێـت، ئـەو بریـارەی لەسـەری دەدرێـت، بـە بریارنامـە هیممـەت بکرێـت لـە راگەیاندنـی.



| 5 زیلقەعدە 1311 | 000401.030043 | BEO. |
|---|---|---|
| ٥ زیلقەعدە ١٣١١<br>بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>لـە قـەزای گولعەنبـەری سـانجەقی سـلێمانی و ناوچەکانـی سـەر سـنووری ئێـران بـە نـاوی تەوێڵـە و بەیـارە و پێنچویـن خۆیـان تەرخـان کـردووە بـۆ تەریقەتی نەقشـبەندی هەروەها بـەردەوام شـوێنی چەندین تەریقـەت بووە، تەکیەکـی دوو دەرگایـی لەگـەڵ مەدرەسـەیەکی دوو دەرگایـی هەیـە، بـۆ یـەك رۆژیـش بێـت ئەمانـە دەرماڵەیـان نەبـووە، شـێخ و مودەریسـەکانیان بەهۆی خزمەتە شایسـتەکانیان، وەکـو خۆراکی تەکیە و مەدرەسـەکە مووچەیەکی گونجـاو دابیـن بکرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش لـە ویلایەتی موسـڵی جەلیلە نـووسراو لـە مێـژووی ١٥ رەمـەزان ١٣١١ هاتـووە، بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە جێبەجـێ بکرێـت و هیممـەت بکرێـت لـە راگەیاندنـی. | | |


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

تلغرافنامه

داخلیه نظارت جلیله سنه

DH.MKT 421/45

DH.MKT.00421.00045.001

| 3 ڕەبیعی یەکەم 1313 | 00421.00045 | DH.MKT. |
|---|---|---|

تەلەگرافنامە

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لەبەر گرنگی ستراتیژی سانجەقی سلێمانی هەروەها لەبەر ئەوەی زۆربەی قەزایەکانی کەوتۆتە سەر سنووری ئێران، لەم ناوچەیە ڕووداوی زۆر گرنگ ڕوو دەدات، هەواڵی ئەم بابەتانەش درەنگ دەگاتە شوێنی مەبەست، بەهۆی ئەم ڕووداوانەوە ویلایەت باجەکەی وەرگرتووە، لە ئەنجام کێشە و شتی مەترسیدارتر ڕوو دەدات، بۆ ئەوەی ڕێگە نەدرێت ئەم جۆرە بارودۆخانە سەرهەڵبدات، بەڕێوەبردنی کارگێری تەلەگرافی قەزایەکانی گولعەنبەر و شەهربازار و مەرگە دابمەزرێت، لەگەڵ ئەمەش هێڵەکان درێژ بکرێنەوە، تکایە پێویستمان بە هاوکاریتانە.

لە ١٢ ئۆغستۆس ٣١١

محەمەد ساڵح والی موسڵ


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
429 | 32111 | 1

| BEO. | 000429.032111 | 26 زیلحیجه 1311 |
| --- | --- | --- |

٢٦ زیلحیجه ١٣١١

بۆ لایەنی عالی لە پەیوەندیدارانی شێخایەتی

گشت نەتەوە و هۆزەکانی سانجەقی سلێمانی لەسەر مەزهەبی شافعین، هەروەها رەسول ئەفەندی یەکێکە لەو زانایانەی پیشەی ووتارخوێن و خەریکی ئامۆژگاری کردنە، بۆیە برێکی گونجاو مووچەی بۆ برێتەوە، لە بارەی دامەزراندنی ووتارخوێنیش نوسراو لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە نێردراوە، لە لایەن پەیوەندیدارانی فەتواش خوێندنەوەی بۆ کراوە و لە مێژووی ١٩ زیلحیجە ١٣١٠ پرسیاری لەسەر کراوە، بۆ ئەوەی بەپەلە کارەکە ئەنجام بدرێت، ئەمجارە لە نەزارەتی ناوهاتوو نووسراو هاتووە، لەگەڵ هاوپێچەکانی بۆ پەیوەندیدارانی شێخایەتی نێردراوە، بە تێروانین لە ئاماژەی پێشوو جێبەجێ کردنەکەی رابگەیەندرێت و نووسراوی ناوهاتوو بنێردرێتەوە.

بە ئاماژەی راوێژکار


OSMANLI ARŞİVİ
ŞD
926 95 2
ŞD.00926.00095.002

| ŞD. | 00926.00095 | **24 جەمادی کۆتایی 1311** |
|---|---|---|

فەرمانگەی خانەنشینی مولکیە
ژمارە ٢٣٩٠
لەلایەن خورشیدە خان خێزانی کۆچکردوو محەمەد نوری ئەفەندی کاتیبی قەڵەمی ژمێریاری سانجەقی سلێمانی لەگەڵ کچەکانی بەهیە خان و ئافتاب خان و کورەکانی عەبدوڵڵا ئەفەندی و محەمەد نامق ئەفەندی و مستەفا ئەفەندی داواکاریان پێشکەش کردووە بۆ ئەوەی مووچەیان بۆ ببڕێتەوە، داواکاری ناوهاتوو لە ویلایەتی موسڵ نووسراوی بۆ کراوە، لەگەڵ داواکاریەکە خشتەی ماوەی ئەرکەکەی و کاغەزی جۆراوجۆری پەیوەست بەم بابەتە نێردراوە، لە ژمێریاری پەراوێزی بۆ نووسراوەتەوە و لە دەستەی گشتی پۆستەی هەژمار ووردبینی بۆ کرا.

لە پۆستەی باسکراو مێژووی ئەو ئەرکانەی کە ناوبراوی کۆچکردوو وەریگرتووە لەگەڵ بڕی ئەو مووچانەی کە وەریگرتووە تا ١ کانوونی یەکەم ١٣٠٨، بە بڕیارنامەی فەرمانبەرانی مولکیە، ماددەی ٣٥ و ٣٦ و ٣٩ دوای زیادکردن و کەم کردنەوە ئەوەی شایەنی ناوبراوانە ١٨٠ قوروشە، ئەم مووچەیەش لە نێوانیان دابەش دەکرێت، کە هەر یەکەیان ٣٠ قوروشیان بەردەکەوێت، مامەڵەی مووچەی ناوهاتوو بە ماددەی ٣٥ جێبەجێ دەکرێت، بۆ ئەوەی لە سندوق دابین بکرێت نووسراوی بۆ کراوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٤ جەمادی کۆتایی ١٣١١ و لە ٢١ کانوونی یەکەم ١٣٠٩.




ŞD.02167.00027.004

| 18 جمادی یەکەم 1311 | 02167.00027 | ŞD. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٢٤٦١
بۆ جەنابی لایەنی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە
لە ناو سانجەقی سلێمانی، لە بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی قەڵەسیوکە دامەزراوە و چۆتە شوێنی کارەکەی، بۆ ماوەی ٢٠ رۆژیش لە ئەرکەکەی دەست بە کاربووە، بەڵام لە خۆچێی ئاوا بە پێویست زانراوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ناوهاتوو سەعید ئەفەندی سەرۆکی هەمەوەند دابمەزرێت، بۆیە لە ئەرکەکەی جیابۆتەوە و گەڕاوەتەوە، لەبەر ئەوەی زوڵمی لێکراوە، محەمەد زیا (محمد ضیا) داوای بەرز کردۆتەوە و داوای مووچەی کردووە، لە پایەی ویلایەتی موسڵ لە مێژووی ٢٢ حوزەیران ٣٠٩ نووسراوەکان و داواکاریەکە پێشکەش کراوە، لەسەر بابەتەکە و داواکاری باسکراودا بە تێڕوانین لەو پەراوێزەی کە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران و ژمێریاری نوسراوەتەوە، جێبەجێ کردنی بە هاوکاری پەیوەندیدارانی سەدارەت دەبێت، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٨ جەمادی یەکەم ٣١١ و لە ١٥ تشرینی دووەم ٣٠٩.
نازری کاروباری ناوەخۆ


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
ŞD
2626 | 17 | 2

ŞD.02626.00017.002

| 29 رەبیعی کۆتایی 1311 | 02626.00017 | ŞD. |
|---|---|---|

بابی فەتوا
فەرمانگەی شێخایەتی ئیسلامیە
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٩
بۆ سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی جەلیلەی بە وەکالەت
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لەلایەن زۆربەی فەرمانبەران دژی مەلیك ئەفەندی ژمێریاری پێشووی سانجەقی سلێمانی لەگەڵ جەنابی حەسەن تەحسین پاشا والی پێشووی ویلایەتی موسڵ سکاڵا تۆمارکراوە، ئەم داوایە بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا لە فەرمانگەی دادگاکانی شورای دەوڵەت بینراوە و ووردبینی بۆ کراوە، وێنەیەکی نووسراوی بە بریارەکە دراوەتە فەوزی ئەفەندی نائیب، بە هەواڵ و زانیاری دەستگیرکردنی لە مێژووی ٦ رەبیعی کۆتایی ١٣١١ ژمارە ١٨ هاتووە لەگەڵ نووسراوی دەستووریەکان لە ئەنجوومەنی هەڵبژاردن خوێندنەوەی بۆ کراوە، نووسراو بۆ نائیبی ناوبراو نێردراوە، بە هاتنی هەواڵ و زانیاری دەستگیرکردنیان بۆ سەروو دەنێردرێت، بە راگەیاندنی وەڵام نووسرایەوە ئەفەندم، لە ٢٩ رەبیعی کۆتایی ١٣١١ و لە ٢٧ تشرینی یەکەم ١٣٠٩.
محەمەد جەمالەددین شێخی ئیسلام




İ.HUS.00034.00081.003

| I.HUS. | 00034.00081 | 27 شەعبان 1312 |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز<br>ئەو تەلەگرافنامە بە شیفرەیە کە لە ویلایەتی موسڵەوە هاتووە<br>لە ٨ شوبات ٣١٠ بە فەرمانی پەیوەندیدارانی وەکالەت نووسراوەکە خوێندنەوەی بۆ کرا، فەرید ئەفەندی یوزباشی لە تابوری ئێستر سوارەی سەر بە لەشکری شەشەمی هومایۆن رایگەیاندووە و بڵاوی کردۆتەوە، بۆ ئاشت کردنەوەی نێوان شێخەکان، سەیدەکانی سلێمانی هێنراونەتە موسڵ، هەروەها پەیوەندیدارانی سەدارەت ئاگاداری ئەو کەسانەن کە کاری سەرپێچیان ئەنجام داوە، ئەگەر بکرێت یوزباشی ناوهاتوو یاخود لە لەشکری هومایۆن یا لە پایەی سەرعەسکەری جەلیلە کەسانێکی گونجاو بە کارەکە هەڵسن، راگەیەندراوە فەرمان.<br>لە ١١ شوبات ٣١٠<br>عەزیز والی | | |



İ.TAL.00075.00042.001

| 9 شەوال 1312 | 00075.00042 | I.TAL. |
| --- | --- | --- |

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
٩٣٠٨
راگەیەندراوی بەندەیە
محەمەد ئاغا لە پۆلیسی پاراستنی یوزباشیەکانی سانجەقی سلێمانی، بە وەکالەت ئاغای تابوری لیوای ناوهاتووە، لە کارە تایبەتمەندییەکانی ئەملاکی هومایۆن، خزمەتە باشەکانی بینراوە، بۆیە لە پلەی پێنجەم نیشانی مەجیدی پێ بدرێت، لەم بارەیەوە جەنابی خەلافەتپەناهی بە فەرمانی پاشا رەزامەندی داوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٩ شەوال ١٣١٢ و لە ٢٤ مارت ١٣١١
جەنابی شەهریاری سەر کاتیب


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

تلغراف نامه

OSMANLI ARŞİVİ
DH.ŞFR
168 114

DH.ŞFR.00168.00114.001

| DH.ŞFR. | 00168.00114 | 18 ڕەبیعی یەکەم 1312 |
|---|---|---|

تەلەگرافنامە
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە دژی موتەسەرفی سانجەقی سلێمانی لێکۆڵینەوە ئەنجام دراوە و لێکۆڵینەوەکە بۆ لیوای ناوهاتوو نێردراوە، دواتریش حەواڵەی دەفتەرداری ویلایەت کراوە، لە ئۆغستۆسی ۳۱۰ تەلەگرافنامە ڕاگەیەندراوە، لەم بارەیەوە ئەو نووسراوەی بۆ دەفتەرداری ناوهاتوو نووسراوە، خەریکە دەگاتە دەست موتەسەرفیەتی کەرکوک، لە ناو سانجەقی سلێمانی لە نێوان هەندێك فرقەی هۆزەکانی جاف ڕووبەڕووبوونەوە ڕوویداوە، بۆیە بە گوێرەی شوێنەکە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی باسکراو گونجاو نییە و بۆ کاتێکی تر دوابخرێت، ڕاگەیەندراوە، لە ۷ ئەیلوول ۳۱۰.
عەزیز والی موسڵ

T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.ŞFR
174 27

DH.ŞFR.00174.00027.001

| 27 زیلقەعدە 1312 | 00174.00027 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە ناو سانجەقی سلێمانی، گوندی سیاهگۆز لە ناحیەی قزلجە كە لەسەر سنووره لەگەڵ چەند گوندێكی دەوروبەری لەلایەن حاكمی بانەی سەر بە مەملەكەتی ئێران فەتاح خان هێرشی كراوەتە سەر و تاڵان كراوە، لە دانیشتوانی ئەم گوندە ئەحمەد بەگ خانەكەی سووتێنراوە، بۆیە میری ناوبراو لەگەڵ خانەوادەكەی هاتۆتە گوندی سورەبانی سەر بە ناحیەی سویل لە پاشكۆی قەزای شەهربازار، لەسەر ئاماژەی موتەسەرفی لیوای ناوهاتوو راگەیەندراوە، لە ١٠ مایس ١٣١١.
عەزیز والی موسڵ



| 2 سەفەر 1312 | 00267.00066 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢ سەفەر ٣١٢
٢٣ تەمموز ٣١٠
بۆ ویلایەتی موسڵی جەلیلە
لەبەر ئەوەی زەوی خاوەندارێیەتی و زەوی و زاری تری سانجەقی سلێمانی لە نرخی خۆی کەمتر دەکات و نرخی هاتۆتە خوارەوە، بۆیە سەرۆکی شارەوانی حەسەن نەورەسی داواکاری بە مۆری پێشکەش کردووە و تێدا داوا دەکات بارودۆخەکە چاك بکرێتەوە، بە تێروانین لە بابەتەکە بە لێکۆڵینەوە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی مامەڵەکە.



| 17 سه‌فه‌ر 1312 | 00273.00031 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٧ سه‌فه‌ر ٣١٢
٧ ئۆغستۆس ٣١٠
جه‌نابی لایه‌نی عالی له‌ پەیوەندیدارانی سه‌داره‌ت
ته‌کیه‌ی شێخ ره‌سول ئه‌فه‌ندی که‌ له‌ سه‌یده‌کانی به‌رزنجییه‌، له‌ ناحیه‌ی قه‌ره‌داغی سه‌ر به‌ سانجه‌قی سلێمانییه‌، هه‌ژار و ده‌رویش جگه‌ له‌مه‌ش خانه‌واده‌که‌ی هاتووچۆی ته‌کیه‌ی ناوبراو ده‌که‌ن، به‌ڵام بۆ رۆژێکیش بێت داهاتی به‌رێوه‌بردنی ئه‌م خه‌ڵکه‌ی نییه‌، هه‌روه‌ها خودی خۆشی له‌و نزاکارانه‌یه‌ که‌ شایه‌نی میهره‌بانیه‌، وه‌کو سه‌ده‌قه‌ی جه‌نابی پاشا بڕێکی گونجاو مووچه‌ بۆ ناوبراو ببڕێته‌وه‌، بۆ ئه‌م مه‌به‌سته‌ له‌ ویلایه‌تی موسڵی جه‌لیله‌، نووسراو له‌ مێژووی ٦ ته‌ممووز ٣١٠ ژماره‌ ٥٥ هاتووه‌ و هاوپێچ پێشکه‌ش کراوه‌، بۆ جێبه‌جێ کردنی مامه‌ڵه‌که‌ پێویسته‌ جه‌نابی پەیوەندیداری سه‌داره‌ت هاوکار بێت.




DH.MKT.00274.00017.001

<table>
<tr><th>DH.MKT.</th><th>00274.00017</th><th>2 سەفەر 1312</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز/ قەڵەمی تۆمارکردن<br>ژمارە ١٣٥٧<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لەسەر ئەو داوایەی لە دژی مەلیك ئەفەندی كە لە ژمێریاری سانجەقی سلێمانی جیابۆتەوە لەگەڵ تەحسین پاشا والی پێشووی ویلایەتی موسڵ و ئەو ناوانەی كە ئاشكران بەرز كراوەتەوە، لە فەرمانگەی دادگاكانی شورای دەوڵەت سەیر كراوە، دوای رەزامەندی جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی؛ لە فەرمانگەی ناوهاتوو ئەوانەی پێویست ناكات بانگ بكرێت بەبێ ئامادەبوونیان و ئەوانەی پێویستە بانگ بكرێن بە ئامادە بوونیان بە سیفەتی دادگای پێداچوونەوە دادگایی كراون، لە مێژووی ٢٠ رەبیعی یەكەم ٣١١ نووسراوی بە بریار لە ئەنجوومەنی بریكارەكان خوێندنەوەی بۆ كراوە، داواكاری نێردراو بە پێداچوونەوە خوێندنەوە و وردبینی بۆ كراوە، ئەو بریارە نیزامیانەی كە رێكخراوە، تێدا دەركەوتووە، بۆ جێبەجێ كردن و ئەنجامدانی نووسراو و نووسراوی بە بریاری باسكراو هاوپێچ بۆ دەوڵەت نێردراوە، بە بریارێك مامەڵەكە جێبەجێ دەكرێت، نووسراوی نووسراو ژمارەی لەسەر تۆمار كرا ئەفەندم.<br>لە ٢ سەفەر ٣١٢ لە ٢٤ تەممووز ٣١٠<br>سەدری ئەعزەم و هاوكارەكەی</td></tr>
</table>



| 27 ڕەبیعی کۆتایی 1312 | 00300.00069 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٧ ڕەبیعی کۆتایی ٣١٢
١٥ تشرینی یەکەم ٣١٠
بۆ جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
لـە ئامـاژەی ویلایەتـی قۆنیـا دەرکەوتـووە لەبـەر خراپـی بـارودۆخ و بەڕێوەبردنـی کارگێـری هەروەهـا بەرتیـل وەرگرتـن، خاڵـس ئەفەنـدی قائیمقامـی قـەزای ئاقسـەرای دوور بخرێتـەوە و لـە شـوێن ئـەو سـاڵح سـالم ئەفەنـدی دابمەزرێـت کـە خـۆی بەڕێوەبـەری تۆمـاری سـانجەقی سـلێمانییە و دەرچـووی مەکتەبـی مولکیـەی شـاهانەیە، کـە ناوبـراو خـودی خـۆی داوای کـردووە لـە قائیمقامیەتێـك دابمەزرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لـە قۆمیسـیۆنی هەڵبژاردنـی فەرمانبـەران نـووسراو کـراوە و هاوپێـچ پێشـکەش کـراوە، بـە هاتنـی فەرمانی پاشـا سـوێندخواردنەکەی جێبەجـێ دەکرێـت، بـۆ جێبەجـێ کردنـی کارەکـەش بـە یارمەتـی جەنابـی پەیوەندیـداری وەکالـەت دەبێـت.



DH.MKT.00310.00023.001

| 7 جەمادی یەکەم 1312 | 00310.00023 | DH.MKT. |
|---|---|---|

نەزارەتی داد و مەزهەبەکان
بەڕێوەبەرایەتی تۆماری فەرمانبەران
ژمارە ١٧٨
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی میری میرانی ئەفەندم
پروپاگەنـدەی ئـەوە کـراوە کـە مستەفا ئاغا فەرمانبـەری پۆلیسـی پاراسـتنی قـەزای مەرگـەی سـەر بـە سـانجەقی سـلێمانی لەگـەڵ چـاوش کەریـم پێچەوانـەی یاسـا مامەڵەیـان کـردووە، بۆیـە لێکۆڵینـەوە کـراوە، کاغەزەکانـی لێکۆڵینەوەکـەش بـۆ پشـکێنەری دادی بەغـداد نێـردراوە، لـە بەڕێوەبەرایەتـی کاروبـاری سـزا ووردبینـی بـۆ کـراوە، بـە تاوانـی یاسـا و تاوانـکاری تۆمەتبـار کـراون، بـە بەڵگـە و هەواڵـی یاسـایی ئاشـکرا کـراوە، کـە ئـەو ئافرەتـەی دەسـتی بەسـەرداگیراوە بـە نـاوی شـێخە سـوفیگەر بەهـۆی برینەکەیـەوە نەسـاغ بـووە، لەلایـەن پزیشـکەوە راپۆرتـی لەسـەر نـووسراوە، دواتـر بـە مەبەسـتی تیمارکـردن شـێخەی ناوهاتـوو لەلایـەن مسـتەفا ئاغـا و کەریـم چـاوش ئـازاد کـراوە، جگـە لەمـە بـە تێروانیـن لـە ئەرکـی ناوبـراوان دەخرێنـە ژێـر دادگاوە، بـۆ ئەمـەش بـە نـووسراو نەزارەتەکانـی جەلیلـە ئـاگادار کراونەتـەوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ٧ جەمـادی یەکـەم ٣١٢ و لـە ٢٥ تشرینـی یەکـەم ٣١٠.
نازری داد



Y.A.HUS.00317.00067.001

| Y.A.HUS. | 00317.00067 | 24 رەجەب 1312 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
... دیوانی هومایۆن
٢٨٤٦
لــە نێــوان ســەید محەمــەد ئەفەنــدی موفتــی پێشــووی ســانجەقی ســلێمانی و شــێخ ســەعید ئەفەنــدی نەقیــب ناكۆكــی هەیــە، بــۆ ئــەوەی ئەوانــە بهێنرێنــە موســڵ و نێوانیــان ئاشــت بكرێتــەوە، ئەمــر و فەرمانــی هومایۆنــی جەنابــی پەیوەندیدارانــی خەلافــەت بــۆ ویلایەتــی موســڵ نــووسراوە، لەســەر ئــەم نووسراوەیــە ئەمجــارە لــە وەڵام تەلەگرافنامــە وەرگیــراوە بــە ڕۆیشــتنی ئەمانــە بــۆ موســڵ ئــەو جموجۆڵــەی كــە هەیانــە كۆتایــی پــێ دێــت و نێوانیــان ئاشــت دەبێتــەوە و پاشــای شــاهانەش تەمەنــای ئاشــت بوونەوەیــان دەكات.
لە ٢٤ رەجەب ١٣١٢ و لە ٩ كانوونی دووەم ١٣١٠
سەدری ئەعزەم و یاوەری

لــە بــارەی ناوبــراوان، ئــەو ڕووداو و بارودۆخانــە ڕوو نــەدات كــە ببێتــە هــۆی ســوكایەتی كــردن و دڵ ڕەنجاندنیــان، بــە شــێوەیەكی بــاش نێوانیــان ئاشــت بكرێتــەوە، ئەمــەش بــە وەڵام لە عالیــەوە ڕاگەیەنــدراوە، لــە ٢٦ رەجــەب ١٣١٢.



| DH.MKT. | 00327.00031 | 5 رەجەب 1312 |
|---|---|---|

٥ رەجەب ٣١٢
٢١ کانوونی یەکەم ٣١٠
بۆ بریکاری سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی جەلیلە

سەعید بەگ کە بەرێوەبەری نووسینی سانجەقی سلێمانی بووە دواتر بۆ قائیمقامیەتی قەزای زاخۆ گوازراوەتەوە، بەڵام ئەرکەکەی پەسەند نەکراوە، لە قائیمقامیەتی ناوهاتووش مووچەکەی بە تەواوی و بێ کەموکوری وەرگرتووە، نیوەی مووچەکەی ٧٠٠٠ قوروش گەڕێندراوەتەوە، لەسەر هەندێك ووتە و داواکاری هەروەها ئەو داواکاریەی کە ناردوویەتی، لەگەڵ هاوپێچەکانی نێردراوە، لە بارەی دامەزراندنی لە قائیمقامیەت بە ئاماژەی قۆمیسیۆن پاڵپشتی لێ نەکراوە، لەسەر نووسراوی عالی لە ٣٠ تشرینی دووەم ٣١٠ ژمارە ٩٥ سەعید بەگ لە بەرێوەبەرایەتی نووسینی سانجەقی سلێمانی لێبووردراوە و لێهاتووشی راست و دروستە و ئەگەرچی لە بریارنامەی ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی موسڵ لە مێژووی ٤ تشرینی یەکەم ٣٠٦ ژمارە ٦٠ لە قائیمقامیەتی زاخۆ ئاماژە بە جێبەجێ کردنی ئەرکەکەی کراوە، بەڵام لە هەڵبژێردراوەکان نییە، بۆیە رەت کراوەتەوە و لە کاتی حەواڵە کردنی لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران گفتوگۆی لەسەر کراوە و وێنەیەکی بریارنامەی باسکراو نێردراوە، کاغەزە هاوپێچەکانی دەنێردرێتەوە.



| 26 رەجەب 1312 | 00336.00035 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٦ رەجەب ١٣١٢
١١ کانوونی دووەم ١٣١٠
جەنابی عالی لە سەدارەتپەناهیمان
لەلایەن جەنابی رەئوف پاشا موتەسەرفی پێشووی سانجەقی سلێمانی داواکاری پێشکەش کراوە و داوای رەزامەندی کردووە تاوەکو لەگەڵ ئەمانەتی هومایۆن (پارە و دیاری سوڵتانە کە بۆ مەککە دابینی کردووە) جولە بکات و بروات، داواکاریەکە هاوپێچ پێشکەش کراوە، بە فەرمانی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەتپەناهیمان جێبەجێ دەکرێت.



| 5 شەعبان 1312 | 00339.00016 | DH.MKT. |
|---|---|---|
| ٥ شەعبان ١٣١٢<br>١٩ کانوونی دووەم ١٣١٠<br>بۆ ویلایەتی موسڵی جەلیلە<br>بەهـۆی ئـەم خزمەتانـەی کـە محەمـەد ڕەشـید ئەفەنـدی ئەندامـی ئەنجوومەنـی کارگێـری سـانجەقی سـلێمانی لـە پێشـوودا ئەنجامـی داون، داواکـراوە پلـەی پـێ بدرێـت، داواکاری و هاوپێچەکـەی بـۆ ویلایـەت نێـردراوە. | | |


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

DH.MKT 352/83

DH.MKT.00352.00083.001

<table>
<tr><td>30 رەجەب 1312</td><td>00352.00083</td><td>DH.MKT.</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی تۆمار<br>ژمارە ٢٠٣<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>راسم پاشا لە میری لیواکانی لەشکری شەشەمی هومایۆن، لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانییە، پاشا میهرەبانی نواندووە، کەچی تا ئێستا لە پلەی سێیەم پارچەیەك نیشانی عوسمانی نەهاتووە، لە کاتی خۆیدا ناوەکەی بە سلێمان پاشا نووسرابووەوە، بەهۆی ئەم هەڵەیەوە نێردراوەتەوە، نووسراو لە پاشای ناوبراوەوە هاتووە، تێدا ئاماژەی پێکراوە راست بکرێتەوە و نیشانی ناوهاتووش بنێردرێت، ئەمەش بە هاوکاری پەیوەندیدارانی نەزارەتی جەلیلە دەبێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>لە ٣٠ رەجەب ١٣١٢ و لە ١٣ کانوونی دووەم ١٣١٠<br>مۆری والی موسڵ</td></tr>
</table>



| DH.MKT. | 00364.00001 | 21 شەوال 1312 |
|---|---|---|

٢١ شەوال ١٣١٢
٤ نیسان ١٣١١
بۆ جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەتمان
لـە سـانجەقی سـلێمانی، بەهـۆی ئەو خزمەتە باشـانەی کە سـاڵح سـالم ئەفەندی ئەنجامـی داوە، پلەکەی بۆ سـێیەم و عەبدوڵلا ئەفەندی .... و ساڵح ئەفەندی فەرمانبەری نووسراوەکان و جەودەت ئەفەندی کاتیبی ئەنجوومەنی کارگێری بـە پلەیەکـی گونجـاو ڕێزیـان لـێ بگیرێـت، ئـەو نووسراوانـەی لـە ویلایەتـی موسـڵ هاتـووە، هاوپێچ لەگـەڵ تۆماری ناسـنامە بەیەکـەوە پێشـکەش کـراوە، هەروەها لە کۆتاییدا سـاڵح سـالم ئەفەندی لـە ویلایەتی قۆنیا لـە قائیمقامیەتی قـەزای ئاقسـەرای دامـەزراوە، ئەگەرچـی بـە گونجـاو زانـراوە ناوبـراو بـە پلـەی سـێیەم و ئەوانـی تـر بـە وەرگرتنـی پلـەی چـوارەم ڕێزیـان لـێ بگیرێـت، بـەڵام جێبەجێ کردنـی لەسـەر ڕەزامەنـدی پەیوەندیدارانـی وەکالەت وەسـتاوە.



| 20 زیلقەعدە 1312 | 00375.00057 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٠ زیلقەعدە ١٣١٢
٣ مایس ١٣١١
بۆ جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
لەبەر ئەو خزمەتە باشەی کە سەید ئەحمەد ئەفەندی سەرۆکی شارەوانی سانجەقی سلێمانی کردوویەتی، پلەکەی لە پلەی سێیەم بۆ پلەی دووەم بەرز بۆتەوە، لە بارەی ئەو رێزگرتنە نووسراوی مێژووی ٣٠ مارت ١٣١١ لە ویلایەتی موسڵ هاتـووە، لەگەڵ پۆسـتە بەیەکەوە پێشـکەش کراوە، ئەمەش بـە هاوکاری جەنابی پەیوەندیدارانـی وەکالەتەوە دەبێت.



OSMANLI ARŞİVİ
BEO
378 | 28314

BEO.000378.028314.001

<table dir="rtl">
<tr><th>BEO.</th><th>000378.028314</th><th>30 رەمەزان 1312</th></tr>
<tr><td colspan="3">١٥ مارت ١٣١١<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>لە ١٠ مارت ١٣١٠ بۆ رێکخستن و گواستنەوەی کەرستەی سەربازی، پارەوپولی سانجەقی سلێمانی بەشی نەکردووە، بۆیە مامەڵەی پێویست ئەنجام بدرێت تا برێکی گونجاو حەواڵەی سانجەقێکی تر بکرێت، هەروەها بۆ ئەو سەربازانەی کە لە گولعەنبەرن، ئاگاداری دراوەتە لایەنی سەر عەسکەر.</td></tr>
</table>



| 9 زيلحيجه 1312 | 00381.00063 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٩ زيلحيجه ١٣١٢
٢١ مايس ١٣١١
بۆ نەزارەتی دەرەوەی جەلیلە
لە ناو سانجەقی سلێمانی، گوندی سیاهگۆز کە یەکێکە لە گوندەکانی ناحیەی قزلجە و دەکەوێتە سەر سنوور، لەگەڵ چەند گوندێکی دەوروبەری، لەلایەن حاکمی بانە فەراخ خانی مەمالیکی ئیران پەلامار دراوە و تالان کراوە، خانەی ئەحمەد بەگی دانیشتووی گوندی ناوهاتووی سوتاندووە، لەم بارەیەوە لە ویلایەتی موسڵی جەلیلە لە مێژووی ١٠ مایس ١٣١١ تەلەگرافنامە دەرچووە، وێنەیەکی بۆ پەیوەندیدارانی نەزارەت نێردراوە، پەلە بکرێت لە جێبەجێ کردنی ئەم کارە.



| BEO. | 000447.033520 | 28 موحەررەم 1312 |
|---|---|---|

٢٨ موحەررەم ٣١٢

نەزارەتی دارایی جەلیلە

لە ناو قەزای گولعەنبەری سەر بە سانجەقی سلێمانی و لەسەر سنووری ئێران ناوچەکانی تەوێلە و بەیارە و پێنچوین، تایبەت بە تەریقەتی نەقشبەندی دوو تەکیە و دوو مەدرەسە هەیە، بۆ خۆراکی ئەمانە بڕێکی گونجاو مووچە دابین بکرێت، لەسەر ئاماژەی ویلایەتی موسڵی جەلیلە دوای گفتوگۆ لە وەڵامدا نووسراو لە مێژووی ٧ حوزەیران ٣١٠ ژمارە ٤٥٠ هاتووە، تێدا ئاماژەی پێکردووە ناوە ناوە لە مووچەی دەستکورتان مووچە بێ خاوەن دەبێت، بە فەرمانی پاشای پەیوەندیداری خەلافەتیش ئەم مووچەیە بەش ناکات و هەروەها دابین کردنی مووچە بە بێ شوێنگرەوەی مووچەکە بە فەرمانی پاشا قەدەغەیە، بۆیە ئاماژەی پێکراوە کە ناکرێت جێبەجێ بکرێت، لە وەڵامدا ئاگاداری دراوەتە ویلایەتی ناوهاتوو، کە لە ناوچەی تەوێلە لە تەکیەی شێخ عەلی ئەفەندی تایبەت بە تەریقەتی نەقشبەندی بەردەوام خۆراك دەدرێتە هەژاران و وانە بە فێرخوازان دەووترێتەوە، کەچی بۆ ڕۆژێکیش بێت داهات بۆ ئەم تەکیەیە دابین نەکراوە، هەروەها لەبەر خزمەت و کارە خێرخوازییەکانی ئەفەندی ناوهاتوو، ئەمجارە بۆ دووپاتکردنەوە نووسراو لەگەڵ نووسراوەکانی مێژووی ١٨ حوزەیران ٣١٠ ژمارە ١٠ بەیەکەوە بۆ لایەنی پایەبەرز نێردراوە، بە تێروانین لە وێنەی ئاماژەپێکردنەکە دەرکەوتووە دابینکردنی خۆراك لە پێویستە گرنگەکانە، لە مووچەی دەستکورتان مووچەیەکی بێ خاوەن بدۆزرێتەوە و هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

بە ئاماژەی راوێژکار




<table>
<tr><td>BEO.</td><td>000462.034596</td><td>19 سەفەر 1312</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٩ سەفەر ١٣١٢<br>١٣ ئۆغستۆس ١٣١٠<br>بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>لە ناحیەی قەرەداغی سەر بە سانجەقی سلێمانی، تەکیەی شێخ رەسول ئەفەندی هەیە، کە لە سەیدەکانی بەرزنجییە، ئەم تەکیەیەش داهاتێکی نییە بۆ ئەوەی بژێوی هەژار و دەروێش و خێزانی خەڵکەکە و کارگێریەکەی پێ مسۆگەر بکات، هەروەها خۆشی شایانی بەزەییە و لە نزاکەرەکانە، بۆیە مووچەیەکی گونجاوی بۆ دابین بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش لە ویلایەتی موسڵ نووسراو نێردراوە، لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە لە مێژووی ١٧ سەفەر ١٣١٢ ژمارە ١٧٧٠ بەیەکەوە بۆ عالی نێردراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.<br><br>بە ئاماژەی کاغەزەکانی بەرێوەبەرایەتی</td></tr>
</table>


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
472 35372 2

BEO.000472.035372.002

| 27 سەفەر 1312 | 000472.035372 | BEO. |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ١٨٩٣
بۆ جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەیە
لەبەر ئەو کارە باشانەی کە ئەحمەد ئەفەندی سەرۆکی شارەوانی سانجەقی سلێمانی ئەنجامی داوە، بە پلەی سێیەم پاداشت بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە نووسراوی ویلایەتی موسڵ لە مێژووی ٢ کانوونی یەکەم ١٣٠٩ و ١١ حوزەیران ١٣١٠ هاتووە و لەگەڵ نووسراوی بەندەمان بەیەکەوە پێشکەش کراوە، بۆ دووپاتکردنەوە ئەمجارە لە ویلایەتی ناوهاتووەوە نووسراو لە مێژووی ٣١ حوزەیران هەمان ساڵ ژمارە ٥٢ پێشکەشی تۆماری زانیاری کەسێتی کراوە، جێبەجێ کردنی بە هاوکاری پەیوەندیدارانی سەدارەتەوە دەبێت، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢٧ سەفەر ١٣١٢ و لە ١٧ ئۆغستۆس ١٣١٠
نازری کاروباری ناوەخۆ


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
481 32040

BEO.000481.036040.001

| 22 ڕەبیعی یەکەم 1312 | 000481.036040 | BEO. |
|---|---|---|

٢٢ ڕەبیعی یەکەم ١٣١٢
١١ ئەیلوول ١٣١٠
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
حەسەن نەورەسی ئەفەندی لە سەرۆکایەتی شارەوانی سلێمانی جیابۆتەوە و شوێنەکەی بە کراوەیی ماوەتەوە، هەروەها کاتی خۆی لە سانجەقی سلێمانی لە بەڕێوەبەرایەتی تۆمارکردن ئەرکی هەبووە، بۆیە هەر لەم ئەرکە دامەزرێتەوە، بۆ ئەمەش فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی و بە نووسراوی تایبەتی مابەینی هومایۆنی ملوکانەی باش کیتابەتی جەلیلە ئاماژەی پێکراوە، بە ئەمر و فەرمانی هومایۆن هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



BEO.000511.038300.001

| BEO. | 000511.038300 | 6 جەمادی یەکەم 1312 |
|---|---|---|

٦ جەمادی یەکەم ١٣١٢
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
خاڵس ئەفەندی قائیمقامی قەزای ئاقسەرای لە بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەت خراپە، بۆیە بە ئاماژەی ویلایەت دوورخراوەتەوە، لە شوێن ئەو ساڵح سالم ئەفەندی بەڕێوەبەری تۆماری سانجەقی سلێمانی، کە لە دەرچووانی مولکیەی شاهانەیە، دوای سوێند خواردن دادەمەزرێت، نووسراوی مێژووی ٢٧ ڕەبیعی کۆتایی ١٣١٢ ژمارە ٢٧١٠ ڕەزامەندی داوە و لە مێژووی ٤ جەمادی یەکەم ١٣١٢ جەنابی خەلافەتپەناهی بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.


مکتوبی صدر عالی قلمی مسودهٔ مخصوص ورقه‌در

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
541 40513

| 26 جەمادی کۆتایی 1312 | 000541.040513 | BEO. |
|---|---|---|

٢٦ جەمادی کۆتایی ٣١٢
١٤ کانوونی یەکەم ٣١٠
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
لـە سـانجەقی سـلێمانی تەنگـژەی دارایـی زیـادی کـردووە، بۆیـە کارگێـری سـەربازی بـە تەواوەتـی تێکچـووە، هەروەهـا جێبەجـێ کردنـی هـاوکاری لـە مەرکـەزی ویلایـەت بۆتـە مەحـاڵ، لەبـەر پێویسـتی کـەم کردنـەوەی حەواڵـەی سـەربازی لەسـەر تەلەگرافنامـەی ویلایەتـی موسـڵی جەلیلـە لـە مێـژووی ٢١ جەمـادی کۆتایـی ٣١٢ بـۆ نەزارەتـی جەلیلـە نووسراوەتـەوە کـە کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت و رابگەیەندرێـت، لایەنـی دارایـی ویلایەتـی ناوهاتـوو خراپـە و لەبـەر بەشـنەکردنی کارگێـری سـەربازیش تووشـی کێشـە بـووە، تەنگژەی ئێسـتاشـی گەیشـتۆتە ئاسـتێکی بـەرز، بۆیـە بەپەلـە داهاتـی سـەربازی رێـك بخرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش نـووسراوی سـەر عەسـکەری عالـی لـە مێـژووی ٢٥ جەمـادی کۆتایـی ٣١٢ ژمـارە ٧٠٧ نێـردراوە هەروەهـا بـە تێروانیـن لـە ئامـاژەی پێشـوو بەپەلـە جێبەجـێ بکرێـت و هیممـەت بکرێـت لـە راگەیاندنـی، جگـە لەمـە بگەرێندرێتـەوە نەزارەتـی ناوهاتـوو.



| 16 رەجەب 1312 | 000551.041277 | BEO. |
|---|---|---|

١٦ رەجەب ١٣١٢
٢ کانوونی دووەم ١٣١٠
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
بـۆ چاکسـازی کاروبـاری ژمێریـاری سـانجەقی سـلێمانی، لەلایـەن خەزینـەوە فەرمانبەرێـك دەنێردرێـت، لەوێـش ئـەوەی پەیوەسـتە بـە حەواڵـەکاری سـەربازیش کەسـێکی تـر بنێردرێـت، بـە گوێـرەی ئـەو نووسراوانـەی کـە لـە ویلایەتـی موسـڵ نێـردراوە، بـە ناردنـی هـەواڵ مامەڵـەی دارایـی و ژمێریـاری لـە دەفتەرداریەتـی داواکـراوە، دوای هاتنـی ئـەو لیسـتە سـەیر دەکرێـت، ئـەو وەڵامـەی کـە لـە لەلایەنـی دەوڵـەت وەرگیـراوە ئـەوا بـە ویلایەتـی ناوهاتـوو راگەیەنـدراوە، ئـەو لیسـتەی کـە لـە دەفتەرداریەتـی بـۆ نەزارەتـی جەلیلـە نێـردراوە، وێنەیەکـی هاوپێـچ لەگـەڵ وەڵامـی مێـژووی ١١ جەمـادی کۆتایـی ١٣١٢ ژمـارە ٣٢ی ویلایەتـی ناوهاتـووە هاتـووە و بـۆ لایەنـی پەیوەندیـدار نێـردراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی و راگەیاندنـی.



| 20 رەمەزان 1312 | 000586.043936 | BEO. |
|---|---|---|

٢٠ رەمەزان ١٣١٢
٥ مارت ١٣١١
نەزارەتی دارایی جەلیلە
بـۆ مووچـەی چـوار تابـوری سـەربازی شـاهانەی سـانجەقی سـلێمانی داهاتـی سـانجەقی ناوهاتـوو بەشـی دەرماڵـەی ٦ مانـگ نـاکات، زۆر بـە پێویسـت زانـراوە کـە ٦ مانگـی تریـش زیـاد بکرێـت و بخرێتـە سـەر دەرماڵەکـە، لەلایەکـی تـر سـانجەقی کەرکـوك لەگـەڵ مەرکـەزی ویلایـەت تەنگـژەی دارایـی هەیـە، گەیشـتۆتە پلـەی کۆتایـی، بۆیـە دەرماڵـەی ٦ مانگـی سـەربازی شـاهانەی ویلایـەت بـۆ ویلایەتێکـی تـر بگوازرێتـەوە، بـەم هەژمـار کردنـە چەنـد سـەد هـەزار قوروشـێك زیـاد دەبێـت و دەگاتـە دەسـت، ئـەو تەلەگرافنامـەی لـە ویلایەتـی موسـڵ وەرگیـراوە لەگـەڵ نـووسراوی مێـژووی ٢٢ رەجـەب ١٣١٢ هەروەهـا بـۆ رێکخسـتنی کارگێـری سـەربازی شـاهانەی سـلێمانی؛ پێویسـتە پـارە قـەرز بکرێـت، لـە کۆتاییـدا ئـەو تەلەگرافنامانـەی لـە مێـژووی جیـاوازدا هاتـووە ئامـاژەی پێکـراوە، تەلەگرافنامـەی ئەنجوومەنـی کارگێـری لیـوای ناوهاتـوو لـە مێـژووی ٣ مـارت ١٣١١ بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، کـە تێـدا روون کراوەتـەوە؛ داهاتـی ناوخـۆ لەگـەڵ خەرجیەکـەی یەکسـان نیـن و جیـاوازی لـە برەکەیانـدا هەیـە، سـاڵانە ١٨٠٠٠ لیـرە بوونـی هەیـە، مووچـەی مولکیـە و سـەربازی ٦ مانگـی پێشـوو تەنانـەت مانگـی رەمەزانـی شـەریفەش دابیـن نەکـراوە، تەنگـژەی دارایـی گەیشـتۆتە پلەیـەك لەوانەیـە ببێتـە ئەگـەری سـەرهەڵدانی سـەرپێچی و ئـاژاوە، بۆیـە بەپەلـە ٧٠٠٠ تـا ٨٠٠٠ لیـرە حەواڵـە بکرێـت و بگاتـە شـوێنەکە، هەروەهـا بـۆ رێکخسـتنی کارگێـری لیواکـە ئامـادەکاری پێویسـت بکرێـت و هـە رچـی زووە جێبەجـێ بکرێـت، جگـە لەمـە لەسـەر ئامـاژەی پێشـووی ویلایـەت لـە ریزبەنـدی تەلەگرافنامەکـە دەردەکەوێـت، پێویسـتە بەبـێ دواکەوتـن جێبەجـێ بکرێـت، پەلـەش بکرێـت لـە راگەیاندنـی، هیممـەت بکرێـت لـە ناردنـەوەی تەلەگرافنامەکە.



| 8 موحەررەم 1313 | 00391.00075 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٨ موحەررەم ٣١٣
١٩ حوزەیران ٣١١
بۆ ویلایەتی موسڵی جەلیلە
لە بنەچەی پێغەمبەر سەید ئەحمەد ئەفەندی لە سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی قائیمقامە و ئەرکەکەی بە ڕێکوپێکی بەڕێوە دەبات، کەچی کەسێك بە ناوی حەفید شێخ مستەفا ئەفەندی خۆی وەکو قائیمقام ناساندووە و پێچەوانەی نیزام لە ئەنجوومەنی کارگێری لیوا لەگەڵ چینی ئەندامانی ئاسایی کار دەکات، ئەمەش وادەکات لە نێوان سەیدەکاندا دووبەرەکی و شەڕ دروست بێت، بۆیە لەلایەن سەید و شێخەکاندا بە مۆر و واژووی جۆراوجۆر داواکاری وەرگیراوە، دوای لێکۆڵینەوە کارەکە جێبەجێ بکرێت و ئەنجامەکەی ڕابگەیەندرێت.



| 1313 موحه‌رره‌م 14 | 00393.00071 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٤ موحه‌رره‌م ٣١٣
٢٥ حوزه‌یران ٣١١
بۆ ویلایه‌تی موسڵی جه‌لیله
شێخ مسته‌فا ئه‌فه‌ندی قائیمقامی سانجه‌قی سلێمانی كه له بنه‌چه‌ی پێغه‌مبه‌ره، له‌به‌ر هه‌ندێك بارودۆخ داوا كراوه شوێنه‌كه‌ی بگۆردرێت، بۆ ئه‌م مه‌به‌سته كاغه‌زی به مۆری جیاواز له‌لایه‌ن دانیشتوانه‌وه پێشكه‌ش كراوه، جگه له‌مه به تێروانین له نووسراوه‌كان به‌په‌له دووباره لێكۆڵینه‌وه ئه‌نجام بدرێت و ئه‌نجامی لێكۆڵینه‌وه‌ش رابگه‌یه‌ندرێت، عالیش له‌م كاره شاره‌زایه.



| 24 رەبیعی یەکەم 1313 | 00427.00054 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٤ رەبیعی یەکەم ١٣١٣
٢ ئەیلوول ١٣١١
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
لـە پلـەی میـری میـران جەنابـی عەبدولرەحـمان پاشـا ئەرکەکـەی لـە موتەسـەرفیەتی ئەرغەنـی بـۆ موتەسـەرفیەتی سـانجەقی سـلێمانی گواسـتۆتەوە، خەرجـی رێگاکـەی ٥٠٢٥ قـوروش دەکات، لـە داهاتـی ناوەخـۆ پێـی دەدرێـت، ئەمـەش لـە خشـتەی خەرجیـەکان تۆمارکـراوە، بـە ووتـەی ژمێریـاری رادەگەیەندرێـت.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
670 | 50224 | 1

| 22 سەفەر 1313 | 000670.050224 | **BEO.** |
|---|---|---|

٢٢ سەفەر ٣١٣
١ ئۆغستۆس ٣١١
بۆ ویلایەتی موسڵی جەلیلە
ئەفسەر و فەرمانبەرانی مەکتەبی روشدیەی سەربازی سلێمانی ماوەی سێ مانگە مووچەیان وەرنەگرتووە، بەمەش تووشی تەنگانەیی بوونەتەوە، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە ئاگاداری لە بەڕێوەبەرایەتی تۆماری نەزارەتی مەکاتیبی سەربازی جەلیلە هاتووە، هەروەها لە نووسراوی مێژووی ٢٨ موحەررەم ٣١٣ ئاماژەی پێکراوە، کە مەکتەبی ناوهاتوو بە هەژمارکردنی پارەی حەواڵەکراوی ئەم ساڵ ٥٠٠٠ قوروش داهاتی هەبووە، ئەم مەکتەبە لە تەنگانەیەکی زۆر دایە، ئەمەش لە بەڕێوەبەرایەتی ناوهاتوو ئاگاداری دراوە، ئەمجارە لە نەزارەتی ناوهاتوو بە نووسراو ئاماژەی پێکراوە هەروەها داهاتی مەکتەبی ناوهاتوو لە مەرکەزی ویلایەت بە ڕێکی ڕێکخراوە بە تەلەگرافنامەی مێژووی ١٢ کانوونی یەکەم ٣١٠ ئاگاداری دەرچووە، تێدا دەرکەوتووە جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا کارەکە جێبەجێ دەکرێت، بۆیە بە نووسراوێکی ئەمر و فەرمانی هومایۆنی شاهانە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

بە ئاماژەی راوێژکاری عالی


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
673 | 50467 | 1

| BEO. | 000673.050467 | 1 رەبیعی یەکەم 1313 |
|---|---|---|

١ رەبیعی یەکەم ١٣١٣
١٠ ئۆغستۆس ١٣١١
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بەهـۆی ئـەم کارە چەتەییانـەی کـە سـەیدەکانی بەرزنجـی لـە سـانجەقی سـلێمانی ئەنجامیـان داوە، ئەمنیەتـی گشـتی تێکچـووە، لـە سـەرۆکەکان بابـە رەسـوڵ زادە سـەید ئەحمـەد و موفتـی زادە شـێخ سـاڵح بـە نهێنـی نامەیـان بـۆ حاکمـی ئێـران نـاردووە و داوایـان کـردووە لەسـەر سـنوور و لایەنـی مەریـوان شـوێنێکی گونجاویـان پـێ بدرێـت، هەروەهـا لـە کاتـی لێکۆڵینـەوە لـە سـەیدەکانی ناوهاتـوو ئـەو کارانـە ئەنجـام بدرێـن کـە پێویسـتە، لـەم بارەیـەوە حکوومـەت ئامـادەکاری کاریگـەر و بەپەلـە ئەنجـام بـدات، بـۆ سـەرۆکی شـەهبەندەر نـووسراو کـراوە، وینەکانیـان بـە هاوپێچـەوە لـە نەزارەتـی دەرەوەی جەلیلـە هاتـووە، لەگـەڵ نـووسراوی مێـژووی ٢٧ سـەفەر ١٣١٣ ژمـارە ٢٥١٥ بـۆ سـەروو نێـردراوە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە خوێندنـەوەی بـۆ دەکرێـت و لەسـەر ئامـاژەی سـەروو هیممـەت بکرێـت لـە ناردنـەوەی نـووسراوی ناوهاتـوو.

بە ئاماژەی راوێژکار.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
793 59452

| BEO. | 000793.059452 | 28 زیلحیجە 1313 |
|---|---|---|

٢٨ زیلحیجە ١٣١٣
٢٩ مایس ١٣١٢
نووسراو بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بە پێویست زانراوە هێڵی تەلەگراف لە قەزایەکانی مەرگە و گولعەنبەر و شەهربازاری سەر بە سانجەقی سلێمانی دابمەزرێت، خەرجیەکەشی لەلایەن نەزارەتی تەلەگراف و پۆستەی بەهیە دابین دەکرێت، بۆ ئەم مەبەستە بریار لە شورای دەوڵەت دەرچووە و بۆ ئەوەی نەزارەتی ناوهاتوو ئاگادار بکرێتەوە، لە مێژووی ١٥ زیلحیجە ١٣١٣ بۆ لایەنی دەوڵەت نووسراو کراوە، هەروەها جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا بریاری داوە کە لەگەڵ قەزا ناوهاتووەکاندا موقاتەعەی شەمامکی میری نوێ بکرێتەوە، لە دروست کردنی هێڵەکانی تەلەگرافیش هێشتا دەست بە کار نەبوونە، هەروەها ئەو ناوچانە هێشتا لە جموجوڵی سەربازی خالی نییە، بۆیە بە پێویست زانراوە پەلە بکرێت لە دروست کردنی، لە وەکالەتی ویلایەت تەلەگرافنامە لە مێژووی ٢٦ مایس ١٣١٢ بۆ والا نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە و بریاری پێشوو هەرچی زووە جێبەجێ بکرێت و بە نەزارەتی ناوهاتوو رابگەیەندرێت بە گوێرەی ئەو وەڵامەی وەردەگیرێت هیممەت بکرێت لە ناردنەوەی تەلەگرافنامەکە.


İ.DH.01328

| 11 جەمادی یەکەم 1313 | 01328.000024 | I.DH. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
.... دیوانی هومایۆن
١٠٦٩
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لەسەر ئاماژەی ویلایەتی موسڵ جەنابی جەلال پاشا موتەسەرفی کەرکووك گونجاو نییە لە ئەرکەکەی بەردەوام بێت، بۆیە دووربخرێتەوە و لە شوێن ئەو جەنابی عەبدولرەحمان پاشا موتەسەرفی سانجەقی سلێمانی دابنرێت هەروەها بۆ موتەسەرفیەتی سلێمانیش ساڵح پاشا موتەسەرفی سانجەقی چورم دابنرێت، بۆ ئەم مەبەستە نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە لە ئەنجوومەنی تایبەتی بریکارەکان دراوەتە قەڵەم، لەگەڵ بریارنامە بە هاوپێچەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا هەر چۆنێك بێت پەیوەندیدارانی خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، نووسراو نووسراویەوە ئەفەندم، لە ١١ جەمادی یەکەم ١٣١٣ و لە ١٨ تشرینی یەکەم ١٣١١.
سەدری ئەعزەم




DH.MKT.02228.00090.001

<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>02228.00090</td><td>25 رەبیعی یەکەم 1313</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٥ رەبیعی یەکەم ١٣١٣<br>٢١ تەمموز ١٣١٥<br>فەرمانـی ویلایەتـی موسـڵی عالیـە دەرچـووە و بـە راگەیاندنـی ئامـاژەی پێکـراوە، کـە غالـب پاشـا قائیمقامـی قـەزای ئادالـەر بـە فەرمانـی پاشـای جەنابـی پاشـا لـە مێـژووی ٤ رەبیعـی یەکـەم ١٣١٧ لـە موتەسـەرفیەتی سـانجەقی سـلێمانی دادەمەزرێـت، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.</td></tr>
</table>



BEO.000862.064620.002

| BEO. | 000862.064620 | 25 جەمادی یەکەم 1314 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٣٢٢٩
جەنابی لایەنی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە
خشتەی هەژماری شوباتی ساڵی ٣٠٩ ی ویلایەتی موسڵ نێردراوە، تێدا هاتووە؛ لە سلێمانی سەعید ئەفەندی شێخی تەکیەی کاك شێخ ئەحمەد ئەفەندی بەندایەتی خۆی بۆ جەنابی پەیوەندیداری خەلافەتمان راگەیاندووە، وەکو خەرجی رێگا خەرجی پێ دراوە، بە مەبەستی پەسەند کردنی ٤٣٠٠ قوروش دوو پارچە نووسراو نێردراوە، لەسەر ئەو ئاماژەیەی کە لە نووسراوی نەزارەتی دارایی جەلیلە لە مێژووی ٨ ئەیلوول ٣١٢ وەرگیراوە، دوای حەواڵەکردن لە ژمێریاری پەراوێزی لەسەر نووسراوەتەوە، تێدا نیشان دراوە، کە برە پارەی باسکراو بە تەلەگراف لە باش کیتابەتی جەلیلەی مابەینی هومایۆنی جەنابی ملوکانە راگەیەندراوە و بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا خەرج کراوە، هەروەها رێکخستنی ساڵی ٣٠٩ داخراوە، بۆیە لە موازەنەی ساڵی باسکراودا بە کراوەیی دەمێنێتەوە، هەروها رێکخستنی باسکراویش لەسەری زیاد دەکرێت، لەگەڵ ئەوەی خەرجی رێگاکە جێگیر کراوە، چۆنیەتی کارەکەش لایەنی پایەبەرز لەگەڵ نەزارەتی دارایی جەلیلە فەرمانی داوە و رایگەیاندووە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٥ جەمادی یەکەم ٣١٤ و لە ٢٠ تشرینی یەکەم ٣١٢.
نازری کاروباری ناوەخۆ




| 5 شەوال 1314 | 000916.068649 | BEO. |
|---|---|---|

٥ شەوال ١٣١٤

٢٥ شوبات ١٣١٢

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

جەنابی خەیری ئەفەندی لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی دامەزراوە، بەڵام داوای گواستنەوەی ئەرکەکەی کردووە، بۆیە رەفعەت بەگ کە لە موتەسەرفیەتی راج جیابۆتەوە، لە موتەسەرفیەتی ناوهاتوو دامەزرێت، سەبارەت بەم بابەتە لەسەر نووسراوی ١٥ شەعبان ١٣١٤ ژمارە ٤٣٤٨ ی دەوڵەت بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە، دوای مۆڵەت وەرگرتن، لە مێژووی ٢٦ رەمەزان ١٣١٤ جەنابی خەلافەتپەناهی بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.


١٨٩٦
I.DH 1341/1314.C/43
42
2
İ.DH.01341

| I.DH. | 01341.000042 | 5 جەمادی کۆتایی 1314 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
..... دیوانی هومایۆن
١٨٩٦

جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم

بـە نـووسراوی تایبەتـی پایەبـەرز راگەیەنـدراوە، کە بە فەرمانی پاشـای جەنابی پەیوەندیـداری خەلافەت بریـار دراوە، لێکۆڵینـەوە لەسـەر هـۆکار و چۆنیەتـی ئـەو جموجۆڵـە سـەربازیانە بکرێـت کـە لـە سـانجەقی سـلێمانی و بـۆ سـەر پشـدەریەکان ئەنجام دراوە، بۆ ئەم مەبەسـتەش جەنابی نەفعی ئەفەندی لە ئەندامانی قۆمیسـیۆنی تۆماری زانیاری بنێردرێـت، هەروەهـا بـۆ ناوبـراو بـە شـێوەیەکی کاتـی مووچـەی ٥٠٠٠ قـوروش و بە گوێـرەی بارودۆخەکـە خەرجی رێـگای پـێ بدرێـت، بـۆ ئەم مەبەسـتە نووسراو لـە نەزارەتـی ناوەخۆی جەلیلـە راگەیەندراوە و پێشـکەش کـراوە، لەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجێ دەکرێـت، بـەم راگەیەندراوە نـووسراو نووسرایـەوە و ژمـارەی لەسـەر تۆمـار کرا ئەفەنـدم، لە ٥ جەمادی کۆتایـی ٣١٤ و لە ٣٠ تشرینـی یەکەم ٣١٢.
سەدری ئەعزەم


I.DH 1344/1314.N/24
24
2
İ.DH.01344

| 1314 شەعبان 15 | 01344.000024 | I.DH. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٤٣٤٨
بۆ لایەنی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
ڕاگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە
جەنابی خەیری ئەفەندی لە موتەسەرفیەتی سلێمانی دامەزراو، بەڵام ڕایگەیاندووە کە بیانووی شەرعی هەیە و داواکاری ناردووە و تێدا داوای کردووە ئەرکەکەی بگوازرێتەوە شوێنێکی نزیك دەرسەعادەت، لە ئەنجام داواکاریەکەی پێشکەش کراوە............ ئەم ماوەیەکە بەهۆی نەبوونی موتەسەریف هەروەها ئاشکرایە سانجەقی سلێمانی گرنگی خۆی هەیە، نابێت ماوەیەکی دوورودرێژ بێ موتەسەرف بێت، بۆیە ناوبراو لە شوێنێکی گونجاو دامەزرێت و حاڵی حازریش بۆ خودی خۆی مووچەی دابراوانی بۆ دەبرێتەوە، لە شوێن ئەویش جەنابی عەبدولغەنی پاشا دامەزرێت کە لە سانجەقی ئەرغەنی جیابۆتەوە، یاخود ڕەفعەت بەگ کە لە موتەسەرفیەتی دەراج دابراوە لەگەڵ راسخ ئەفەندی موتەسەرفی پێشووی بایەزید، یەکێك لەوانە هەڵبژێردرێت، بە ڕاوبۆچوونی پەیوەندیداری وەکالەت کارەکە ئەنجام بدرێت، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٥ شەعبان ٣١٤ و لە ٦ کانوونی دووەم ٣١٢.
نازری کاروباری ناوەخۆ


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

خلاصهٔ اوراق

عدد اوراق

OSMANLI ARŞIVI
ŞD
2171 | 11

| ŞD. | 02171.00011 | 13 رەبیعی کۆتایی 1314 |
|---|---|---|
| پوختەی کاغەزەکان<br>١٣ رەبیعی کۆتایی ١٣١٤<br>٩ ئەیلوول ١٣١٢<br>دەستەی قەزای مەرگەی سەر بە سانجەقی سلێمانی بۆ ناحیەی پشدەر و بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی پشدەریش بۆ مەرگە بگوازرێتەوە، لەم بارەیەوە مامەڵەی ڕەزامەندی دەرچووە. | | |


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
İ.DFE 7/8

İ.DFE.00007.00008.008

<table>
<tr><td>I.DFE.</td><td>00007.00008</td><td>26 زیلقەعدە 1315</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>.... دیوانی هومایۆن<br>٣٣٤٣<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>ئیسماعیل حەقی ئەفەندی فەرمانبەری دەفتەرخاقانی سانجەقی سلێمانی دوای دەست لە کارکێشانەوەی، لە شوێن ئەو مەحمود ئەفەندی فەرمانبەری دەفتەرخاقانی سانجەقی حوران هەروەها لە شوێن ئەویش محەمەد حوسەینی ئەفەندی فەرمانبەری پێشوو دامەزرێن، بۆ دەست کردن بە ئەرکەکەیان نووسراوی نەزارەتی دەفتەرخاقانی جەلیلە لەگەڵ بریارنامەی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە رێکخراوە بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا هەر چۆنێك بێت جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نوسراو نووسرایەوە و ژمارەی لەسەر تۆمار کرا ئەفەندم، لە ٢٦ زیلقەعدە ٣١٥ و لە ٦ نیسان ٣١٤.<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>

T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

DH.ŞFR.00223.00130.001

| DH.ŞFR. | 00223.00130 | 16 زيلحيجه 1315 |
|---|---|---|

- ٢٦ نیسان ١٣١٤
له موسڵەوە بۆ دەرسەعادەت
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لەبەر ئەوەی ئیدارەی سانجەقی سلێمانی بە خراپی بەڕێوەدەبردرێت ئەمنیەتی تێکچووە و گشت مامەڵەکان دواکەوتوون، بۆیە لەلایەنی سەربازیشەوە بەردەوام سکاڵا بەرز دەکرێتەوە، لەم حاڵەتەدا سەیدەکانی بەرزنجی وەکو جاران سەرپێچیەکانیان فراوان کردووە، لەسەر ئەم راگەیەندراوانەی کە دەرچووە رەفعەت ئەفەندی موتەسەرفی لیوا دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەو کەسێکی گونجاو و لێهاتوو دابمەزرێت و رەوان بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە مامەڵەکە بە پەلە ئەنجام بدرێت، راگەیەندراوە فەرمان، لە ٢٦ نیسان ١٣١٤.
عەبدولوەهاب والی موسڵ

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
965 72344



| BEO. | 000965.072344 | 14 موحەررەم 1315 |
|---|---|---|

١٤ موحەررەم ١٣١٥
٣ مایس ١٣١٣
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی خەیری ئەفەندی کە لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی جیابۆتەوە، لە موتەسەرفیەتی سانجەقی خەمسی دامەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر نووسراوی دەوڵەت کە لە مێژووی ٢٢ زیلحیجە ١٣١٤ ژمارە ٩٨٠ بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە دوای مۆڵەتدان، لە مێژووی ١٢ موحەررەم ١٣١٥ جەنابی خەلافەتپەناهی بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، هەروەها قۆمیسیۆنی ناوهاتوو وێنەی بریارنامەکەی بۆ دەوڵەت ناردووە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



BEO.000974.073039.002

| BEO. | 000974.073039 | 28 موحەررەم 1315 |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی ئاوقافی هومایۆن
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٢٥٤
بۆ جەنابی پەیوەندیدارانی سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە
لە ناو سانجەقی سلێمانی کە مەرکەزی قەزای مەعمورەی حەمیدیەیە، لە گوندی قەڵای ویزە مزگەوتێك دروست کراوە، بۆ ووتارخوێنی مزگەوتەکە محەمەد ئەفەندی زانا دامەزراوە، بۆ ئەم مەبەستە لە ویلایەتی موسڵ نووسراو نێردراوە، لەگەڵ راگەیەندراوی عالی بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە نووسراوی سەدری ئەعزەمی پەیوەندیدارانی سەدارەت لە مێژووی ٢٣ نیسان ١٣١٣ ژمارە ٨٧ هاتووە و لە ئەنجوومەنی کارگێری حەواڵەی ئاوقاف کراوە، لە بارەی دووبارە دروست کرن و بونیادنانی ئەم جۆرە مزگەوتانە لە بودجەی خەزینەی ئاوقاف بۆ یەك رۆژیش بێت شوێنگرەوەی نییە، لەبەر ئەوەی لە داهاتی وەقفێك خەرج کردنی ئاقچەی مەرجداری تر بە نیزام و شەرع رێگە پێدراو نییە و لە خەزینەش هیچ چارەسەرێکی تر نەدۆزراوەتەوە، بۆیە لە ناوەخۆ شوێنگرەوەی بۆ بدۆزرێتەوە و وەقف و تۆمار بکرێت، لە وەڵامدا بە جەنابی سەدری ئەعزەم و پەیوەندیدارانی سەدارەت راگەیەندراوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢٨ موحەررەم ١٣١٥ و لە ١٧ حوزەیران ١٣١٣
نازری ئاوقافی هومایۆن



| 6 شەعبان 1315 | 001061.079553 | BEO. |
| --- | --- | --- |

٦ شەعبان ١٣١٥
١٨ کانوونی یەکەم ١٣١٣
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
هاوپێچی نووسراوی مێژووی ١١ جەمادی کۆتایی ١٣١٥یە، لە شارۆچکەی قەرەداغی سەر بە سانجەقی سلێمانی خەریکە مووچەیەك بە بڕی ٢٥٠ قوروش بۆ شێخ عەبدوللەتیف ئەفەندی زادە شێخ جەلالەددین ئەفەندی پۆست نشینی تەکیە دابین دەکرێت، مامەڵەکە لە ویلایەتی موسڵ کۆتایی پێهاتووە، لەلایەن ناوبراویشەوە داواکاری دراوەتە نەزارەتی ناوخۆی جەلیلە، لە نەزارەتی ناوهاتووەوە لەگەڵ نووسراوی مێژووی ٢٩ ڕەجەب ١٣١٥ ژمارە ٣٨٤٦ بەیەکەوە بۆ دەوڵەت نێردراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



| 1315 موحەررەم 11 | 01347.000016 | I.DH. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
... دیوانی هومایۆن
٨٢
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
ئەمجارە خەیری ئەفەندی لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی جیابۆتەوە و لە موتەسەرفیەتی سانجەقی خمس دامەزراوە، دوای بەبیر هێنانەوە بریارنامەش لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە ڕێکخراوە لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو نووسرایەوە ئەفەندم.
لە ١١ موحەررەم ١٣١٥ و لە ٣١ مایس ١٣١٣
سەدری ئەعزەم




İ.DFE.00007.00018.006

| I.DFE. | 00007.00018 | 4 سەفەر 1316 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
.... دیوانی هومایۆن
٣٤٠
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
کەمال ئەفەندی فەرمانبەری دەفتەرخاقانی سانجەقی لازستان بە مۆڵەت لە دەرسەعادەتە، رایگەیاندووە ناتوانێت بگەڕێتەوە سەر کارەکەی، بۆیە لابدرێت و لە شوێن ئەو ئیسماعیل حەقی ئەفەندی دابنرێت، ناوبراو فەرمانبەری دەفتەرخاقانی سانجەقی سلێمانی بووە و لە ئەرکەکەی لێبووردراوە، بۆ ئەم مەبەستە بریارنامەی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی دەفتەرخاقانی جەلیلە بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بەم راگەیەندراوە نووسراو نووسرایەوە و ژمارەی لەسەر تۆمار کرا ئەفەندم.
لە ٤ سەفەر ٣١٦ و لە ١١ حوزەیران ٣١٤
سەدری ئەعزەم



| 11 شەعبان 1316 | 00032.00018 | I.AZN. |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
.... دیوانی هومایۆن
٢٤٧٥
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لـە سـانجەقی سـلێمانی ئەسـعەد ئەفەندی بـە یاریـدەدەری داواکاری گشـتی دامـەزراوە، رایگەیاندووە لەبـەر هەندێك زوڵـم و خیانەتـەوە ناتوانێـت بچێتـە شـوێنی کارەکـەی، بۆیـە لە داهاتـوو لە شـوێنێکی گونجاوتـر دادەمەزرێـت، دوای دوور خسـتنەوەی ناوبراویـش، لـە شـوێن ئـەو حەمـزە ئەفەنـدی دەرچـووی مەکتەبـی مافەکانـی شـاهانە سـوێندی یاسایی دەخـوات و دەسـت بـە کاردەبێـت، لە بـارەی ئەم دامەزراندنـەوە بریارنامە لـە ئەنجوومەنـی دادی هەڵبژاردنی فەرمانبـەران رێکخـراوە و لەگـەڵ کاغـەزی روون کردنـەوە و نـووسراوی نەزارەتـی دادی جەلیلـە راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی نـوسراو نووسرایـەوە ئەفەنـدم، لـە ١١ شـەعبان ١٣١٦ و لـە ١٣ کانوونـی یەکـەم ١٣١٤.
سەدری ئەعزەم


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1130 84681

| 2 موحەرەم 1316 | 001130.084681 | BEO. |
|---|---|---|

٢ موحەررەم ٣١٦
١١ مایس ٣١٤
نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بەهۆی ئەو سکاڵا و قسەوباسەی لەسەر رەفعەت ئەفەندی موتەسەرفی سانجەقی سلێمانی هەیە، لە کارەکەی دوور خراوەتەوە و لە شوێن ئەو عەبدوڵلا پاشا دیرەلی دامەزرێت، لەم بارەیەوە نووسراوی مێژووی ٢٢ زیلقەعدە ٣١٥ ژمارە ٤٠٠ رەزامەندی داوە و لە مێژووی ٢٦ زیلحیجە ٣١٥ بە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت فەرمان دەرچووە، تێیدا هاتووە؛ لەسەر ئەو سکاڵا و هەواڵانەی کە لە شوێن خۆی هاتووە بە پشت بەستن بە نووسراوی روون کردنەوە، لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوە ئەنجام دراوە، کاغەزی لێکۆڵینەوەی سەرەتاییش نێردراوە، لە ویلایەتیش ئاگاداری دراوە کە بڕیاری قۆمیسیۆن جێبەجێ بکرێت، هیممەت بکرێت لە ئەنجام دانی.



| 14 موحەررەم 1316 | 001135.085099 | BEO. |
|---|---|---|

١٤ موحەررەم ١٣١٦
٢٣ مایس ١٣١٤
نەزارەتی دەفتەرخاقانی جەلیلە
نووسراو

نووسراوی مێژووی زیلقەعدە ٣١٥ ژمارە ٣ بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە دوای رەزامەندی لە ٩ موحەررەم ٣١٩ جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، مەحمود ئەفەندی فەرمانبەری دەفتەرخاقانی سانجەقی حوران لە شوێن ئیسماعیل حەقی ئەفەندی فەرمانبەری دەفتەرخاقانی سانجەقی سلێمانی دامەزرێت، چونکە دەستی لە کار کێشاوەتەوە و لە شوێن ئەویش محەمەد حوسەینی ئەفەندی فەرمانبەری پێشوو دەست بەکار بێت، هەروەها لە رابردوودا محەمەد حوسەینی ئەفەندی لە داهاتی پشکنین ٤٠٠٠٠ قوروشی لایە، لەسەر هەندێك هۆکار پارەی زیادەی خەرج کردووە، بۆیە لە فەرمانبەرایەتی دەفتەرخاقانی سانجەقی لازقیە لادراوە، هەروەها دوو ساڵ لە ژێر دادگایی کردندا بووە، بەڵام دواتر بێ تاوان دەرچووە، دوای ئەم رەزامەندییە ئەگەر بێتو کاروکردەوەیەکی ببینرێت، ئەو کاتە بەکارهێنانەوەی قەدەغە دەکرێت، بە نووسراوی قۆمیسیۆنی ناوهاتوو پێی راگەیەندراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1159 86863

<table dir="rtl">
<tr><td>BEO.</td><td>001159.086863</td><td>24 سەفەر 1316</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٤ سەفەر ١٣١٦<br>١ تەمموز ١٣١٤<br>بۆ نەزارەتی دەفتەر خاقانی جەلیلە<br>کەمال ئەفەندی فەرمانبەری دەفتەرخاقانی سـانجەقی لازسـتان دوای مۆڵەت وەرگرتن چۆتە دەرسـەعادەت و دواتریش رایگەیانـدووە کـە ناتوانێـت بچێتەوە سـەر کارەکـەی، بۆیە دوور بخرێتەوە و لە شـوێن ئەو ئیسـماعیل حەقی ئەفەندی فەرمانبـەری دەفتـەر خاقانـی سـانجەقی سـلێمانی کە لە کارەکـەی بـووردراوە، لە شـوێنی ناوهاتوو دابمەزرێـت، بۆ ئەم مەبەسـتە لەسـەر نـووسراوی دەوڵەت لە مێـژووی ٥ زیلحیجە ١٣١٥ ژمـارە ١٥ لەگەڵ بریاری قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانی مولکیـە دوای ڕەزامەنـدی فەرمانی پاشـای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی هیممـەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>




| 4 رەبیعی کۆتایی 1316 | 001181.088518 | BEO. |
|---|---|---|

٤ رەبیعی کۆتایی ١٣١٦
١٠ ئۆغستۆس ١٣١٤
بۆ جەنابی عالی لە نەزارەتی دادی جەلیلە
حەسەن تەحسین ئەفەندی یاریدەدەری داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی مەرکەزی ویلایەتی بەسرا دوور بخرێتەوە و لە شوێن ناوبراو عززەت ئەفەندی یاریدەدەری داواکاری گشتی سانجەقی سلێمانی و بۆ شوێنی ناوهاتووش ئەسعەد ئەفەندی یاریدەدەری داواکاری گشتی سانجەقی دەرسیم و بۆ دەرسیمیش مەرجان ئەفەندی یاریدەدەری داواکاری گشتی سانجەقی ماردین و بۆ مادرینیش محەمەد نەزیف ئەفەندی دەرچووی مەکتەبی یاسا هەروەها رەفعەت ئەفەندی سەرۆکی فەرمانگەی یاسایی دادگای سەرەتایی مەرکەزی ویلایەتی قۆنیە دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەو شاکر ئەفەندی سەرۆکی فەرمانگەی یاسایی دادگای سەرەتایی مەرکەزی ویلایەتی سیواس و بۆ سەرۆکایەتی دادگای ناوهاتووش محەمەد عززەت ئەفەندی کە لە سەرۆکایەتی فەرمانگەی سزای دادگای ئیستینافی ویلایەتی وان بووردراوە، سوێند بخۆن و بۆ جێبەجێ کردنی دامەزراندن و رۆیشتنیشیان بە راپۆرتی مێژووی ٢ رەبیعی یەکەم ١٣١٦ ژمارە ٢٥٩ دوای رەزامەندی لە مێژووی ٣٠ رەبیعی یەکەم ١٣١٦ جەنابی پەیوەندیدارانی خەلافەت بە فەرمانی پاشا فەرمان دراوە، کارەکە جێبەجێ بکرێت.



BEO.001242.093149.002

| 29 رەجەب 1316 | 001242.093149 | BEO. |
| --- | --- | --- |

خەزینەی تایبەتی شاهانە
فەرمانگەی ئەملاکی هومایۆن
ژمارە ٤٠
لـە نـاو سـانجەقی سـلێمانی گونـدی شـێخ بەهلـول کـە موڵکـی تایبەتـی جەنابـی پاشـایە لەگـەڵ گشـت گوندەکانـی تـر لەلایـەن هـۆزی شـیوانلی هێرشـی کراوەتـە سـەر و پارەوپـول و کەلوپەلـی دانیشـتوانەکەی تـاڵان کـراوە و دەسـتی بەسـەر داگیـراوە، لـە قۆمیسـیۆنی ئەملاکـی هومایۆنـی موسـڵ تەلەگرافنامـە هاتـووە و تێـدا دەرکەوتـووە ئەمجـارە دانیشـتوانی ناوهاتوو لەبەر هێرش و سـەرپێچی هۆزی ناوهاتوو شـوێنی نیشـتەجێ بوون و زەوی و زاری کشـتوکاڵیان بەجـێ هێشـتووە، بـە گشـتی ناچـار بوونـە پەنـا بـۆ شـارۆچکەی سـلێمانی ببـەن، هەروەهـا ئـەم جـۆرە رەفتـار و کردەوانـە لـە نـاو لیـوای ناوهاتـوو ئاسـایش تێـك دەدات و ئەملاکـی تایبەتـی جەنابـی فەرمانـرەوا دووچـاری حاڵەتێکـی خـراپ دەکات، جگـە لەمـە ئـەو خەڵکـەی کـە بە کشـتوکاڵ راهاتـوون، پەرێشـان و زوڵمیان لێکراوە، ئاشـکرایە لایەنی پایەبـەرز رێگـەی بـەم جۆرە شـتانە نـەداوە، بۆیـە بەپەلە پارەوپـول و کەلوپەلـی دایشـتوانی ناوهاتـوو بگەرێندرێتەوە، هەروەهـا ئـەم جـۆرە بارودۆخانـە دووبـارە نەکرێنـەوە، بـۆ ئەمـەش ئـاگاداری دراوەتـە ویلایەتـی موسـڵ و زانیـاری دراوەتـە خەزینـە تـا جێبەجـێ بکرێـت، لـەم بابەتـەدا ئەمر و فەرمـان بۆ جەنابی ئەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
له ٢٩ رەجەب ٣١٦ و له ١ کانوونی یەکەم ٣١٤
نازری خەزینەی تایبەتی



| 20 شەعبان 1316 | 001251.093757 | BEO. |
|---|---|---|

٢٠ شەعبان ١٣١٦
٢٢ کانوونی یەکەم ١٣١٤
بۆ نەزارەتی دارایی بەهیە
لەبەر ئەو تەنگژە داراییەی کە سانجەقی سلێمانی تێی کەوتووە، ئیدارەی سەربازی شاهانە تووشی کێشە بۆتەوە، بەردەوام بوونیشی تەنگژەی گەورەتر بەدوای خۆیدا دەهێنێت، بۆیە ٢٠٠٠٠٠ قوروش بە شێوەی قەرز دابین بکرێت، دەستەی ئەنجوومەنی کارگێری لیوا بە گرنگیەوە سەیری ئەم بارودۆخە دەکات، وەکو دەستپێشخەریش ٥٥٠٠ لیرە بۆ ویلایەت دێت، بۆیە روسماتی ساڵانەی سەر مەڕ بۆ شوێنگرەوەی قەرزەکە هەژمار کراوە، بە پەلە رەزامەندی لەسەر قەرزەکە بدرێت و وەربگیرێت، لە ویلایەتی موسڵ لە مێژووی ٢١ کانوونی یەکەم ١٣١٤ تەلەگرافنامە نێردراوە، بەپەلە جێبەجێ بکرێت و هیممەت بکرێت لە راگەیاندنی و هاوپێچەکانی بنێردرێتەوە.

بە ئاماژەی کاغەزی بەرێوەبەرایەتی عالی.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1254 94049

| BEO. | 001254.094049 | 27 شەعبان 1316 |
|---|---|---|

٢٧ شەعبان ١٣١٦
٢٩ کانوونی یەکەم ١٣١٤
نووسراو بۆ لایەنی عالی لە نەزارەتی دادی جەلیلە
ئەسعەد ئەفەندی لە یاریدەدەری داواکاری گشتی سانجەقی سلێمانی دامەزراوە، بەڵام لە داهاتوودا لە شوێنێکی گونجاوتر دادەمەزرێت، بۆیە حەمزە ئەفەندی دەرچووی مەکتەبی مافەکانی شاهانە دوای سوێند خواردن لە شوێنی ناوبراو دامەزرێت، لە مێژووی ٣٠ رەجەب ١٣١٦ ژمارە ٥٦٣ راپۆرتی عالی دوای رەزامەندی لە مێژووی ٢٤ شەعبان ١٣١٦ فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی لە جێبەجێ کردن دایە.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
تلغراف نامه

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1265 | 94869 | 2

BEO.001265.094869.002

<table>
<tr><td>BEO.</td><td>001265.094869</td><td>29 ڕەمەزان 1316</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ جەنابی سەدری ئەعزەم لە پەیوەندیدارانی سەدارەت<br>لە قەزای گولعەنبەری سلێمانی، سەربازی شاهانە مووچەی ڕەمەزانیان وەرنەگرتووە، بۆیە هێرشیان کردۆتە سەر خانەی ئەفسەر و قائیمقام و لە مەرکەزی سلێمانیش بە گشتی پۆلیسی پاراستن هێرشیان کردۆتە سەر فەرمانگەی حکوومەت و موتەسەرفیەت، تاقمێك مامەڵەی سووکایەتیان ئەنجام داوە، ئێستا بریارنامەی بە تەلەگراف لە ئەنجوومەنی کارگێری سلێمانی وەرگیراوە، تێیدا رایدەگەیەنێت مووچەی مانگی ڕەمەزان و جەژنیان پێ بدرێت، هەروەها بە تێروانین لە پاراستنی حکوومەت لە هەژماری باجی مەڕوماڵاتی ساڵی داهاتوو ئاقچە قەرز بکرێت و کارگێری سەربازی جێگیر بکرێت، لە بارەی قەرزەکەش لە سانجەقی کەرکووك داوای ئەرزاق کراوە، بۆیە لە کاتی جێبەجێ کردنی هاوکاری سەدارەتی جەلیلە، تکا دەکرێت کارەکەی سانجەقی سلێمانیش جێبەجێ بکرێت، فەرمان، لە ٢٩ کانوونی دووەم ٣١٤.<br>بە ناوی والی موسڵ یاریدەدەر حەمدی</td></tr>
</table>


44

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1265 94875

2 ∪/k
(2 sırf boş)

<table>
<tr><td>BEO.</td><td>001265.094875</td><td>29 رەمەزان 1316</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٩ رەمەزان ١٣١٦<br>٢٩ کانوونی دووەم ١٣١٤<br>تەلەگراف بۆ ویلایەتی موسڵ<br>لـە ٢٩ کانوونـی دووەم ١٣١٤، بـۆ ئـەم سـاڵی داهاتـوو، قـەرز کردنـی ئاقچـە لەسـەر رسـوماتی مەڕومـاڵات هەژمـار کـراوە، ئەمـەش بـۆ پێدانـی مووچـەی سـەربازی شـاهانە دەبێـت، بـە ئامـاژە پێکردنـەوە بـە گونجـاو زانـراوە سـانجەقی سـلێمانیش بگرێتـەوە، بـە گوێـرەی ئـەم کارە مامەڵەکـە جێبەجـێ دەکرێـت.</td></tr>
</table>




| BEO. | 001271.095254 | 12 شەوال 1316 |
|---|---|---|
| ١٢ شەوال ١٣١٦<br>١١ شوبات ١٣١٤<br>نووسراو بۆ نەزارەتی دارایی بەهیە<br>ئەمین ئاغا کە لە چەندین بەڕێوەبەرایەتی ناحیەکانی سانجەقی سلێمانی ئەرکی وەرگرتووە، کەچی لەبەر ئەوەی لە هەڵبژێردراوەکان نەبووە، دوای مردنی پێنج منداڵەکەی مووچەیان بۆ نەبراوەتەوە، لەبەر ئەوەی بارودۆخی بژێویان خراپە، وەکو سەدەقەی پایەبەرزی جەنابی خەلافەتپەناهی مووچەیەکی گونجاویان بۆ ببڕێتەوە، لەلایەن عائیشە داواکاری بە واژوو لە مێژووی ٢٩ کانوونی یەکەم ١٣١٤ بۆ سەروو نێردراوە، دواتر بەمەبەستی دووپاتکردنەوە دیسان لەلایەن ناوبراوەوە ئەو داواکاریەی پێشکەش کراوە، بۆ سەروو نێردراوەتەوە، بە تێڕوانین لە پاشکۆکانی، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی و ڕاگەیاندنی. | | |



DH.MKT.02122.00104.001

| 8 جەمادی کۆتایی 1316 | 02122.00104 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٨ جەمادی کۆتایی ١٣١٦
١٢ تشرینی یەکەم ١٣١٤
بۆ لایەنی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
لە دژی رەفعەت ئەفەندی موتەسەرفی پێشووی سانجەقی سلێمانی سکاڵا و داواکاری تۆمار کراوە، بۆیە بە پشت بەستن بە بریاری روون کردنەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کراوە و وتەی وەرگیراوە، کاغەزی لێکۆڵینەوەکەش نێردراوە و بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە جێبەجێ دەکرێت، هەروەها نووسراوی سەدری ئەعزەم لە پەیوەندیدارانی سەدارەت هاتووە و لە دەستەواژەیەکی فەرمانی داوە و بۆ ویلایەتی موسڵی جەلیلە نوسراوەتەوە، کە عەبدوڵڵا پاشا لە موتەسەرفیەتی لیوای ناوهاتوو دادەمەزرێت، ئەمجارە لە مێژووی ١٨ ئەیلوول ١٣١٤ ژمارە ١٠٦ وەڵام لە ویلایەتی ناوهاتوو وەرگیراوە لەگەڵ کاغەزی باسکراو بەیەکەوە پێشکەش کرا، بۆ جێبەجێ کردنی مامەڵەکە هاوکاری سەرووی پێویستە.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
2155 89

DH.MKT.02155.00089.001

| DH.MKT. | 02155.00089 | **19 شەعبان 1316** |
| --- | --- | --- |

١٩ شەعبان ١٣١٦
٢١ کانوونی یەکەم ١٣١٤
بۆ سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی جەلیلە
لە بارەی رەفعەت ئەفەندی موتەسەرفی پێشووی سانجەقی سلێمانی لە خۆچێی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کراوە، ئینجا حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، سەرەتا کاغەزەکانی لێکۆڵینەوەی ناوبراو نێردراوە، دواتریش لەسەر نووسراوی عالی کە لە مێژووی ٢٥ تشرینی دووەم ١٣١٤ ژمارە ٢٢٨ نێردراوە، بە زانایی قۆمیسیۆنی تایبەت ناوبراو ووتەکانی وەرگیراوە، کاغەزی ووتەکانیشی دەنێردرێتەوە.



DH.MKT.02157.00122.001

| 26 شەعبان 1316 | 02157.00122 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

٢٨ کانوونی یەکەم ١٣١٤
بۆ نەزارەتی دەرەوەی جەلیلە
لە موتەسەرفیەتی سلێمانی راگەیەندراوە؛ مەحمود پاشا سەرۆکی جاف ١٥٠ ئەسپ سواری ناردووە تا ٦٠٠ هاووڵاتی ئێرانی لە سنوورەوە بپەڕێنێتەوە، ئەگەر وابێت لە نێوان هۆزەکان ئاژاوە دروست دەبێت، پێویستە ڕێگە لە دروستی بوونی ئەم حاڵەتە بگیرێت، ئەمجارە ڕێگە نەدرێت ئێرانیەکان بپەڕنەوە، هەروەها لێکۆڵینەوە بکرێت کە ئەمانە بە چ بیرۆکەیەك دەیانەوێت بێنە ناو وڵاتەوە و ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت، لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە لە مێژووی ٢١ کانوونی یەکەم ١٣١٢ وەرگیراوە، وێنەیەکی هاوپێچ نێردراوە، بە تێروانین لە نووسراوەکان ئاگاداری پێویست بدرێتە حکوومەتی ئێران، دوای جێبەجێ کردنی کارەکەش ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت.



DH.MKT.02185.00025.001

| 22 زیلقه‌عده 1316 | 02185.00025 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٢ زیلقه‌عده ١٣١٦
٢٢ مارت ١٣١٥
بۆ ویلایه‌تی موسڵی عالییه
له‌سه‌ر مه‌سه‌له‌ی مه‌حمود پاشای جاف، سه‌ید مسته‌فا ئه‌فه‌ندی نه‌قیبی سانجه‌قی سلێمانی چۆته لای هۆزی جاف، بۆ خه‌رج كردنی رۆژانه و خه‌رجی رێگای ناوبراو و گشت فه‌رمانبه‌رانی، له نه‌زاره‌تی عاجیزانه نووسراو نووسراوه‌ته‌وه، له‌و سه‌نه‌دانه‌ی كه وه‌رگیراوه ده‌ركه‌وتووه، لێره تۆماری نووسراوه‌كانی مێژووی ٢٣ تشرینی دووه‌م ١٣٠٧ نه‌دۆزراوه‌ته‌وه، بۆیه ناردنی وێنه‌ی په‌سه‌ند كراوی باسكراو، هیمه‌تی عالی پێویسته.



DH.MKT.02187.00052.001

| 28 زیلقەعدە 1316 | 02187.00052 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٨ زیلقەعدە ١٣١٦
٢٨ مارت ١٣١٥
بۆ جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
بەهـۆی بوێـری و ئـەو خزمەتـە باشـەی کـە عەبدوڵـڵا ئەفەنـدی لـە قەڵەمـی تۆمـاری لیـوا و سـاڵح ئەفەنـدی بەڕێوەبـەری کاغـەزەکان و جـەودەت ئەفەنـدی کاتیبـی ئەنجوومـەن لـە کارەکانیـان ئەنجامیـان داوە، ڕێزیـان لـێ بگیرێـت و پلەکەیـان لـە پلـەی چـوارەم بـۆ پلـەی سـێیەم بـەرز بکرێتـەوە، لـە ئەنجوومەنـی کارگێـری سـانجەقی سـلێمانیش لـە مێـژووی ٢٢ شـوبات ١٣١٤ بڕیارنامـە لەگـەڵ داواکاریەکانیـان بەیەکـەوە نێـردراوە، دوای ڕاگەیاندنـی خزمەتـە باشـەکانیان ئەمـر و فەرمـان بدرێـت لەسـەر جێبەجـێ کردنـی کارەکـە.



İ.AZN.00034.00013.005

| I.AZN. | 00034.00013 | 10 موحەررەم 1317 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
.... دیوانی هومایۆن
١٠٤
جەنابی ڕێزداری ئەفەندم
ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە بە ئاگاداری پشکێنەری داد بۆ عەلی عەلەوی ئەفەندی یاریدەدەری داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی سانجەقی ئەرغەنی کراوە، لە ئەنجامدا دەرکەوتووە؛ کاروکردەوەی نەگونجاوی ئەنجام داوە، بۆیە مانەوەی لەسەر کارەکەی گونجاو نییە و ناوبراو دووربخرێتەوە، لە شوێن ئەویش ئەسعەد ئەفەندی یاریدەدەری داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی پێشووی سانجەقی سلێمانی دوای سوێند خواردن دادەمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە ئەو بریارنامەیەی کە لە ئەنجوومەنی هەڵبژاردنی فەرمانبەرانی داد ڕێکخراوە لەگەڵ کاغەزی روون کردنەوەکان بەیەکەوە نێردراوە، بە راگەیاندن و پێشکەش کردنی راپۆرتی نەزارەتی دادی جەلیلە، فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت چ بفەرمووێت بە گوێرەی ئەو بریاری عالی جێبەجێ دەکرێت، بەم راگەیەندراوە، نووسراو نووسرایەوە و ژمارەی لەسەر تۆمار کرا ئەفەندم، لە ١٠ موحەررەم ٣١٧ و لە ٩ مایس ٣١٥.
سەدری ئەعزەم




İ.TAL.00183.00047.001

| I.TAL. | 00183.00047 | 12 ڕەبیعی یەکەم 1317 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
... دیوانی هومایۆن
۷٤۸
جەنابی بە ویژدانی ئەفەندیم
غالب بەگ کە لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی دامەزراوە، شایەنی میهرەبانی پاشایە، لە بارەی ئەو پلەیەی وەریدەگرێت بۆ میری میران بەرز دەبێتەوە، هەر چۆنێك بێت ئەگەر جەنابی خەلافەتپەناهی بە فەرمانی پاشا بفەرمووێت ئەوا جێبەجێ دەکرێت، بە ڕاگەیاندنی نووسراوی بەپەلە کرا ئەفەندم، لە ١٢ ڕەبیعی یەکەم ١٣١٧ لە ٨ تەمموز ١٣١٥.
سەدری ئەعزەم

| 1317 موحەررەم 18 | 001316.098676 | BEO. |
|---|---|---|

١٨ موحەررەم ١٣١٧
١٧ مایس ١٣١٥
نووسراو بۆ نەزارەتی دارایی بەهیه
هاوپێچی نووسراوی مێژووی ١٤ شەوال ١٣١٦یە، ئەمین ئاغا لە بەڕێوەبەرایەتی ناحیەکانی ناو سانجەقی سلێمانی مردووە، دوای مردنی بۆ خێزانەکەی و پێنج منداڵەکەی هیچ مووچەیەك نەبراوەتەوە، چونکە ناوبراو لە هەڵبژێردراوەکان نەبووە، بەڵام لەبەر بارودۆخی خراپی خانەوادەکەی عائیشەی خێزانی داواکاری پێشکەش کردووە و مۆری لەسەر دراوە و تێیدا داوای کردووە مووچەیەکی گونجاو بۆ خۆی و منداڵەکانی ببڕێتەوە، ئەم داواکاریە بۆ سەروو نێردراوە، لەسەر نووسراوەکان و ئاماژەی پێشوو هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی و ڕاگەیاندنی.

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1322 99097

| BEO. | 001322.099097 | 28 موحەررەم 1317 |
| --- | --- | --- |

٢٨ موحەررەم ١٣١٧
٢٧ مایس ١٣١٥
بۆ لایەنی عالی لە نەزارەتی دادی جەلیلە
عەلی عەلەوی ئەفەندی یاریدەدەری داوکاری گشتی دادگای سەرەتایی سانجەقی ئەرغانی لە کارەکەی دوورخراوەتەوە، لە شوێن ناوبراویش ئەسعەد ئەفەندی یاریدەدەری داواکاری گشتی پێشووی دادگای سەرەتایی سانجەقی سلێمانی بە سوێند خواردن دامەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر راپۆرتی عالی لە مێژووی ٣٠ زیلحیجە ١٣١٦ ژمارە ١٤٣ دوای رەزامەندی لە مێژووی ٢٦ موحەررەم ١٣١٧ فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرمانی جێبەجێ کردنی داوە، ئەمر و فەرمان بۆ ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.



| 13 سەفەر 1317 | 001330.099736 | BEO. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ١٤٧٢
بۆ جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە
لەسەر مەسەلەی مەحمود پاشای جاف، سەید مستەفا ئەفەندی نەقیبی سانجەقی سلێمانی لەگەڵ ئەحمەد کەمال بەگ ئەندامی پێشووی ئەنجوومەنی کارگێری شارەزوور چوونەتە لای هۆزی ناوهاتوو و گەراونەتەوە، لە خەزینەی جەلیلەی ویلایەتی موسڵیش خەرجیەکانی رێکخراوە و جێبەجێ کراوە، لە داهاتی ناوەخۆی ساڵی ٣٠٨ یش هەژمار کراوە، هەروەها سەنەدەکان وەرگیراون و نێردراون، کە تێیدا هاتووە؛ بڕی ٤٢٦٠ قوروش خەرج کراوە و رێکخراوە، بە بڕیاری ئەنجوومەنی تایبەتی وەکیلەکان و بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا رەزامەندی دراوە، بەڵام دەرکەوتووە لە موازەنەی ئەم ساڵەدا شوێنگرەوەی نییە، بۆیە بڕە پارەی ناوهاتوو لە موازەنەی ئەم ساڵەدا بە زیادکردن رێك بخرێت، لەگەڵ نەزارەتی دارایی عالی بۆ بەندەمان فەرمان نووسراوەتەوە و بە ووتەی ژمێریاری راگەیەندراوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١٣ سەفەر ١٣١٧ و لە ١٠ حوزەیران ١٣١٥
نازری کاروباری ناوەخۆ



| 8 ڕەبیعی کۆتایی 1317 | 001358.101778 | BEO. |
|---|---|---|

٨ ڕەبیعی کۆتایی ٣١٧
٣ ئۆغستۆس ٣١٥
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لەسەر بریارنامەی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی
وێنەی بریارنامەی ژمارە ١٢١١ی فەرمانگەی دارایی شورای دەوڵەت
نووسراوی مێژووی ٢٠ سەفەر ٣١٧ ژمارە ١٥٧٥ ی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، لە فەرمانگەی داراییش خوێندنەوەی بۆ کرا، تێیدا هاتووە؛ میری ئاڵای ڕەشید بەگ بریکاری موتەسەریفی سانجەقی سلێمانی ئەو مووچە زیادەیەی وەریدەگرێت یەکسانە بەو ئەرکەی کە هەیەتی، بەڵام لەبەر ئەوەی خەرجی زیادەی بەشی ناکات، داوای کردووە هێشتا زیاد بکرێت، لەلایەکی تر لە ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراو کە ناوبراو سێ یەکی مووچەی پێ بدرێت، چونکە ئەو ئەرکە کارگێرانەی کە بە وەکالەت بەڕێوە دەچن و ئەو بریکارانەی دادەمەزرێن، تەنیا پێنج مووچەیان بۆ دابین دەکرێت، بەڵام بە گوێرەی بارودۆخ و چینەکەیان ئەگەر پێویست بکات لە پێنج مووچە زیاتریان پێ دەدرێت، دوای ڕەزامەندی بە گوێرەی بریارنامەی ساغ کردنەوە؛ گونجاوە لە مووچە بنەرەتیەکەی بری سێ یەك و چوار یەکی ئاقچەی پێ بدرێت، بەم ڕاگەیەندراوەش ڕەزامەندی دراوە، هەروەها بە تێڕوانین لە هۆکاری تۆمارەکە دابینکردنی سێ یەکی مووچەی ناوبراو بە گونجاو دانراوە، بۆیە نووسراو حەواڵەی نەزارەتی ناوەخۆ کرا، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٨ ڕەبیعی یەکەم ٣١٧ و لە ٢٤ تەمموز ٣١٥.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1447 | 108496

| BEO. | 001447.108496 | 26 شەوال 1317 |
| --- | --- | --- |

٢٦ شەوال ١٣١٧
١٤ شوبات ١٣١٥
بۆ نەزارەتی دارایی بەهیە
پارەی ساڵانی رابردوو کە دەکاتە ٤٠٠٠٠٠ قوروش و هەندێك لە سندوقی داهاتی سانجەقی سلێمانی، بۆ خەرجی ناوەخۆ خەرج کراوە، بۆ ئەم بابەتە لایەنی پەیوەندیدار ئاگادارکراوەتەوە و لە وەڵامدا نووسراوی مێژووی تشرینی دووەم ١٣٠٨ ژمارە ٩٨٠ راگەیەندراوە؛ کە برە پارەی باسکراو هێشتا یەك ئاقچە نەنێردراوەتە سندوق، هەروەها خەرجکردنی زیاتر لە ٤٠٠٠٠٠ قوروش زیانی بە سندوق گەیاندووە، بۆیە برە پارەی باسکراو دانە بە دانە لەو داهاتەی دەست دەکەوێت لە شوێن خۆی دابنرێتەوە، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارەش لە نەزارەتی سندوقی خانەنشینی مولکیە لە ١٢ شەوال ١٣١٧ ژمارە ٧٣ بە هاوپێچەوە راگەیەندراوە، بەم تێروانینە ئەو برە پارەیەی کە ئاماژەی پێکراوە لە شوێن خۆی دادەنرێتەوە.



DH.MKT.02217.00034.001

| DH.MKT. | 02217.00034 | 20 سەفەر 1317 |
| --- | --- | --- |

٢٠ سەفەر ١٣١٧

١٧ حوزەیران ١٣١٥

بۆ لایەنی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت

میری ئاڵای رەشید بەگ وەکیلی موتەسەرفی سانجەقی سلێمانی، بە گوێرەی ئەو ئەرکەی کە هەیەتی، ئاساییە پێنج مووچە وەربگرێت، بەڵام لەبەر خەرجی زیادەی بەشی ناکات، بۆیە داوای کردووە مووچەکەی زیاد بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ لە مێژووی ٢٣ مایس ١٣١٥ دەرچووە رەزامەندی داوە کە پارەکە وەربگرێت، چونکە ئەم ئەرکە کارگێریانەی کە بە پێویست زانراوە بە وەکالەت کارەکانیان بەرێوە بچێت، بە مووچەی تایبەتی بریکارەکانی ئەم ئەرکە پێنج مووچە وەردەگرن، ئەگەر بە گوێرەی بارودۆخ پێویستیش بکات لە پێنج مووچە زیاتر وەربگرێت ئەوا دوای رەزامەندی، لە مووچەی بنەرەتیەکەی بری چواریەك و سێیەکی ئاقچەی پێ دەدرێت، ئەمەش دوای تێروانین لە کۆلکەی بریارەکان بە ووتەی ژمێریاری رەزامەندی لەسەر دەدرێت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
2228 39

DH.MKT.02228.00039.001

| DH.MKT. | 02228.00039 | 28 ڕەبیعی یەکەم 1317 |
|---|---|---|

٢٨ ڕەبیعی یەکەم ١٣١٧
٢٤ تەمموز ١٣١٥
بۆ ویلایەتی موسڵی عالییە
غالب پاشا لە موتەسەرفیەتی سلێمانی دامەزراوە، لەگەڵ گەیشتنی بۆ شوێنی مەبەست و لەگەڵ مێژووی دەست بەکاربوونی لە ئەرکەکەی، مانگانە ١٧٥٠ قوروش مووچەی بۆ دەبردرێتەوە، جگە لەمە لە ئەرکی پێشووی کە ٤٥٠٠ قوروشە لەگەڵ ئەو برەیەی کە وەستێنراوە، بە گوێرەی نیزام لەگەڵ راگەیاندنی دەست بەکاربوون و مێژووی دەست لە کار کێشانەوەی و خەرجی ڕێگاکەشی لێرە بۆی خەرج دەکرێت، بە ووتەی ژمێریاری نووسراو کراوە.


OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
2292 | 35

DH.MKT.02292.00035.001

| 1317 شەعبان 29 | 02292.00035 | DH.MKT. |
|---|---|---|

نامەی قەڵەمی ناوەخۆ
٢٩ شەعبان ٣١٧
٢٠ کانوونی یەکەم ٣١٥
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە

بـۆ چاکسـازی کـردن لـەم کارە نەشـیاوانەی کـە لـە نـاو سـانجەقی کەرکـووك و سـلێمانی روویانـداوە، میـری لیـوا یوسـف پاشـا ئەرکـی پێـدراوە، دواتـر لەگـەڵ مەفرەزەکـەی دەسـتیان بـە کار کـردووە و ئەنجامدانـی کارەکەیـان راگەیانـدووە، لـە راگەیاندنـی خۆشـحاڵ بوونیـش راگەیەندراوە، لەسـەر هەندێـك داواکاری کـە بـە واژووی جۆراوجۆر لـە مەرکـەزی کەرکـووك بـۆ لایەنی والای سـپاهیدار رۆیشـتووە، لەگەڵ نـووسراوی مێـژووی ٢٧ تشرینـی دووەم ٣١٥ لەگـەڵ دوو تەلەگرافنامـە حەواڵـەی جەنابـی پەیوەندیـداری سـەدارەتی لایەنـی عالی کراوە، لەسـەر ئـەو داواکاریەی کـە هاتـووە، راپۆرتـی سـەرپێچی کـەران کـە ئەوانـەی ناویـان دیـارە، چەنـد کەسـێکیان دوورخراونەتـەوە هەروەهـا پارەوپـول و ئەملاکـی شکسـتخواردووەکانیش کـە بەدەسـتیان کەوتـووە، بیاندرێتـەوە و ئـەم تەلەگرافنامانـەی کـە لەلایـەن پەیوەندیـداری سـەدارەت و نەزارەتـی عاجیزانە دەرچووە، لەگەڵ تەلەگرافنامەی مێـژووی ١٤ تشرینی دووەم ٣١٥ و نـووسراوی زانیـاری ئاماژەیـان پێکـردووە، کـە بـە پەلـە لێکۆڵینەوە بکرێـت و هیممەت بکرێت لـە راگەیاندنی.



ŞD.02696.00014.001

<table>
<tr><td>ŞD.</td><td>02696.00014</td><td>20 سەفەر 1317</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قەڵەمی تۆمار<br>ژمارە ١٥٧٥<br>بۆ جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت<br>راگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە<br>وەکیلی موتەسەرفی سانجەقی سلێمانی میری ئالای رەشید بەگ بە گوێرەی ئەرکەکەی پێنج مووچە وەردەگرێت، بەڵام لەبەر خەرجی زیادە ئەم مووچەیە بەشی ناکات، بۆیە داوای کردووە بۆی زیاد بکرێت، هەروەها ناوبراو هەوڵی خۆی دەدا کاروبارەکان بە باشی بەرێوە دەبات، سەبارەت بەو سێ مووچەیەی کە دانراوە پێی دەدرێت، لە ویلایەتی موسڵ لە مێژووی ٢٣ مایس ١٣١٥ تەلەگرافنامە دەرچووە و تێدا نیشان دراوە، ئەو وەکیلانەی کە لە رووی کارگێریەوە بە وەکالەت دادەمەزرێن، بۆ ئەم ئەرکە پێنج مووچەیان بۆ دابین دەکرێت، بەڵام ئەو وەکیلەی کە دادەمەزرێت بە گوێرەی بارودۆخ و چینەکەی ئەگەر پێویست بکات لە پێنج مووچە زیاتری پێ بدرێت، ئەوا گونجاوە دوای رەزامەندی لە مووچە بنەرەتیەکەی بری چوار یەك و سێ یەکی ئاقچەی پێ بدرێت، بە تێروانین لە کۆڵکەی بریارەکان و بە ووتەی ژمێریاری نووسراو بۆ جێبەجێ کردنی کراوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٠ سەفەر ١٣١٧ و لە ١٧ حوزەیران ١٣١٥.<br>نازری کاروباری ناوەخۆ</td></tr>
</table>


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
ŞD
2697 | 34

ŞD.02697.00034.001

| ŞD. | 02697.00034 | 19 ره‌بیعی یه‌كه‌م 1317 |
|---|---|---|

بابی عالی
فه‌رمانگه‌ی كاروباری ناوه‌خۆ
قه‌ڵه‌می تۆمار
ژماره ١٩٥٥
بۆ لایه‌نی عالی له‌ په‌یوه‌ندیدارانی سه‌داره‌ت
راگه‌یه‌ندراوی به‌نده‌یه
ئـه‌و پێنـج مووچه‌یـه‌ی كـه‌ میری ئاڵای ره‌شـید به‌گ وه‌كیلی موته‌سـه‌رفی سـانجه‌قی سـلێمانی وه‌ریده‌گرێت؛ به‌شـی خه‌رجـی زیاده‌كانـی نـاكات، داوای كردووه‌ زیاد بكرێـت، هه‌روه‌ها ناوبراو هه‌وڵ ده‌دات كاروباره‌كان به‌ باشـی به‌رێوه‌ ببـات، بۆیـه‌ ته‌له‌گرافنامـه‌ لـه‌ ویلایه‌تی موسـڵ وه‌رگیراوه‌، راگه‌یه‌ندراوه‌ سـێ یه‌كـی مووچه‌ی پێ بدرێـت، جگه‌ له‌مه‌ ئـه‌و فه‌رمانبه‌رانـه‌ی بـه‌ وه‌كالـه‌ت داده‌مه‌زرێـن، ئه‌گـه‌ر پێویسـت بـكات شـتێكیان پـێ بدرێـت ئـه‌وا بـه‌ ره‌زامه‌نـدی بابـی عالـی مووچـه‌ بنه‌ره‌تیه‌كـه‌ی بـری سـێ یـه‌ك و چـوار یه‌كـی ئاقچـه‌ی پـێ ده‌درێـت، جگـه‌ له‌مـه‌ بـه‌ جێبه‌جـێ كردنـی بریارنامـه‌؛ لـه‌ ١٧ حوزه‌یـران ١٣١٥ ره‌زامه‌نـدی نیشـان داوه‌ خه‌رجـی رێگاكـه‌ی بۆ خـه‌رج بكرێـت، ئه‌مجاره‌ له‌ ویلایه‌تـی ناوهاتـوو، لـه‌ ته‌له‌گرافنامـه‌ی ٨ ته‌ممـوز ١٣١٥ بابه‌ته‌كـه‌ و ره‌زامه‌ندییه‌كـه‌ دووپاتكراوه‌ته‌وه‌، لـه‌م بابه‌ته‌دا ئه‌مـر و فه‌رمـان بـۆ جه‌نابـی ئه‌و كه‌سـه‌یه‌ كـه‌ فه‌رمان ده‌رده‌كات، لـه‌ ١٩ ره‌بیعی یه‌كـه‌م ١٣١٧ و ١٥ ته‌ممـوز ١٣١٥.
نازری كاروباری ناوه‌خۆ


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
ŞD
2996 18

ŞD.02996.00018.001

| ŞD. | 02996.00018 | 17 سەفەر 1317 |
|---|---|---|

بۆ سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی جەلیلە

جەنابی ئەفەندم

کە لە بەڕێوەبەرایەتی رسوماتی سانجەقی سلێمانی بووم، لە دژی من داوا بەرز کرابووەوە، لە دادگای پێداچوونەوەی شورای دەوڵەت بڕیار لەسەر بەندەیەکی وەکو من دراوە، وێنەیەکی پەسەند کراوی ئەم بڕیارە بە بەندەتان بدەن، بۆیە وێنەیەکی ئەم بڕیارە بدرێتە فەرمانگەی ناوهاتوو، تا لە رێگەی ئەوانەوە بگاتە دەستم؛ ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە ١٥ حوزەیران ١٣١٥

بەڕێوەبەری پێشووی رسوماتی سلێمانی حافز نەجیب



| 10 رەبیعی یەكەم 1318 | 00039.00012 | I.AZN. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
......... دیوانی هومایۆن
٧٨٥
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
مستەفا كامل ئەفەندی سەرۆكی فەرمانگەی سزای دادگای سەرەتایی سانجەقی كەربەلا لەبەر كارە خراپەكانی لە كارەكەی دوور خراوەتەوە و لە شوێن ئەو سەعید ئەفەندی سەرۆكی فەرمانگەی سزای دادگای سەرەتایی سانجەقی سلێمانی دامەزراوە؛ هەروەها موسا كازم ئەفەندی یاریدەدەری داواكاری گشتی دادگای سەرەتایی سانجەقی مەدللی بە بێ مۆڵەت لە ئەركەكەی دەستی لە كاركێشاوەتەوە، بۆیە لە كارەكەی دوور خراوەتەوە و لە شوێن ئەو سلێمان پاشا سەرۆكی دادگای سەرەتایی قەزای ئۆرتەكۆی دانراوە، عابدین ئەفەندیش لە سەرۆكایەتی دادگاكانی سوڵح دادەنرێت و دوای سوێند خواردنی ناوبراوان دەست بە ئەركەكەیان دەكەن، بۆ ئەم مەبەستە بریارنامە لە ئەنجوومەنی هەڵبژاردنی فەرمانبەرانی داد رێكخراوە هەروەها لەگەڵ كاغەزی روون كردنەوە نێردراون، بە راگەیاندن و پێشكەش كردنی راپۆرتی نەزارەتی دادی جەلیلە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەكرێت، بە راگەیاندنی نووسراو نووسرایەوە و ژمارەی لەسەر تۆمار كرا ئەفەندم.
لە ١٠ رەبیعی یەكەم ٣١٨ و لە ٢٤ حوزەیران ٣١٦
سەدری ئەعزەم


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

یلدز سرای همایونی
باش کتابت دائرەسی
٢٤١٢

OSMANLI ARŞİVİ
İ.HUS
83 108
1318.R/31

İ.HUS.00083.00108.001

<table dir="rtl">
<tr><th>I.HUS.</th><th>00083.00108</th><th>3 ڕەبیعی کۆتایی 1318</th></tr>
<tr><td colspan="3">کۆشکی یڵدزی هومایۆن<br>فەرمانگەی باش کیتابەت<br>٢٤١٢<br>لەگەڵ نوسراوی بەندەمان کە بە مێژووی دوێنێ دەرچووە؛ تێیدا ڕاگەیەندراوە لە سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی پشکنین ئەنجام دەدرێت، بۆیە لە لایەنی مولکیە و لە ئەندامانی قۆمیسیۆنی پشکنینی سەربازی لە هەر یەکە دوو کەس لە دەستەیەك دامەزرێن و هەر ئێستا دەست بە ڕۆیشتن بکەن، هەروەها بۆ ڕۆیشتنی دەستەیەکی ئاوا تەنیا بە ڕەزامەندی سەروو دەبێت، ئەمەش لەسەر فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیدارانی خەلافەت وەستاوە، کەچی بریارنامەی ڕاگەیەندراوی ئەنجوومەنی تایبەتی بریکارەکان بۆ کەرکووك ڕۆیشتووە، بۆ سەروو نووسراوەتەوە کە دەستەی چاکسازی لە کامە لایەن فەرمانی وەرگرتووە تا بڕوات؛ هەروەها لە بریارنامەی ناوهاتوودا ئەو ٩ کەسەی کە بە تاوانی کوشتن تاوانبار کراون، ڕاگەیەندراوە و بڵاوکراوەتەوە، ئەم دەستەی ناوهاتوو نابێ کارێکی تاك لایەنە بکات و تا دەستەی پشکنین دێت لە بارەی ئەم کەسانەوە شتێك نەکەن و ببەسترێنەوە بە کەفالەت وەرگرتن، ئەمەش لە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیدارانی خەلافەت ڕاگەیەندراوە و لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٣ ڕەبیعی کۆتایی ١٣١٨ و لە ١٧ تەمموز ١٣١٦.</td></tr>
</table>


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

٥

یلدز سرای همایونی
باش کتابت دائرەسی
٢٧٨٤

کرکوک و سلیمانیه سنجاقلرنده بعض تحقیقات اجراسی ایچون تفتیش عسکری قومسیونی عالیسی
اعضالغنه میرالای ولی بکک اعزامی شرف صدور بیوریلان اراده سنیه حضرت پادشاهی
ایجاب عالیسنه حصولی اولباب امر و فرمان حضرت من له الامرکدر. فی ١٥ ربیع الآخر ١٣١٨ و فی ٢٩ تموز ١٣١٦

OSMANLI ARŞİVİ
İ.HUS
83 140
1318.R/67

İ.HUS.00083.00140.001

| 15 ڕەبیعی کۆتایی 1318 | 00083.00140 | I.HUS. |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
٢٧٨٤
بۆ ئەنجامدانی هەندێك لێکۆڵینەوە لە سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی، جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا فەرمانی داوە، میری ئاڵای وەلی بەگ لە ئەندامانی قۆمیسیۆنی پشکنینی سەربازی بنێردرێت، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٥ ڕەبیعی کۆتایی ١٣١٨ لە ٢٩ تەمموز ١٣١٦.
جەنابی شەهریاری سەر کاتیب


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.TMIK.M
90 9

DH.TMIK.M.00090.00009.001

<table>
<tr><td>DH.TMIK.M.</td><td>00090.00009</td><td>25 سەفەر 1318</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی دەرەوە<br>قەڵەمی تۆمار<br>ژمارە ٢٥٠<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>جەنابی پەیوەندیدارانی خەلافەت ئەمنیەت و ئاسایشی سانجەقەکانی کەرکووک و سلێمانییان جێگیر کردووە و بە ڕۆیشتنیان بۆ قەزاکانی سەر بە مەرکەزی ویلایەت، ئەو ڕووبەڕووبوونەوە و ناکۆکیانەیان یەکلاییکردۆتەوە کە لە نێوان شێخەکانی ناوچەکەدا هەیە؛ ئەم کارانەش هەر هەمووی لەلایەن جەنابی حەمدی بەگ ئەفەندی یاریدەدەری والی موسڵ بە نووسراو باسکراوە و هاتووە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>لە ٢٥ سەفەر ١٣١٨ و لە ١٠ حوزەیران ١٣١٦<br>نازری دەرەوە</td></tr>
</table>


یلدز سرای همایونی
باش کتابت دائره سی
۸۰۱۷

242/29
I.TAL.1318/L-176

<table>
<tr><td>25 شەوال 1318</td><td>00242.00029</td><td>I.TAL.</td></tr>
<tr><td colspan="3">کۆشکی یڵدزی هومایۆن<br>فەرمانگەی باش کیتابەت<br>۸۰۱۷<br>ڕاگەیەندراوی بەندەیە<br>حاجی حەسەن ئەفەندی بەڕێوەبەری تۆماری سانجەقی سلێمانی، بە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی ڕەزامەندی دراوە لەسەر بەرزکردنەوەی پلەکەی، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٥ شەوال ١٣١٨ و لە ٢ شوبات ١٣١٦.<br>جەنابی شەهریاری سەر کاتیب</td></tr>
</table>



ML.EEM.00362.00040.001

<table>
<tr><td>ML.EEM.</td><td>00362.00040</td><td>6 رەجەب 1318</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز<br>قەڵەمی تۆمارکردن<br>ژمارە ٣٥<br>بۆ نەزارەتی خەزینەی تایبەتی شاهانەی عالی<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لە سانجەقی سلێمانی؛ زەوییەکانی ناوچەی سێگردکان بێ خاوەنە، بۆیە خراوەتە زیادکردنەوە، بەڵام شوێنگرەوەی زیادکردنەکە بە ٦٠٠٠ قوروش فرۆشراوە، بەم شێوەیە زیادکردنی ئەملاکی همایۆن بە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیدارانی خەلافەت جێبەجێ کراوە، لە ئاماژەی واڵا دەرکەوتووە، برە پارەی باسکراو مامەڵەی هەژمارکردنی لە داهاتی ساڵی ٣١٤ ی خەزینەی تایبەتی شاهانە بووە، دوای جێبەجێ کردنی بە ناوی پارەوپولی ویلایەتی موسڵ تۆمارکراوە، پارەی دیاریکراو ڕێکخراوە و بۆ شوێنی خۆی نێردراوە، هەروەها زانیاری دراوەتە نەزارەتی عالی و نەزارەتی دەفتەرخاقانی جەلیلە، لەسەر نووسراوی پایەبەرز لە ٨ رەبیعی کۆتایی ٣١٧ ژمارە ١٤ بە گفتوگۆ لە وەڵام نووسراو لە نەزارەتی دارایی جەلیلە کراوە، بە راگەیاندنی نووسراوی پوختە ژمارەی پێدراوە، لە ٦ رەجەب ٣١٨ و لە ١٨ تشرینی یەکەم ٣١٦.<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>


İ.DH.01377

| I.DH. | 01377.000019 | 11 رەبیعی کۆتایی 1318 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
... دیوانی هومایۆن
١١١٧
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
بـۆ ئەنجامدانـی پشـکنین لـە سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی؛ لەلایەنـی مولکیـە و ئەندامانـی قۆمیسـیۆنی پشـکنینی سـەربازی عالـی لـە هـەر یەکەیـان دوو کـەس هەڵدەبژێردرێـت و لـە دەسـتەیەك دادەمەزرێـن و ڕەوان دەکرێـن، جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا فەرموویەتـی و نەزارەتـی ناوەخـۆی جەلیلـەش ئاگادارکراوەتـەوە، یاریـدەدەری بەڕێوەبـەری ناوەخـۆی مەکتوپچـی و بەڕێوەبـەری قەڵەمـی فەرمانبـەران تۆفیق بەگ ئەفەنـدی لەگـەڵ نەجیـب بـەگ کـە لـە موتەسـەرفیەتی فـەزان جیابۆتـەوە، دەسـت بـە کارەکـە دەکـەن، هەروەهـا بـۆ ئـەم خزمەتـەی ناوبـراوان هـەر یەکـە ٥٠٠٠ قـوروش زیـادە دەچێتـە سـەر مووچەکەیـان، لەگـەڵ ڕێـژەی ئـەو مووچەیـەی کـە وەریدەگـرن خەرجـی ڕێـگای چـوون و هاتنیـان پـێ دەدرێـت، جگـە لەمـە نەجیـب بـەگ کـە مووچـەی دابراوانـی بـۆ بەسـتراوەتەوە، حاڵـی حـازر رادەگیرێـت، لـە نەزارەتـی ناوهاتـوو نـووسراو ڕاگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت، بـە ڕاگەیاندنـی نـووسراو نووسرایـەوە ئەفەنـدم، لـە ١١ رەبیعـی کۆتایـی ١٣١٨ و لـە ٢٥ تەممـوز ١٣١٦.
سەدری ئەعزەم




| 22 رەبیعی یەکەم 1318 | 001520.113982 | BEO. |
|---|---|---|

٢٢ رەبیعی یەکەم ١٣١٨
٦ تەمموز ١٣١٦
نووسراو بۆ لایەنی عالی لە نەزارەتی دادی جەلیلە
مستەفا کامل ئەفەندی سەرۆکی فەرمانگەی سزای دادگای سەرەتایی سانجەقی کەربەلا لە کارەکەی دوور خراوەتەوە و لە شوێن ئەو سەعید ئەفەندی سەرۆکی فەرمانگەی سزای دادگای سەرەتایی سانجەقی سلێمانی دامەزراوە؛ موسا کازم ئەفەندی یاریدەدەری داواکاری گشتی سانجەقی میدیللیش دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەو سلێمان سەرۆکی دادگای سەرەتایی قەزای ئۆرتەکۆی دابنرێت؛ عابدین ئەفەندی بۆ سەرۆکایەتیەکانی هەندێك دادگای سوڵح هەڵبژێردراوە؛ ئەمانە دوای سوێند خواردنیان دامەزرێن، بۆ ئەم مەبەستە راپۆرتی عالی لە مێژووی ٣٠ سەفەر ١٣١٨ ژمارە ٢٢٣ دوای رەزامەندی لە مێژووی ٢٠ رەبیعی یەکەم ١٣١٨ جەنابی خەلافەتپەناهی بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، کارەکە جێبەجێ بکرێت.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1533 114923

| BEO. | 001533.114923 | 17 ڕەبیعی کۆتایی 1318 |
|---|---|---|

١٧ ڕەبیعی کۆتایی ١٣١٨
٣١ تەمموز ١٣١٤
بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر و نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بۆ ئەنجامدانی هەندێك لێکۆڵینەوە لە سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی، بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا، میری ئالای وەلی بەگ لە ئەندامانی چاودێری سەربازی قۆمیسیۆنی عالی دەنێردرێت، بە نووسراوی تایبەتی مابەینی هومایۆنی باش کیتابەتی جەلیلە ئاماژەی پێکراوە و چۆنیەتیشی لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە نووسراوی بۆ کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1541 115565

| 2 جەمادی یەکەم 1318 | 001541.115565 | BEO. |
|---|---|---|

٢ جەمادی یەکەم ١٣١٨
١٥ ئۆغستۆس ١٣١٦
بۆ لایەنی عالی لە نەزارەتی دادی جەلیلە
خالد بەگ سەرۆکی سزای سانجەقی بەرات لە سەرۆکایەتی فەرمانگەی سزای سانجەقی دەنیزلی دادەمەزرێت، لە شوێن ئەویش عەبدوڵلا ناجی سەرۆکی فەرمانگەی سزای پێشووی سانجەقی پیریشتینە هەروەها نەزیف یاریدەدەری داواکاری گشتی سانجەقی ماردین لە سەرۆکایەتی سزای سانجەقی سلێمانی، بۆ ئەم یاریدەدەرەش رەئوف ئەفەندی کە لە یاریدەدەری داواکاری گشتی سانجەقی مونتەفیك جیابۆتەوە، خەریکە سوێند خواردنیان جێبەجێ دەکرێت، بۆ گواستنەوەی ئەرکەکەیان و دامەزراندنیشیان لەسەر راپۆرتی عالی لە مێژووی ٢٧ رەبیعی یەکەم ١٣١٨ ژمارە ٢٧٠ جەنابی خەلافەتپەناهی بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، لە جێبەجێ کردن دایە.



| 5 رەجەب 1318 | 001573.117914 | BEO. |
|---|---|---|

٥ رەجەب ١٣١٨
١٧ تشرینی یەکەم ١٣١٦
بۆ نەزارەتی خەزینەی تایبەتی شاهانەی عالی
لە سانجەقی سلێمانی ئەو ناوچەیەی کە بە ناوی سێگردکان زانراوە هەموو زەوییەکەی بێ خاوەنە، بۆیە خراوەتە زیادکردنەوە، ئەو زەوییانە کە بۆ زیادکردنەکە شوێنگرەوەی هەیە، بە ٦٠٠٠ قوروش دەفرۆشرێت، بەم کڕین و فرۆشتنە زەوی ئەملاکی هومایۆن زیاد دەبێت، دەرکەوتووە ئاماژەی والا فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت دەرچووە بۆ جێبەجێ کردنی، بڕە پارەی ناوهاتوو لە داهاتی ساڵی ٣١٤ ی خەزینەی تایبەتی شاهانە مامەڵەی هەژمار کردنی بۆ جێبەجێ دەکرێت، بە ناوی دارایی ویلایەتی موسڵ تۆمار کراوە، تۆمارەکەی بۆ شوێنی خۆی نێردراوە، هەروەها لەگەڵ نەزارەتی عالی زانیاری دراوەتە نەزارەتی دەفتەرخاقانی جەلیلە، لەسەر نووسراوی ٨ رەبیعی کۆتایی ٣١٧ ژمارە ١٤؛ وەڵام بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە نووسراوەتەوە، بەم راگەیاندنەش نووسراو دەکرێت.
بە ئاماژەی جەنابی راوێژکار



صدارت عظمی مکتوبی قلمی

مالیه نظارت جلیله سنه تذکره

سلیمانیه سنجاغی محاسبه جیلکنه حمید آباد سنجاغی محاسبه جیلکندن منفصل مصطفی نیازی
افندینک تعیینی خصوصنه ۹ جمادی الآخره ۳۱۸ تاریخلی و ۱۰۵۵ نومرولو تذکرهٔ دولتلری
اوزرینه مأموریت ملکیه قومیسیونی قراریله بالاستیذان ۲۲ رجب ۳۱۸ تاریخنده اراده
سنیهٔ جناب خلافتپناهی شرفصدور بیورلمغله ایفای مقتضاسنه همت .

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1584/118745

2ork
(1oht boş)

| 1318 ڕەجەب 25 | 001584.118745 | BEO. |
|---|---|---|

٢٥ ڕەجەب ١٣١٨
٥ تشرینی دووەم ١٣١٦
نووسراو بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
مستەفا نیازی ئەفەندی کە لە ژمێریاری سانجەقی حەمید ئاباد جیابۆتەوە، لە ژمێریاری سانجەقی سلێمانی دادەمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر نووسراوی مێژووی ٩ جەمادی کۆتایی ١٣١٨ ژمارە ١٠٥٥ لەگەڵ بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە؛ لە مێژووی ٢٢ ڕەجەب ١٣١٨ فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی، هیمەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1638 122820

2 vrk
(2 shf boş)

| 5 زیلحیجه 1318 | 001638.122820 | BEO. |
| --- | --- | --- |

٥ زیلحیجه ١٣١٨
١٣ مارت ١٣١٧
نووسراو بۆ نەزارەتی دارایی جەلیله
لـە مووچـەی دەسـتکورتانی سـانجەقی کەرکـووك و سـلێمانی، ٥٣٧ قـوروش بـێ خاوەنـە، وەکـو سـەدەقەی جەنابـی خەلافەتپەناهـی؛ لـە سـلێمانی بدرێتـە شـێخ مەعسـوم ئەفەنـدی شـێخی تەریقەتـی خالدیـە، لەگـەڵ هاوپێچـی نەزارەتـی ناوەخـۆی جەلیلـە دراوەتـە سـەروو، لـە نـووسراوی مێـژووی ٣ زیلحیجـە ١٣١٨ ژمـارە ١٥٤ نووسراوەتـەوە، بـە تێروانیـن لـەم نووسراوانـە هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.



DH.MKT.02339.00043.001

| DH.MKT. | 02339.00043 | 2 موحەررەم 1318 |
|---|---|---|

٢ موحەررەم ٣١٨
١٧ نیسان ٣١٦
بۆ ئەمانەتی رسوماتی جەلیلە
لەسەر ئەو ئاماژە و هەواڵانەی لەسەر عەبدولقادر ئەفەندی باش کاتیبی رسوماتی پێشووی سانجەقی سلێمانی کراوە؛ دادگایی کراوە و لە ئەنجامدا بێتاوانی دەرکەوتووە، کەچی تا ئێستا نەگەڕاوەتەوە سەر ئەرکەکەی، ماوەی پێنج ساڵە، بێ کار ماوەتەوە و حاڵی خراپە، بۆیە ناوبراو داواکاری پێشکەش کردووە و داوای کردووە بگەڕێتەوە سەر کارەکەی، داواکاریەکەی لەگەڵ هاوپێچەکانی نێردراوە، بە تێروانین لە وێنەی داواکاریەکە و زانیاری ئەمانەتی جەلیلە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



DH.MKT.02395.00109.001

| 29 رەبیعی کۆتایی 1318 | 02395.00109 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٩ رەبیعی کۆتایی ١٣١٨
١٢ ئۆغستۆس ١٣١٦
بـۆ قەڵەمـی مەکتوپچـی ناوەخـۆی بەڕێوەبـەری مەعاریـف و بەڕێوەبـەری قەڵەمـی فەرمانبـەران لـە پلـەی میـری میـران جەنابـی تۆفیـق بـەگ ئەفەنـدی لەگـەڵ نەجیـب بـەگ کـە لـە موتەسـەرفیەتی خـەزان جیابۆتـەوە هەروەهـا والـی بـەگ پشـکێنەری سـەربازی میـری ئـاڵای و ئەندامـی قۆمیسـیۆنی عالـی

بە مەبەستی ئەنجامدانی کاری پشکنین لە سانجەقەکانی کەرکوك و سلێمانی، ئەمر و فەرمانی هومایۆنی جەنابی پەیوەندیدارانی خەلافەت دەرچووە و تێدا هاتووە؛ لە لایەنی دەستەی مولکیە، نەجیب کە لە موتەسەرفیەتی خەزان جیابۆتەوە، هەروەها لەلایەنی سەربازی، والی بەگ پشکێنەری سەربازی میری ئاڵای و ئەندامی قۆمیسیۆنی عالی دادەمەزرێن و روو دەکەنە ناوچەکە، بۆ ئەم مەبەستە جەنابی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت و چۆنیەتی کارەکەش بە ئەندامانی تری دەستە رابگەیەندرێت، هەر ئێستا لەسەر پێویستی جموجۆڵیان ئاگاداری دەرچێت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
2419 124

DH.MKT.02419.00124.001

| 1 ڕەجەب 1318 | 02419.00124 | DH.MKT. |
|---|---|---|

یەکەم ڕۆژی ڕەجەب ٣١٨
١٢ تشرینی یەکەم ٣١٦
جەنابی لایەنی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
موتەسەرفی مەراش غالب پاشا لە کاتی خۆی کە لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی بووە، لە ساڵی ٣١٦ بۆ ناردنی ژمارەی ئەو سەربازانەی کە وەردەگیرێن، داوای پەسەند کردنی کردووە، هەروەها بە فەرمانی هومایۆن پایەی میری میرانی ڕومەلی پێدراوە، کە بە گشتی لە هەموو لایەك پیرۆزبایی لێکراوە، کەچی تا ئێستا چۆنیەتی کارەکە دەرچووە، بەڵام ڕانەگەیەندراوە، لە بارەی جێبەجێ کردنی کارەکە لەلایەن موتەسەرفی مەراش غالب پاشا داواکاری نێردراوە، هاوپێچ پێشکەش کراوە، بەڵام نەزارەتی عاجیزانەم زانیاری لە بارەیەوە نییە، چۆنیەتی کارەکەش لە قەڵەمی دیوانی هومایۆن، لە نووسراوی فەرمانی عالی هەڵە کراوە، بە دەرکەوتنی ئەم هەڵەیە، کارەکە جێبەجێ بکرێت، جگە لەمە فەرمان و ڕاگەیاندن بۆ پایەبەرزە.



| 18 ره‌جه‌ب 1318 | 02427.00026 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٨ ره‌جه‌ب ١٣١٨
٣٠ تشرینی یه‌كه‌م ١٣١٦
بۆ ویلایه‌تی موسڵی عالییه
له باره‌ی پاداشت كردنی حاله‌ت ئه‌فه‌ندی به‌رێوه‌به‌ری تۆماری سلێمانی، له مێژووی ١٥ ئۆغستۆس ١٣١٦ ژماره ٥٦ ی نووسراوه‌كانی عالی ئاماژه‌ی پێكراوه، به‌ڵام له تۆماری زانیاری ئاماژه‌ی پێكراوه كه كاغه‌زی وه‌رگێردراوی زانیاری كه‌سێتی نه‌هاتووه.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

يلدز سراى همايونى
باش كتابت دائره سى
٤٦٨٤

261/85
İ. TAL. 1319/C-85

İ.TAL.00261.00085.001

| 26 جەمادی کۆتایی 1319 | 00261.00085 | I.TAL. |
|---|---|---|

کۆشکی یلدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
٤٦٨٤
راگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە
بە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی رەزامەندی دراوە کە عەبدولرەحمان بەگ لە ئەشرافەکانی سانجەقی سلێمانی، یەك نمرە پلەکەی بەرز بکرێتەوە، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٦ جەمادی کۆتایی ١٣١٩ و لە ٢٦ ئەیلوول ١٣١٧.
جەنابی شەهریاری سەر کاتیب


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

262/1

İ.TAL. 1319/C-101

İ.TAL.00262.00001.001

| 24 جه‌مادی كۆتایی 1319 | 00262.00001 | I.TAL. |
|---|---|---|

كۆشكی یڵدزی هومایۆن
فه‌رمانگه‌ی باش كیتابه‌ت
٤٦١٣
له‌لایه‌ن جه‌نابی خه‌لافه‌تپه‌ناهی به فه‌رمانی پاشا؛ سه‌ید محه‌مه‌د غه‌ریب ئه‌فه‌ندی به‌ڕێوه‌به‌ری ناحیه‌ی قه‌ره‌داغی سه‌ر به سانجه‌قی سلێمانی، وه‌كو پاداشت پله‌ی سێیه‌می پێ به‌خشراوه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ڕه‌زامه‌ندی عالی له‌سه‌ره، له‌م بابه‌ته ئه‌مر و فه‌رمان بۆ جه‌نابی ئه‌و كه‌سه‌یه كه فه‌رمان ده‌رده‌كات، له ٢٤ جه‌مادی كۆتایی ١٣١٩ و له ٢٤ ئه‌یلوول ١٣١٧.
جه‌نابی شه‌هریاری سه‌ر كاتیب




DH.MKT.00465.00025.001

| DH.MKT. | 00465.00025 | 21 زیلحیجه 1319 |
|---|---|---|

٢١ زیلحیجه ٣١٩
١٨ مارت ٣١٨
نەزارەتی دارایی جەلیلە
شوێنگرەوەی کرێی ئەو خانانەی کە تایبەتە بە سەربازی شاهانە لە موازەنەی ویلایەتی دیاربەکر تۆمار کراوە، لەسەر ئەو خانەیەی کە لە سانجەقی سلێمانی لە سەرەتای تەمموزی ساڵی ٣١٧ دا دەکرێتە گرتووخانەی ئافرەتان؛ بە کرێ گیراوە و مانگانە ٢٥ قوروشی بۆ دابین کراوە، هەروەها سەلیمە کچی وەلی وەکو گاردیان دادەمەزرێت، ٢٥ قوروشی بۆ دابین دەکرێت، بە کۆکراوەیی مانگانە دەبێتە ٥٠ قوروش و بۆ ناردنی حەواڵەنامە لە نووسراوی مێژووی ٢٠ کانوونی دووەم ٣١٧ ژمارە ١٣٠ی ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە، نرخی باسکراو لە مێژووی باسکراوەوە تا کۆتایی شوباتی هەمان ساڵ بڕەکەی کە دەکاتە ٤٠٠ قوروش لە پارەوپولی ویلایەتی دیاربەکر ڕێکخراوە، پێویست دەکات یەك پارچە حەواڵەنامە بنێردرێت، بە ووتەی ژمێریاری نووسراو کراوە بۆ ڕاگەیاندنی.



| 27 جەمادی کۆتایی 1319 | 001731.129815 | BEO. |
|---|---|---|

٢٧ جەمادی کۆتایی ١٣١٩
٢٧ ئەیلوول ١٣١٧
بۆ لایەنی والای سەر عەسکەریمان
لە ئەشرافەکانی سانجەقی سلێمانی؛ محەمەد ئاغا پلەی یوزباشی ژاندارمەی دراوەتێ، نووسراوی تایبەتی مابەینی هومایۆنی ملوکانەی باش کیتابەتی جەلیلەش راگەیەندراوە، بە دەرچوونی فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی جێبەجێ بکرێت.

صدارت مکتوبی قلمی

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| نومرو ۸۰۲ | تاریخ ورودی ۲۰ ۲۰ | تاریخ تسویدی جمادی الآخرة ۱۳۱۷ | | |
| مقابله ایدن | مبیض | مسوده | | |

مالیه نظارت جلیله سنه تذکره

سلیمانیه سنجاغی اشرافندن توفیق افندییه اوچ یوز غروش معاش تخصیصی حقنده ...

بو بابده اراده سنیه جناب خلافتپناهی ایجاب عالیسنده ... ایفای مقتضاسی همت .

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1733 / 129928

2 vrk
(1 sht 6os)

| 1 رەجەب 1319 | 001733.129928 | BEO. |
|---|---|---|

١ رەجەب ١٣١٩
١ تشرینی یەکەم ١٣١٧
نووسراو بۆ نەزارەتی دارایی جەلیله
بۆ برینەوەی مووچەیەکی ٣٠٠ قوروشـی بۆ تۆفیق ئەفەندی کە لە ئەشرافەکانی سـانجەقی سـلێمانییە، لە مێژووی ٢٦ جەمـادی کۆتایـی ١٣١٩ فەرمانی پاشـای جەنابی خەلافەتپەناهـی فەرموویەتی، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1747 131020
2vrk
(2 Shf boş)

| BEO. | 001747.131020 | 7 شەعبان 1319 |
|---|---|---|

٧ شەعبان ١٣١٩
٥ تشرینی دووەم ١٣١٧
بۆ لایەنی عالی لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بە پشت بەستن بە كۆڵكەی تایبەتی بریارەكان جەنابی محەمەد عارف پاشا موتەسەرفی پێشووی سانجەقی سلێمانی مانگانە ١٨٠٠ قوروش مووچەی دابراوانی بۆ دەبرێتەوە، بە بریاری شورای دەوڵەت دوای رەزامەندی؛ لە مێژووی ٩ تەمموز ١٣٢٥ جەنابی خەلافەتپەناهی بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، بە نەزارەتی سندوقی مولكیەی خانەنشین و دابراوانی بەهیەش راگەیەندراوە كە كارەكە چۆن بەرێوە بچێت، هەروەها حەواڵەی نەزارەتی جەلیلە كراوە و لە نووسراوی شورای دەوڵەت باسكراوە كە ناوبراو لە یەكێك لە موتەسەرفیەتەكان هەڵبژێردرێت، هیممەت بكرێت لە جێبەجێ كردنی.

بۆ نەزارەتی سندوقی مولكیەی خانەنشین و دابراوانی بەهیە
نووسراوی راگەیەندراو وێنەكانی لە بالادا نووسراوەتەوە، هەروەها جەنابی خەلافەتپەناهی فەرمانی پاشاییەكەی دەرچووە، بە گوێرەی ئەم برەیەی دیاریكراوە هیممەت بكرێت و لە نەزارەتی سندوقی مولكیەی خانەنشین و دابراوانی بەهیە كارەكە جێبەجێ بكرێت.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1786 133947

2 vrk
(2 shf boş)

| 1319 شەوال 22 | 001786.133947 | BEO. |
| --- | --- | --- |

٢٢ شەوال ٣١٩
١٩ کانوونی دووەم ٣١٧
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
سانجەقی سلێمانی لە چاو سالانی پێشوو، پر خێر و بەرەکەت بووە، بەڵام زۆربەی کارە کارگێڕیەکانی بە شێوەی ئەمانەت بەڕێوەدەچێت، کە داهاتی دە یەك و پشکی داهاتی جۆراوجۆر بۆ پلەی سێ یەك نزم بۆتەوە، نیازی ئەفەندی ژمێریار و ئەمین ئەفەندی کاتیبی خەرجی بەهۆی خراپ بەڕێوەبردنی کارەکەیان، کارەکان زیاتر ئاڵۆزبووە؛ بۆ ئەوەی ئەم حاڵەتە بە ئەنجامێك بگات، ناوبراوان دوور بخرێنەوە و مەعروف بەگ باش کاتیبی ژمێریاری کەسێکی لێهاتوو و بە توانایە هەروەها بۆ خەرجی تۆمارکردنیش کەسێکی گونجاو دابمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە قوماندان و موتەسەرفی سلێمانی بە هاوبەشی تەلەگرافنامە دەرچووە و بۆ سەروو بەرز بۆتەوە، بە تێروانین لە بابەتەکە پێویستە لێکۆڵینەوە و ووردبینی بکرێت، هەر ئێستا دەست بە کارەکان بکرێت و هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی و راگەیاندنی.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1812 135892

| BEO. | 001812.135892 | 5 زيلحيجه 1319 |
|---|---|---|

٥ زيلحيجه ١٣١٩
٢ مارت ١٣١٨
بۆ لایەنی والآی سەر عەسکەریمان
هاوپێچی نووسراوی ٢٦ زیلقەعدە ١٣١٩یە، لە بارەی ئاسایشی سانجەقی سلێمانی لەلایەن قۆمیسیۆنی ئەملاکی هومایۆن ئاماژە نێردراوە و ئامادەکاری کراوە، لەگەڵ ئەمەش لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە ئاگاداری دەرچووە، دوای گفتوگۆکردن رابگەیەندرێت ئاسایشی لیوای ناوهاتوو لە چ ئاستێکە، ئەمەش بە موشیرەتی لەشکری شەشەم بوترێت و بە گوێرەی ئەو وەڵامەی وەردەگیرێت، سەروو ئاگادار بکرێتەوە، نووسراوی بە وەڵامی سەر عەسکەر لە مێژووی ٢٥ زیلقەعدە ١٩٦٤ بۆ نەزارەتی ناوهاتوو نێردراوە، لەم کاتەدا لە نەزارەتی ناوهاتوودا هاوپێچی نوسراو لە مێژووی ٣٠ زیلقەعدە ١٣١٩ ژمارە ٥٦٦٧ هاتووە، یەکەی ئەملاکی هومایۆنی سەرچنار لەلایەن دانیشتوانی گوندەکە هێرشی کراوەتە سەر و پارەوپول و ئاژەڵەکانی تالان کراوە، بۆ دیاریکردنی برەکەی و لەبەر ئەوەی لەم لایەنە بۆتە نەریت لەگەڵ فەرمانبەرانی هەژماری مەرومالات هێزی پۆلیسی پاراستن وەکو هێزی پاڵپشت لەگەڵیان دەنێردرێت، بۆیە داواکراوە سێ چوار بلۆکی سەربازی سوارەیان بدرێتی، هەروەها بە گوێرەی گشت وتەکان ئەو ئاماژەیەی لە ویلایەتی موسڵ دەرچووە، ئەگەر سەرباز نەدرێت؛ خەزینەی جەلیلە زیانی پێ دەگات، بۆیە لە شوێن خۆی فەرمانی پێویست دراوە و بە تێروانین لەم نێوەندە جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت، نووسراوەکەش بگەڕێندرێتەوە.

بە ئاماژەی جەنابی راوێژکاری عالی

| 8 زيلحيجه 1319 | 001812.135897 | BEO. |
|---|---|---|

٨ زیلحیجه ١٣١٩
٥ مارت ١٣١٨
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
هاوپێچی نووسراوی مێژووی ٢٩ زیلقەعدە ١٣١٩ ...... لە بارەی بارودۆخی سانجەقی سلێمانی لەسەر هەندێك ووتە و ئاماژەوە کە لە ئەنجوومەنی کارگێری موسڵەوە هاتووە، بە گفتوگۆ جێبەجێ کردنی بە سەروو راگەیەندراوە، بە حەواڵەکردنەوە بە بابی عالی راگەیەندراوە، بە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی نووسراوی تایبەتی مابەینی هومایۆنی ملوکانەی باش کیتابەتی جەلیلە نێردراوە، وێنەی تەلەگرافی بریارنامەکە بە هاوپێچەوە بۆ دەوڵەت نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە و ئاماژەکانەوە جێبەجێ بکرێت، بەپەلە رابگەیەندرێت و هیممەت بکرێت.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1818 | 136335

2 vrk
(2 sht boş)

| BEO. | 001818.136335 | 20 زيلحيجه 1319 |
|---|---|---|

٢٠ زيلحيجه ١٣١٩
١٧ مارت ١٣١٨
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
وێنەکانیان لە بالا نووسراوەتەوە و نووسراوی راگەیەندراو و فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهیمان کە هاتووە، بە گوێرەی بڕی پەراوێزەکە لە نەزارەتی دارایی جەلیلە داواکراوە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

لە بارەی دامەزراندنی حوسنی ئەفەندی بەڕێوەبەری تۆمارکردن و باج، بە ناوی ژمێریاری سانجەقی سلێمانی دەرچووە.




| 21 زیلحیجه 1319 | 001820.136478 | BEO. |
|---|---|---|

٢١ زیلحیجه ١٣١٩
١٨ مارت ١٣١٨
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیله
بـۆ چاك كردنی بارودۆخی ئێستای سانجەقەكانی كەركووك و سلێمانی، بە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیدارانی خەلافەت هێزی سەربازی ڕێكخراوە، بۆ خەرجی پێداویستی گەشتەكەیان و خەرجی ڕۆیشتنیان هەر ئێستا دابین بكرێت، هەروەها بە ڕێك نەخستنی خەرجیەكە فەرمانی چاكسازیەكەش كێشەی تێ دەكەوێت، چونكە هێنانی ئەوانە بۆ دەشتایی و لەگەڵ ئەو ڕەدیفانەی كە دەهێنرێن چەكیان پێ دەدرێت و چاوەڕێی ئەنجامدانی كاری پێویست دەكەن، جگە لەمە كاروكردەوەی چەتەگەری و ئاژاوەگێری هەمەوەند و پشدەریەكان زیاد دەكات، و بە تەواوەتی لە خۆبایی دەبن، بۆ ئەم كارە میری میران موحسین پاشا ئەركی پێ سپێردراوە، تەلەگرافنامە لەلایەن ناوبراوەوە نێردراوە و ئاماژەی پێكراوە، بە نووسراوی سەر عەسكەر لە مێژووی ١٩ زیلحیجە ١٣١٩ ژمارە ١٥٣ جێبەجێ دەكرێت، بە پەلە كارەكە جێبەجێ بكرێت و رابگەیەندرێت هەروەها هاوپێچەكانی بنێردرێتەوە.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1823 136709

| BEO. | 001823.136709 | 1319 زیلحیجه 27 |
|---|---|---|

٢٧ زیلحیجه ١٣١٩
٢٤ مارت ١٣١٨
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
هاوپێچی نووسراوی مێژووی ٢٣ زیلحیجە ١٣١٩یە، بۆ چاکسازی بارودۆخی ئێستای سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی، ئەمر و فەرمانی هومایۆنی شاهانە ڕێکخراوە، لە هێزی سەربازی ئەو تابورە نیزامیەی کە لە موسڵە فەرمان دراوە بۆ کەرکووك جولە بکات، بەڵام خەرجیەکەی ڕێکنەخراوە، بۆیە جولەیان نەکردووە، هەروەها داهاتی تابورەکانی ڕەدیف کە حەواڵە کراوە، ئەوەی وەریگرتووە نەیناردووە، ئەمەش وایکردووە ڕۆیشتنیان دوا بکەوێت، بۆیە بە فەرمانی دابین کردنی داهاتی تابورەکانی ڕەدیف، بە پەلە داهاتەکە بنێردرێت و بۆ چاکسازیەکەش ئەو تابورە نیزامیەی کە بۆ بازیان جولە دەکات، بڕە پارەکەیان بۆ دابین بکرێت، لە وەڵامدا لە مێژووی ٢٤ زیلحیجە ١٣١٩ ژمارە ٢١٥ هاوپێچ نووسراوی عالی لە سەرعەسکەر نێردراوە، بە ئاماژەی موشیرەتی لەشکری شەشەمی هومایۆنی جەلیلە بابەتەکە ڕوون و دیارە، هەروەها بە تێروانین لە ئاماژەی پێشوو هەرچی زووە جێبەجێ بکرێت، هیممەت بکرێت لە ئەنجامدانی کارەکە و ڕاگەیاندنی و ناردنەوەی هاوپێچەکانی.



DH.MKT.02493.00065.001

| 17 سەفەر 1319 | 02493.00065 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٧ سەفەر ١٣١٩
٢٢ مايس ١٣١٧
بۆ لایەنی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
لـە سـانجەقی سـلێمانی و گەرەكـی موسـەوی سـەر لـە نـوێ لەلایـەن میللەتـی ناوهاتـوو داواكـراوە پەرسـتگایەك لـە پانـی دوو خانـە یەكێـك ٦٠ ئـەوی تـر ٥٠ قۆڵـە، دروسـت بكرێـت، تەنانـەت وێنەكەشـی كێـشراوە و نێـردراوە، لـە موتەسـەرفی خۆچێـی ئـاگادارن و پەرسـتگای باسـكراو درێژیەكـەی ٣٠ و پانیەكـەی ٢٠ هەروەهـا بەرزیەكـەی لـە ٣ مەتـر پێـك دێـت، شـوێنی باسـكراو لەگـەڵ سـەنەدی خاقانـی مولكـی خۆیانـە؛ هەروەهـا مزگـەوتی شـەریفە و قـەڵای خاقانـی نـە لـە نزیـك و نـە لـە دەوروبـەری نییـە، بۆیـە لـە دروسـت كردنـی هیـچ كێشـەیەك نییـە، جگـە لەمـە لـە ئامـاژەی ناوەخـۆ دەركەوتـووە خەرجـی دروسـت كردنـی پەرسـتگای ناوهاتـوو لەلایـەن میللەتـی ناوهاتـووەوە رێكخـراوە، بـە ناردنـی وێنـەی پەرسـتگاكەش لـە ئەنجوومەنـی كارگێـری ویلایەتـی موسـڵ لـە مێـژووی ٢ نیسـان ١٣١٧ ژمـارە ٧ بریارنامـە وەرگیـراوە و بـە پێشـكەش كردنـی رەزامەنـدی دراوە.



DH.MKT.02552.00090.001

| 24 رەجەب 1319 | 02552.00090 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٤ رەجەب ١٣١٩
٢٣ تشرینی یەکەم ١٣١٧
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
لەبەر کارە باشەکانی عەزمی بەگ فەرمانبەری ناسنامەی سانجەقی سلێمانی، پلەکەی لە پلەی سێیەم بۆ پلەی دووەم بەرز بۆتەوە، لە نووسراوی مێژووی ١٧ ئەیلوول ١٣١٧ ی موتەسەرفیەتی لیوای ناوهاتوو ئاماژەی پێکراوە، بەڵام ئەمرۆ ئەرکی باسکراو لە ژێر دەسەڵاتی رەشید ئەفەندی دایە، لە بارەی عەزمی بەگ هیچ تۆمارێك بەردەست نییە بسەلمێنێت دامەزراوە، هەر لە یەکەم کاردا راگەیەندراوی ئەم لایەنە و بە شایەن زانینی پاداشت کردنی ناوبراو، جگە لەمە لە بارەی کۆتایی پێ هێنان، بە ووتەی کارگێری گشتی تۆماری ناسنامە پەلە کراوە لە راگەیاندنی، هەروەها نووسراوی ناوهاتوو لەگەڵ هاوپێچەکانی بۆ والآ نێردراوە.



DH.MKT.02557.00055.001

| 5 شەعبان 1319 | 02557.00055 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٥ شەعبان ١٣١٩
٣ تشرینی دووەم ١٣١٧
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
هاووڵاتی ئێرانی ئاغا حەسەن كوڕی جەعفەر قولی ساڵ و نیوێك پێش ئێستا كە ویستویەتی بچێتە سەردانی پایەبەرزەكانی سەروەران (ئەو كاتە شیعەكان سەردانی نەجەف و كەربەلا و كازمیەیان دەكرد، لە دەوڵەتی عوسمانی بە پایەبەرزەكانی سەروەران ناویان هاتووە)، لە ناو سانجەقی سلێمانی شارۆچكەی چەمچەماڵ لە ماوەی كاتژمێرێك و نیو لەلایەن دانیشتوانی گوندی كانی كوا بە ناوی خورشید و كوڕی حەمە بەهرام و قادر قاوەچی و حەمە و فەرەج و حەمەی كوڕی سەعید لە پیاوەكانی شێخ حەسەن زادە شێخ نوری ئەفەندی لەگەڵ هەندێك هاوەڵەوە ٢٨ لیرە و كەلوپەلی تالان كراوە، بۆ گەڕانەوەی ئەم كەلوپەلانە لە باڵیۆزخانەی ئێران ڕاگەیەندراوێك نێردراوە، بۆ جێبەجێ كردنی كارەكە لە مێژووی ٢٤ تشرینی یەكەم ١٣١٧ ژمارە ٥٩٧ لە نووسراوی نەزارەتی دەرەوەی جەلیلە تێدا ئاماژەی پێ كردووە كە بەپەلە لێكۆڵینەوەی لەسەر بكرێت و هیممەت بكرێت لە ڕاگەیاندنی ئەنجامەكەی.




| 2 رەمەزان 1319 | 02568.00053 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢ رەمەزان ١٣١٩
٢٩ تشرینی دووەم ١٣١٧
بۆ ویلایەتی ئەنقەرەی جەلیلە
دوای ئەوەی عەلی هەمەوەندی دانیشتووی سانجەقی سلێمانی بۆ ئەنقەرە دوورخرایەوە، ماوەی ١٢ ساڵە لە قیرشەهیر نیشتەجێ بووە، بۆ بەرێوەبردنی بژێوی ژیانی خۆی ڕۆژانە ٥ قوروشی بۆ براوەتەوە، بەڵام بژێوی ژیانی خێزانەکەی پێ دابین نەکراوە، ئەگەرچی دوو ساڵ وەکو ئەندامی سوارەی ژاندارمە کاری کردووە، بەڵام ئەمجارە بێ کار ماوەتەوە و لەبەر خراپی بژێوی ناوبراو کە لە گەرەکی مەدرەسەی قیرشەهیر نیشتەجێیە داواکاریەکی بە واژووی خۆی پێشکەشی جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت کردووە، هاوپێچ بە تێروانین لە وێنەیەکی داواکاریەکە، هیممەت بکرێت و ناوبراو لە شوێنێکی گونجاو کارێکی پێ بسپێردرێت.




| 1 زیلحیجه 1319 | 02598.00080 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١ زیلحیجه ١٣١٩
٢٦ شوبات ١٣١٧
نەزارەتی پۆستە و تەلەگرافی عالی
بەهـۆی حاڵـی خراپـی موحـەررەم ئەفەنـدی بەڕێوەبـەری تەلەگرافـی سـانجەقی سـلێمانی؛ بـە پێویسـت زانـراوە ناوبـراو بگۆردرێـت، لـە مێـژووی ١٩ کانوونـی دووەم ١٣١٧ ژمـارە ٧٤ لـە ویلایەتـی موسـڵەوە هاتـووە لەگـەڵ هاوپێچەکانـی نێـردراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA) ©

یلدز سرای همایونی
باش کتابت دائرەسی

ترجمه

Y.PRK.UM 62/66

Y.PRK.UM.00062.00066.001

| Y.PRK.UM. | 00062.00066 | 29 زيلحيجه 1320 |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
وەرگێران
عەبدوللەتیف پاشا موتەسەرفی کەربەلا، لە کەربەلا خزمەتی دڵسۆزانەی ئەنجام داوە، سەرەتاش پێم راگەیاندبوون، لە بەرامبەر ئەو خزمەتانەی کە کردوویەتی پێویستە وەکو والی لە یەکێک لە ویلایەتەکان دامەزرێت، کەچی بابی عالی لە جیاتی ئەوەی پاداشتی بکات، ناوبراوی گواستۆتەوە بۆ سلێمانی، بۆیە داوا دەکەم پاشا بە خۆی دابچێتەوە و بەزەیی بە ناوبراودا بێتەوە.
عەبدولعەزیز رەشید


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞIVI
DH.TMIK.M
125 | 46 | 4

DH.TMIK.M.00125.00046.004

| DH.TMIK.M. | 00125.00046 | 20 سەفەر 1320 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی دەرەوە
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٩٦٣
جەنابی سەدری ئەعزەم لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
ڕاگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە
قادر ئاغای هەمەوەند کە لە سانجەقی سلێمانی مولازمی پۆلیسی پاراستن بووە، لە کارەکەی لادراوە، دوای ئەوەی هەستی بەبێ هیوایی کردووە بە نیەتی ئەوەی هانا بۆ حکوومەتی ئێران ببات، ڕووی کردۆتە تەهران، بەڵام بۆ ئەوەی بگەڕێندرێتەوە سلێمانی، ئەرکێکی گونجاوی پێ بدرێت و خەرجی ڕێگای بۆ دابین بکرێت و بگەڕێندرێتەوە سلێمانی، لەم بارەیەوە داوای زانیاری کراوە و لە باڵیۆزخانەی تەهران تەلەگرافنامە وەرگیراوە لەگەڵ نووسراوی بەندە لە مێژووی ١٠ سەفەر ١٣٢٠ پێشکەش کراوە، بۆ دووپاتکردنەوە ئەمجارە لە باڵیۆزخانەی ناوهاتوو تەلەگرافنامە هاتووە، هاوپێچ ڕاگەیاندن و جێبەجێ کردنی فەرمانەکە دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی عالی، ئەمر و فەرمان بۆ ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٠ سەفەر ١٣٢٠ و لە ١٥ مایس ١٣١٨.
نازری دەرەوە



DH.TMIK.M.00140.00019.006



DH.TMIK.M.00140.00019.003

| DH.TMIK.M. | 00140.00019 | 23 زیلحیجه 1320 |
|---|---|---|

- نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لە سانجەقی سلێمانی؛ سەیدەکانی جەباری لەگەڵ تاڵەبانیەکانی کەرکووك رووبەرووی یەکتر بوونەتەوە و لە نێوانیان شەڕ روویداوە، تەنانەت لەلایەن تاڵەبانیەکان دوو پیاوی جەباریەکان کوژراوە، بۆیە لە نێوانیان ناکۆکیەکە پەرەی سەندوە، هەردوو لا خەریکی کۆکردنەوەی کۆمەڵەن و خۆیان ئامادە دەکەن هێرش بکەنە سەر یەکتر، ئەم ئاماژەیە لە موتەسەرفیەتی سلێمانی هاتووە، بۆیە بەپەلە ئامادەکاری بکرێت و هەر ئێستا کارێك بکرێت ئەم دوو کۆمەڵەیە پەرشوبڵاو بکرێنەوە و رێگە نەدرێت ئەم ناکۆکیە پەرەبسەنێت، لەلایەن جەنابی موحسین پاشا لەگەڵ موتەسەرفیەتی کەرکووك نووسراو بۆ سلێمانی و سەروو کراوە، راگەیەندراوە فەرمان، لە ١٨ شوبات ١٣١٨.

نوری والی موسڵ

- بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لە ١ مارس ١٣١٩ لە نێوان جەباریەکان و تاڵەبانیەکان رووبەرووبوونەوە روویداوە، بۆیە ئامادەکاری کراوە و ئەم دوو لایەنە گەڕێندراونەتەوە شوێنی خۆیان، شتێك نەماوە جێگای ترس و دڵەراوکی بێت، هەروەها بۆ ئەوەی کارەکە ئاراستەی رێچکەیەکی باشتر بکرێت، ئەمانە داوەت بکرێن و ئەنجامەکە رابگەیەندرێت، بە تایبەتی دوای چوونیان بۆ ناحیەی کیل تەلەگرافنامە لە موتەسەرفیەتی کەرکووك وەرگیراوە، رابگەیەندرێت و زانیاریەکان بڵاوبکرێتەوە.

لە ١٠ مارت ١٣١٩

نوری والی موسڵ



| 2 ڕەبیعی یەکەم 1320 | 00520.00007 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢ ڕەبیعی یەکەم ١٣٢٠
٢٦ مایس ١٣١٨
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
مستەفا فکری ئەفەندی لە بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی سەروجك سەر بە سانجەقی سلێمانی دامەزراوە، خەرجی ڕێگاکەی کە ٥٥٨١ قوروش پێك دێت، لە نەزارەتی عاجیزانە لە داهاتی ساڵی ٣١٨ هەژمار کراوە، پارەکەش بە کاش دەنێردرێت، بە ووتەی ژمێریاری پەلە کراوە لە ڕاگەیاندنی، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان.



| DH.MKT. | 00537.00025 | 25 رەجەب 1320 |
|---|---|---|

٢٥ رەجەب ١٣٢٠
١٨ حوزەیران ١٣١٨
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
خانەیەك بۆ گرتووخانەی ئافرەتانی سانجەقی سلێمانییە بە کرێ گیراوە، لەگەڵ کرێی خانەکە و مووچەی گاردیانەکانی مانگانە ٥٠ قوروش دابین کراوە و لە ساڵی ٣١٧ وە خەرج دەکرێت، برەکەی ٤٠٠ قوروش لە داهاتی ناوەخۆی ئەم ساڵە هەژمار دەکرێت و لە پارەوپولی ویلایەتی بەهیە رێك دەخرێت، لە خەزینەی جەلیلەش رێکخراوە و حەواڵە نامە نێردراوە و نووسراو لە دەفتەرداریەتی نووسراوەتەوە، بۆ میری میران نێردراوە، بە گوێرەی ئەوە پێویستە جێبەجێ بکرێت، بە ووتەی ژمێریاری رادەگەیەندرێت.



| 17 رەبیعی کۆتایی 1320 | 00547.00010 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٧ رەبیعی کۆتایی ١٣٢٠
١٠ تەمموز ١٣١٨
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
لە سانجەقی سلێمانی پزیشکی شارەوانی نییە، بۆیە کەسێك نییە راپۆرتی هونەری لەسەر تاوانی برینداربوون و کوشتن بنووسێتەوە، بەمەش مافی گشتی و تاکەکەسی دووچاری کەموکوری بۆتەوە، ئەو نووسراوەی لە داواکاری گشتی ئیستینافی ویلایەت وەرگیراوە، ئاماژەی پێکراوە کە پێویستە لە لیوای ناوهاتوو پزیشکی شارەوانی دابمەزرێت و رەوان بکرێت، بۆ ئەمەش لە نووسراوی نەزارەتی دادی جەلیلە لە مێژووی ٢٥ حوزەیران ١٣١٨ ژمارە ١٢٩ ئاماژەی پێکراوە، بەم ئاماژە پێکردنە پزیشکێکی شارەوانی دادەمەزرێت و رەوان دەکرێت، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



| 20 رەجەب 1320 | 00549.00066 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٠ رەجەب ٣٢٠
٩ تشرینی یەکەم ٣١٨
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
بە تەلەگراف راگەیەندراوە؛ کە لە پلەی میری میران ئیلیاس سامی ئەفەندی لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی دامەزراوە، هەر لەگەڵ گەیشتنی و مێژووی دەست بەکار بوونی لە ئەرکەکەی و پشت بەستن بە تۆمار مانگانە ٦٧٥٠ قوروش مووچەی پێ دەدرێت، هەروەها لەگەڵ دەست پێکردنی ئەرکەکەی، بڕی مووچەی پێشووی وەستێنراوە کە ٤٥٠٠ قوروشە، جگە لەمە بە گوێرەی بڕیاری نیزام پێویستە مێژووی دەست پێکردنی ئەرکەکەی و مێژووی دەست لە کار کێشانەوەی رابگەیەندرێت، لەلایەکی تر لەبەر ئەوەی لە ناو ویلایەت ئەرکەکەی گواستۆتەوە، پێویستە خەرجی رێگاشی پێ بدرێت، بە ووتەی ژمێریاری بەپەلە راگەیەندراوە.



| 6 جەمادی کۆتایی 1320 | 00575.00033 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٦ جەمادی کۆتایی ١٣٢٠
٢٧ ئۆغستۆس ١٣١٨
بۆ لایەنی واڵای جەنابی سەرعەسکەر
لـە سـانجەقی سـلێمانی؛ پۆلیسـی پاراسـتن و ئەفسـەر و ئەندامەکانـی ئەرکـی داد و مولکیەیـان بـە باشـی جێبەجـێ ناکـەن، بۆیـە لەگـەڵ ئەفسـەری شـوێنی تـر گۆڕینەوەیـان پـێ بکرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لەلایـەن جەنابـی موحسـین پاشا نـووسراو نووسراوەتـەوە، ئـاڵای بەگیـش پەراوێـزی بـۆ نووسیوەتەوە، وێنـەی وەرگێـردراوی پەسـەند کـراوی نێـردراوە، دوای پـرس و راکردنیـش لـە ویلایەتـی موسـڵ نـووسراو لـە مێـژووی ٢٧ تەممـوز ١٣١٨ هاتـووە؛ بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت و بـە هـاوکاری سـەر عەسـکەر رابگەیەندرێـت.



| 1320 شەعبان 10 | 00610.00030 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٠ شەعبان ٣٢٠
٢٩ تشرینی یەکەم ٣١٨
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
وەڵامی تەلەگرافنامەی مێژووی ١٢ تشرینی یەکەم ٣١٨ی والایە
تـا کاغەزەکانـی دەرخسـتەی زیاتـر لـە ٥٠٠٠ قوروشـی خەرجـی دروسـت کـردن و نۆژەنکردنـەوە ڕەوان نەکرێـت، مۆڵەتـی خـەرج کردنـی نادرێـت، بـە گوێـرەی نیـزام لـە بینایـەی میـری سـەرەتا گرتووخانـەی مەرکـەزی سـلێمانی نـۆژەن دەکرێتـەوە، ئەگـەر هـەر ئێسـتا دەسـت بـە نۆژەنکردنـەوەی بکرێـت، ئـەوا خەرجییەکـەی بـە پۆسـتە ڕەوان بکرێـت، هەروەهـا بـە گوێـرەی نرخـی بەهـا (ڕایـج)ی خۆچێـی، ئامـاژە بـە خەرجـی نۆژەنکردنەوەکـە بکرێـت، بـە ووتـەی ژمێریـاری پەلـە کـراوە لـە ڕاگەیاندنـی.




DH.MKT.00610.00034.001

| 1320 ڕەجەب 25 | 00610.00034 | **DH.MKT.** |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی دەرەوە
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٧٠٧
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
ساڵی رابردوو بەگزادەکانی شارۆچکەی بانە، بە ناوی محەمەد عەلی و فەرەج بەگ لەگەڵ پیاوەکانیان هێرشیان کردۆتە سەر گوندی وینەی سەر بە قەزای گولعەنبەری سانجەقی سلێمانی، کەلوپەل و پارەوپولیان تاڵان کردووە، بەڵام بەهۆی دەستپێشخەری کاریگەرەوە بە تەواوەتی کەلوپەل و پارەوپولەکان گەڕێندراوەتەوە و دراوەتەوە خاوەنەکانیان، وێنەی ئەو نووسراوانەی لە سەرۆکی شەهبەندەر وەرگیراوە، پێشکەشی سەروو کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٥ ڕەجەب ١٣٢٠ و لە ١٤ تشرینی یەکەم ١٣١٨.
نازری دەرەوە



| 1320 موحەررەم 17 | 001836.137667 | BEO. |
|---|---|---|

١٧ موحەررەم ١٣٢٠
١٣ نیسان ١٣١٨
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لەبەر جموجۆڵی پێشووی شێخ محەمەد نوری و شێخ عەلی ئەفەندی زادە محەمەد رەئوف لەگەڵ هاوەڵانی؛ ئازاد کردنەکەیان بەستراوەتەوە بە سزای وەرگرتنی پارە، جگە لەمە لە مێژووی ٢٤ تەمموز ١٣١٦ لەلایەن جەنابی خەلافەتپەناهی بە فەرمانی پاشا بڕیاری دوورخستنەوەیان دراوە و هاوپێچ لە نووسراوی نەزارەتی دادی جەلیلەش لە مێژووی ٢٨ زیلحیجە ١٣١٩ ژمارە ٤٦ پرسیار لەسەر ئەو کەسانە کراوە کە پەیوەندیان بە رووداوی گول تەپەی سانجەقی سلێمانی هەبووە یاخود نەبووە، بە گفتوگۆکردن لەگەڵ ویلایەت، ئەو وەڵامەی وەردەگیرێت، خوێندنەوەی بۆ دەکرێت، رادەگەیەندرێت و هاوپێچەکان دەنێردرێتەوە.



| 10 سەفەر 1320 | 001850.138700 | BEO. |
|---|---|---|

١٠ سەفەر ١٣٢٠
٥ مایس ١٣١٨
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لازمی پۆلیس قادر ئاغای هەمەوەند، لەبەر بێ کاری تووشی پەرێشانی و بێ تاقەتی بۆتەوە؛ بۆیە پەنای بۆ حکوومەتی ئێران بردووە و چۆتە تەهران، بەڵام هانا بردنی بۆ ئێران جێگەی دڵنیابوون نییە، بۆیە ئەرکێکی پێ بدرێت و خەرجی رێگای بۆ خەرج بکرێت تا بتوانێت بگەرێتەوە سلێمانی، لە بارەی ناوبراوەوە داوای زانیاری کراوە، بۆ ئەم مەبەستەش لە باڵیۆزخانەی تەهران تەلەگرافنامە دراوەتە نەزارەتی دەرەوەی جەلیلە، لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوهاتوو لە مێژووی ١٠ سەفەر ١٣٢٠ ژمارە ٨٤٦ بەیەکەوە بۆ میری میران نێردراوە، دوای خوێندنەوەی بەپەلە هیممەت بکرێت لە راگەیاندنی و هاوپێچەکەی بنێردرێتەوە.

به ئاماژەی جەنابی راوێژکار.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1852 | 138841 | 1

| BEO. | 001852.138841 | 12 سەفەر 1320 |
|---|---|---|

١٢ سەفەر ١٣٢٠
٧ مايس ١٣١٨
بۆ لایەنی والآی سەرعەسکەریمان
بـۆ چاككردنی بارودۆخی سـانجەقەكانی كەركوك و سـلێمانی، بە فەرمانی پاشـای جەنابـی پەیوەندیدارانی خەلافەت هێـزی سـەربازی رێكخـراوە، بـۆ دابیـن كردنـی پێداویسـتی گەشـتكردن و خەرجیەكانیشـیان، بـرە پـارەی دیاریكـراو لـە مەركـەز وەردەگیرێـت، تەلەگرافنامـەی رەزامەنـدی لـە فەرمانگـە رێكخـراوە و بـە دەفتـەرداری ویلایەتـی موسـڵ راگەیەندراوە، لەسـەر دوو پارچە نووسراوی عالی سـەر عەسـكەر لە مێژووی ١٩ و ٢٤ زیلحیجە ١٣١٩ ژمارە ٢١٥ و ١٥٣ هەروەهـا لـە وەڵامـی ئـەو ئاماژەیـەی كە پێشـوو نێـردراوە، ئەمجـارە لە نەزارەتـی دارایـی جەلیلە نـووسراو دەكرێت.

لەسەر ئاماژەی جەنابی راوێژكاری عالی.



| 6 ڕەبیعی کۆتایی 1320 | 001883.141201 | BEO. |
|---|---|---|

٦ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٢٠
٢٩ حوزەیران ١٣١٨
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
ئەلیاس سامی ئەفەندی کە مەکتوپچی موسڵە و بە وەکالەت لە موتەسەرفیەتی کەرکووکە؛ بگوزارێتەوە بۆ موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی، لەسەر نووسراوی دەوڵەت لە مێژووی ١٦ ڕەبیعی یەکەم ١٣٢٠ ژمارە ١٩٢٠ بە بڕیاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە دوای ڕەزامەندی؛ لە مێژووی ٢ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٢٠ فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی کارەکە جێبەجێ بکرێت، وێنەی بڕیارنامەی قۆمیسیۆنی ناوهاتووش هاوپێچ نێردراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1968/147580

Zurk
(1 shf boş)

<table>
<tr><th>BEO.</th><th>001968.147580</th><th>29 رەمەزان 1320</th></tr>
<tr><td colspan="3">٢٩ رەمەزان ١٣٢٠<br>١٦ کانوونی یەکەم ١٣١٨<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لە خانەدانەکانی سانجەقی سلێمانی؛ هەر یەکە لە سەید ئەحمەد ئەفەندی و سەید غەریب ئەفەندی لە ویلایەتی موسڵ ئەرکێکی گونجاویان پێ بدرێت، بۆ ئەم مەبەستە جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا رەزامەندی لەسەر جێبەجێ کردنی داوە، لە مابەینی هومایۆنی باش کیتابەتی جەلیلە بە نووسراو رایگەیاندووە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>



| BEO. | 001883.141201 | 6 رەبیعی کۆتایی 1320 |
|---|---|---|

٦ رەبیعی کۆتایی ١٣٢٠
٢٩ حوزەیران ١٣١٨
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
ئەلیاس سامی ئەفەندی لە وەکالەتی موتەسەرفیەتی کەرکوك بگوازرێتەوە بۆ موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی، لەسەر نووسراوی دەوڵەت لە مێژووی ١٦ رەبیعی یەکەم ١٣٢٠ ژمارە ١٩٢٠ بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە دوای رەزامەندی؛ لە مێژووی ٢ رەبیعی کۆتایی ١٣٢٠ فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی کە کارەکە جێبەجێ بکرێت، وێنەی بریارنامەی قۆمیسیۆنی ناوهاتووش هاوپێچ نێردراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



| DH.TMIK.M. | 00141.00019 | 6 موحەررەم 1321 |
|---|---|---|

٦ موحەررەم ٣٢١
٢٢ مارت ٣١٩
جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
لە پاشکۆکانی سانجەقی سلێمانی، ناحیەی قزلجە کە دەکەوێتە سەر سنووری ئێران، لە شوێنی پێویست تابورێك سەربازی شاهانە نیشتەجێ بکرێت، بەڵام بۆ خەزینەی جەلیلە بۆتە بار گرانی، بۆیە بە پارەی میرەکانی جاف بە ناوی عوسمان پاشازادە مەجید و تاهیر بەگ؛ قشلەیەك دروست دەکرێت، لەبەر ئەوەی نیەت باشی خۆیان نیشان داوە، ناوبراوان پلەکەیان لە پلەی قەپوچی باشی بۆ پلەی میری میران بەرز بکرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش لە ویلایەتی موسڵ نووسراو لە مێژووی ٨ شوبات ٣١٨ ژمارە ١٦١ نێردراوە، بە ووتەی قۆمیسیۆن پێویستە پەلە لە جێبەجێ کردنی مامەڵەکە بکرێت و هاوپێچ پێشکەشی پەیوەندیدارانی سەدارەت کراوە، بە تێروانین لە نووسراوەکاندا یارمەتی هاوبەش هەبێت تا کارەکە جێبەجێ بکرێت، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان دەرچێت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.ŞFR
318 89

DH.ŞFR.00318.00089.001

<table dir="rtl">
<tr><td>DH.ŞFR.</td><td>00318.00089</td><td>16 رەمەزان 1321</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>ئەو بارودۆخەی کە لە سانجەقی سلێمانی هەیە، لەلایەن پاشاکانەوە روونە و ناکرێت بە درێژایی ماوە ئیدارەکەی بە وەکالەت بەڕێوەببردرێت، بۆیە موتەسەرف شەهابەددین بەگ کە لە ئیج ئیل چۆتە ئیستەنبوڵ، بەپەلە جولە بکات بۆ شوێنی باسکراو، تکایە فەرمان، ٢٣ تشرینی دووەم ١٣١٩.<br>نوری والی موسڵ</td></tr>
</table>


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

İ.TAL.00324.00066.001

| 20 شەوال 1321 | **000324.00066** | I.TAL. |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
..... دیوانی هومایۆن
٢٧٥٦
بۆ جەنابی پایەداری ئەفەندم
لەسەر ئەو خزمەتانەی کە مەعروف بەگ کاتیبی قەڵەمی داهات و محەمەد بەگ قائیمقامی شەهربازاری سەر بە سانجەقی سلێمانی کردوویانە؛ پلەکەیان بۆ پلەی دووەم بەرز کراوەتەوە، جەنابی خەلافەتپەناهی بە فەرمانی پاشا هەر چۆنێك بفەرمووێت، وەکو خۆی جێبەجێ دەکرێت، بەم راگەیاندنە نووسراوی بەپەلە ئامادە کرا ئەفەندم، لە ٢٠ شەوال ١٣٢١ و لە ٢٧ کانوونی یەکەم ١٣١٩.
سەدری ئەعزەم




DH.MKT.00694.00062.001

<table dir="rtl">
<tr><td>DH.MKT.</td><td>00694.00062</td><td>16 موحەررەم 1321</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>...............<br>.............<br>ژمارە ۱۱۰<br>عەزمی بەگ فەرمانبەری ناسنامەی سانجەقی سلێمانی پێش ۱۵ ساڵ پلەی سێیەمی وەرگرتبوو، کارەکەی زۆر بە ڕێکی ئەنجام دەدات و لەبەر دێرینی ناوبراو، پلەکەی یەك نمرە بەرزتر بکرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە لە ویلایەتی موسڵ نووسراوی ۱ مارت ۱۳۱۹ ژمارە ۱ حەواڵە کراوە، تێدا ڕاگەیەندراوە و کۆتایی پێ هاتووە، جێبەجێ کردنی کارەکەش دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی جەلیلە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ۱٦ موحەررەم ۱۳۲۱ و لە ۱ نیسان ۱۳۱۹.</td></tr>
</table>



| 17 رەبیعی کۆتایی 1321 | 00736.00057 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٧ رەبیعی کۆتایی ١٣٢١
٣٠ حوزەیران ١٣١٩
بۆ لایەنی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
لە ناو سانجەقی سلێمانی؛ بەهۆی دڵسۆزی و ئەم هەوڵ و کۆششانەی کە مەحمود پاشا سەرۆکی هۆزی جاف بۆ پاراستنی سنوور و بەرقەرارکردنی ئاسایش و جێگیر کردنی ئەمنیەت داویەتی، ناوبراو پلەکەی بۆ پایەی میری میرانی روم ئیلی بەرز بکرێتەوە و لە کوڕەکانیشی عەلی بەگ بە پلەی سێیەم و حوسێن بەگ و ئەحمەد بەگیش سەر لە نوێ بە پلەی سێیەم پلەکەیان بەرز بکرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە لە ویلایەتی موسڵ نووسراو لە مێژووی ٧ حوزەیران ١٣١٩ ژمارە ٧١ پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندیدارانی سەدارەت.



| 12 شەعبان 1321 | 00785.00076 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٢ شەعبان ٣٢١
٢٠ تشرینی یەکەم ٣١٩
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
دانیشتووانی گوندی کانی کوەی سەر بە سانجەقی سلێمانی بۆ کۆکردنەوەی دار چوونەتە سەر چیا، دوو کەس لە هۆزی هەمەوەند بە ناوی زوهراب و هیدایەت چوونەتە سەر گوندەکە و کەلوپەل و ئاژەڵەکانیان تاڵان کردووە، هەروەها قسە هەیە رەشید ئاغا یوزباشی ژاندارمە دەستی لە هێرشەکە هەبووبێت و هانی دابن، لەلایەن دانیشتوانی گوندی باسکراو نووسراوی بە واژوویان نێردراوە، بۆیە لێکۆڵینەوە لە بابەتەکە بکرێت و رابگەیەندرێت.



| 10 شه‌وال 1321 | 00804.00042 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٠ شه‌وال ٣٢١
١٧ كانوونی یه‌كه‌م ٣١٩
بۆ لایه‌نی عالی له‌ په‌یوه‌ندیدارانی سه‌داره‌ت
له‌ موده‌ریس و په‌رستاران مه‌لا ئه‌حمه‌د ئه‌فه‌ندی و شێخ عه‌بدوله‌حمان ئه‌فه‌ندی له‌گه‌ڵ ئه‌وانی تر كه‌ مووچه‌كه‌یان ٤٢٤ قوروشه‌، بێ خاوه‌ن ماوه‌ته‌وه‌، بۆیه‌ بره‌ پاره‌ی باسكراو بۆ سه‌جاده‌ نشینی ته‌كیه‌ی قادریه‌ شێخ عه‌زیز ئه‌فه‌ندی ته‌رخان بكرێت، كه‌ ده‌كه‌وێته‌ ناوچه‌ی كانی ئیسكانی سلێمانی، سه‌ره‌تا له‌ ویلایه‌تی موسڵ نووسراو وه‌رگیراوه‌ له‌ مێژووی ١٣ تشرینی یه‌كه‌م ٣١٧ پێشكه‌شی سه‌دری ئه‌عزه‌می په‌یوه‌ندیداری سه‌داره‌ت كراوه‌، بۆ دووپاتكردنه‌وه‌ ئه‌و بریارنامه‌یه‌ی كه‌ له‌ ئه‌نجوومه‌نی كارگێری سانجه‌قی سلێمانی هاتووه‌، نێردراوه‌، ئه‌مجاره‌ له‌ ویلایه‌تی ناوهاتووه‌وه‌ نووسراو له‌ مێژووی ٨ تشرینی دووه‌م ٣١٩ وه‌رگیراوه‌، هاوپێچ پێشكه‌شی سه‌روو كرا، به‌ تێروانین له‌سه‌ر نووسراو و ئاماژه‌ی پێشووی به‌نده‌مان جێبه‌جێ بكرێت، به‌ڵام رای جه‌نابی په‌یوه‌ندیداری سه‌داره‌تی پێویسته‌.



| 21 شەوال 1321 | 00810.00016 | DH.MKT. |
|---|---|---|

بابی عالی
٢١ شەوال ١٣٢١
٢٨ کانوونی یەکەم ١٣١٩
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
حاجی حەسەن ئەفەندی بەرێوەبەری تۆماری سانجەقی سلێمانی ٢٠٠٠ قوروش کرێی پێ دەدرێت، تاوەکو بچێتە قەزای گولعەنبەر و لێکۆڵینەوە لە سەر بەهەدەربردنی داهات و خراپ بەکارهێنانی بکات، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر ئاماژەی والا لە شورای دەوڵەت بڕیارنامە نووسراوەتەوە و لە مێژووی ١٨ تشرینی دووەم ١٣١٩ لە فەرمانگەی دارایی فەرمانی لەسەر دراوە، ئەو ٢٠٠٠ قوروشەی کە بەرێوەبەری ناوهاتوو وەریدەگرێت بابی عالی لە ٥٪ ی بۆ سندوقی ئاسانکاری دەنێرێت، لە بارەی خەرجی ڕێگای ناوبراویش کە لە موازەنە نووسراوەتەوە، بە ووتەی ژمێریاری نووسراو کراوە.



<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>00839.00007</td><td>18 رەمەزان 1321</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی تۆمارکردن<br>ژمارە ١٦٠<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>بۆ جەنابی ئەفەندم<br>لەبەر دێرینی جەودەت ئەفەندی کاتیبی کارگێری ئەنجوومەنی سلێمانی و ساڵح ئەفەندی فەرمانبەری نووسراوەکان پلەی چوارەمیان وەرگرتووە، بەڵام ئەم پلەیە بۆ پلەی سێیەم بەرز بکرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە لە وەکالەتی موتەسەرفیەتی سلێمانی نووسراو لە مێژووی ١٧ تشرینی دووەم ١٣١٩ ژمارە ٤٢٢ هاتووە، دوای راگەیاندن و پێشکەش کردنی، بە هاوکاری پەیوەندیدارانی نەزارەت جێبەجێ دەکرێت، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٨ رەمەزان ١٣٢١ و لە ٢٤ تشرینی دووەم ١٣١٩.<br>بە مۆری نوری والی موسڵ</td></tr>
</table>

T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)



OSMANLI ARŞİVİ
ŞD
1024 | 76 | 1

ŞD.01024.00076.001

| 13 رەمەزان 1321 | 01024.00076 | ŞD. |
|---|---|---|

نووسراوی ژمێریاری کە لە ژمێریاری نەزارەتی خانەنشینی مولکیەی ڕێکخراوە

| ناوی خۆی و باوکی | دوا ئەرک | مێژووی خانەنشین کردنی | مێژووی مردنی | مێژووی نووسراوی زانیاری | جۆری ڕێکخستنی هەژمارەکە |
|---|---|---|---|---|---|
| سابت پاشا | موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانیە | 1 کانونی دووەم 97 | 13 تشرینی یەکەم 319 | لە مێژووی مردنیەوە هەژمار دەکرێت | ماددەی 35 |

بری مووچە ۳۷٦٦ قوروش
نیوەی قوروش
۱۸۸۳
٦۹۲
۱۱۹۱
لە ٥٠٠ بەسەرەوە، نیوەی دەکات، کە بە گوێرەی بڕیارنامە کەم کراوەتەوە، خێزانەکەی فاتیمە نەجیبە خان لە مێژووی ۲۱ تشرینی یەکەم ۳۱۹ زانیاری پێ دراوە.

کۆچکردووی ناوبراو لە خانەنشینی مولکیە بووە و تۆمارەکانی سڕاوەتەوە، بە گوێرەی ماددەی ۳٥ ی بڕیارنامەی فەرمانبەرانی مولکیە مووچەی خانەنشینی لە ٥٠٠ بە سەرەوەیە، ئینجا نیوەی کەم دەکرێتەوە، ئەو مووچەیەی کە شایەنی ناوبراوە تەنیا بۆ خێزانەکەی ۱۱۹۱ قوروش ڕێکخراوە، چۆنیەتی جێبەجێ کردنیشی حەواڵەی دەستەی گشتی کراوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ۲۰ تشرینی دووەم ۳۱۹.

صدارت عظمى مكتوبى قلمى

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2086 156445

| BEO. | 002086.156445 | 12 رەبیعی یەکەم 1321 |
|---|---|---|
| بۆ لایەنی والّای سەر عەسکەر لەگەڵ نەزارەتەکانی ناوەخۆ و دارایی و دەفتەرخاقانی جەلیلە<br>وێنەکانی نووسراوی نووسراوە لە باڵادا راگەیەندراوە، هەروەها فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهیمان لە پەراوێز برەکەی دیاری کردووە و نەزارەتەکانی ناوەخۆ و دارایی و دەفتەرخاقانی جەلیلە ئاگادار کراوەتەوە، هیممەت بکرێت و لە لەلایەنی والّای سەر عەسکەر جێبەجێ بکرێت.<br><br>قەزای شەهربازار کە پاشکۆی سانجەقی سلێمانییە، لە گوند و دەورووبەری شوێنێکی گونجاو دەکرێتە مەرکەزی قەزا. | | |


صدارت عظمی مکتوبی قلمی

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2225 | 166836 | 1

| 3 ڕەمەزان 1321 | 002225.166836 | BEO. |
|---|---|---|

٣ ڕەمەزان ٣٢١
١٠ تشرینی دووەم ٣١٩
بۆ لایەنی والی سەر عەسکەریمان
هاوپێچی نووسراوی ٢ ڕەمەزان ٣٢١، لە سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی ناکۆکی و ڕووبەڕووبوونەوەی هۆزەکان یەك لە دوای یەکدا دێت، بۆیە پێویست دەکات سەربازی شاهانە ڕووبکاتە ناوچەکە، بۆ ئەم مەبەستە گفتوگۆ لەگەڵ موشیرەتی جەلیلە کراوە، چونکە سەرباز درەنگ دەگاتە ناوچەکە وا دەکات شۆڕشی گەورە سەرهەڵبدات، هەروەها ئەو قوماندانەی ئەرکی پێ سپێردراوە چاکسازی بکات و لێبووردنی گشتی ڕابگەیەنێت و جگە لە ئاشتکردنەوەی نێوانیان هیچ مامەڵەیەکی تەمبێ کردن ئەنجام نەدات، لەسەر هەندێك ووتە تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ لە مێژووی ٩ تشرینی دووەم ٣١٩ بۆ سەر عەسکەر نێردراوە، لەسەر نووسراوەکانی تر و ئاماژەی پێشوو هەرچی زووە کارەکە ئەنجام بدرێت و هاوپێچەکانی بنێردرێتەوە.




| 21 شەوال 1321 | 002249.168668 | BEO. |
|---|---|---|

٢١ شەوال ٣٢١
٢٨ کانوونی یەکەم ٣١٩
نووسراو بۆ لایەنی والای سەرعەسکەریمان
هاوپێچ وەڵامی نوسراوی مێژووی ١٤ شەوال ٣٢١، لەبەر ئەوەی هاوکاری سەربازی بە تەواوەتی پچراوە، بۆیە ئاژەڵی خاوەندار هەژمار نەکراوە، حاڵی حازریش لە ١٥ی شوبات نزیك دەبینەوە و راستەوخۆ دەست دەکرێت بە هەژمارکردنی مەڕومالات؛ بۆیە لەگەڵ ئەو کارەدا بەیەکەوە ئاژەڵی باسکراویش هەژمار بکرێت، بەڵام دیسان لەبەر نەبوونی هاوکاری کارەکە ئەنجام نادرێت و گومانی تێدا نییە رسوماتی ئاژەڵی خاوەندارییەت لەگەڵ داهاتی گەورەی سەر مەڕ بەیەکەوە تووشی لەناوچوون دەبن، لە بارەی ئەو ئەرکەی کە فرقەکە پێی دراوە، ئەو سەردانەی کە بۆ موشیرەتی لەشکری شەشەمی هومایۆن کراوە، هیچ سوودێکی نەبووە، وێنەی تەلەگرافی بریارنامەی ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی سلێمانی هاتووە و لەسەر هەندێك ووتە تەلەگرافنامە لە مێژووی ٢٦ کانوونی یەکەم ٣٢١ بۆ سپاهیدار نێردراوە، بە تێروانین لە ئاماژە و نووسراوەکانی پێشوو بەپەلە کارەکە جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت، هەروەها هاوپێچەکە رەوان بکرێتەوە.


MF.MKT.00835.00001.001


MF.MKT.00835.00001.001

| MF.MKT. | 00835.00001 | 2 زیلحیجە 1322 |
| --- | --- | --- |

- بۆ نەزارەتی مەعاریفی جەلیلە
فەرمانبەرانی بانق مووچەی چەند مانگێکی دیاری کراوی موعەلیمی مەکتەبەکانی روشدیەی ناوچەکانیان نەداوە، هەرچی ناوبراوانیشن بەردەوام بێ دابران سەردانمان دەکەن، هەروەها بە تێروانین لە بابەتەکانی ئەم دواییە ئەو مامەڵەیەی ناوی هاتووە، شوێن نەماوە رانەگەیەندرێت، هەروەکو پێشوو مووچەکانیان رێك بخرێت تا رێگە نەدرێت موعەلیمەکان سکاڵا بەرز بکەنەوە و رێگە نەدرێت بکەونە تەنگانەوە، لە کاتی سەردانیکردنی بەرێوەبەرایەتی بانقی موسڵ فەرمانی دەرچوونی دەگەرێتەوە بۆ هاوکاری پایەبەرزی ئەفەندم، لە ٢٥ کانوونی دووەم ٣٢٠.
تۆفیق بەرێوەبەری مەعاریف

- لە مێژووی ٢٦ کانوونی دووەم ٣٢٠ نێردراوەتە ژمێریاری
مووچەی چوار مانگی لیوای موسڵ لە تشرینی دووەمەوە، هەروەها لیوای کەرکوك لە ئۆغستۆسەوە مووچەی حەوت مانگ لە بانقی زراعەت/ یەکەی سندوق وەردەگیرێت، جگە لەمە ئەوانەی ماوەتەوەش لەگەڵ لیوای سلێمانی بە تەواوەتی لە سندوقی دارایی دەدرێت، پێشەکی کارەکە لە نەزارەتی جەلیلە بۆ نەزارەتەکانی دارایی و بازرگانی و نافیعە نێردراوە، بە پێویست زانراوە رێکخستنی بۆ بکرێت و بە تەلەگراف چۆنیەتی جێبەجێ کردنی مامەڵەکە و چاودێری کردنی بنوسرێتەوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی بۆ ئەوە کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٩ شوبات ٣٢٠



| 15 زیلقەعدە 1322 | 00847.00004 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٥ زیلقەعدە ١٣٢٢
١٨ نیسان ١٣٢٠
جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
ئـەو ئاگرکەوتنـەوەی لـە سـانجەقی سـلێمانی روویـداوە، نزیکـەی ٢٠٠ دوکان سـووتاوە، بـۆ دووبـارە دروسـت کردنـەوەی، عەبدولرەحـمان ئاغـا سـەرۆکی شـارەوانی لیـوای ناوهاتـوو بوێـری فەرمانـی بونیادنانـەوەی مەملەکەتـی داوە، بۆیـە لـە پلـەی سـێیەم پلەکـەی بـەرز بکرێتـەوە، لـە ویلایەتـی موسـڵی بەهیـە نـووسراوی مێـژووی ١٧ مـارت ١٣٢٠ ژمـارە ١٣ هاوپێـچ پێشـکەش کـراوە، جێبەجـێ کردنـی دەگەرێتـەوە بـۆ پەیوەندیدارانـی پایەبـەرز.



| 9 ڕەبیعی یەکەم 1322 | 00853.00044 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

٩ ڕەبیعی یەکەم ٣٢٢
١٢ مایس ٣٢٠
بۆ ویلایەتی خوداوەندکاری عالی
٢٩ نیسان ٣٢٠ وەڵامی تەلەگرافنامەی پایەبەرزە، داواکراوە وێنەی تۆماری ناسنامەی هاشم پاشا باوکی ساقی بەگ بهێنرێت، هاشم پاشا باوکی ساقی بەگ بە تۆمار دەکەوتووە کە خەڵکی دەرسەعادەتە، بەڵام ناوبراو ساقی بەگ لە سانجەقی سلێمانییە و ئەو ناسنامەی عوسمانی کە لە دەستیەتی شوێنی لە دایکبوونی ناوی بەغدادی لەسەر نووسراوەتەوە، سەرەتا لەسەر ئاماژەی عالی چۆنیەتی جێبەجێ کردنی کارەکە نووسراوی بە زانیاری بۆ فەرمانبەری ناسنامەی لیوای ناوهاتوو نێردراوە، هەروەها ئەمجارە چۆنیەتی کارەکە دووپاتکراوەتەوە، بە هاتنی وەڵامەکەی ئاگاداری پێ دەدرێت، بە ووتەی کارگێری گشتی تۆماری ناسنامە ڕاستەوخۆ ڕاگەیەندراوە.

کاغەزەکانی بۆ کارگێری تۆماری ناسنامە نێردراوە



| 14 ڕەبیعی یەکەم 1322 | 00865.00041 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

١٤ ڕەبیعی یەکەم ١٣٢٢
١٥ حوزەیران ١٣٢٠
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
ئەلیاس ئەفەندی موتەسەرفی ماردین ئەو کاتەی کە لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی بووە، لە ساڵی ٣١٨ی تشرینی دووەم تا کۆتایی شوبات کە دەکاتە چوار مووچە هەروەها لە ٣١٩ ی ئۆغستۆس تا کۆتایی ئەیلوول دەکاتە دوو مووچە؛ بە کۆکراوەیی دەکاتە مووچەی شەش مانگ، لە ناوەخۆ ماوەتەوە، مووچەی ناوهاتوو حەواڵەی دارایی ویلایەتی دیاربەکر کراوە، بۆیە ناوبراو داوای ئەم مووچانەی کردووە، بەڵام لێرە باس نەکراوە کە داهاتی ناوەخۆی هەیە، بۆیە سەیری بابەتەکە دەکرێت، چونکە هیچ سەنەدێك نییە بیسەلمێنێ کە ناوبراو داهاتی هەیە و هۆکاری ڕێکخستنەکەی دیاری نەکراوە، ئەو برەیە کە پەیوەستە بەم ساڵانەوە بە پۆستەیەکی پەسەند کراو بنێردرێت، بە ووتەی ژمێریاری ڕادەگەیەندرێت.



DH.MKT.00876.00025.001

| 19 جەمادی یەکەم 1322 | 00876.00025 | DH.MKT. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ١٥٢٨
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
بە سەختی نەخۆشی کۆلێرا لە سلێمانی بڵاوبۆتەوە، لە خاکی ئێرانیش بە هەمان شێوە بڵاوبۆتەوە، بۆیە ماوەی سێ ساڵە هێڵی پاراستنی تەندروستی پێنچوین کە کارەکەی کۆتایی پێ هێنراوە، لەگەڵ پزیشکێکی شارەوانی بۆ قەزای هەولێر بەپەلە دابمەزرێت و بنێردرێت، لەسەر ئەو ئاماژەیەی کە لە ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە، لەگەڵ وەڵامی ئەو ئاگاداریەی کە پێشووتر هاتووە، نوسراو لە نەزارەتی تەندروستی جەلیلە وەرگیراوە، تێدا هاتووە؛ کە بۆ هێڵی پاراستنی پێنچوینی ناوهاتوو پزیشکێکی حەلەب هەڵبژێردراوە و نێردراوە، هەروەها لە بارەی بە پەلە دامەزراندنی پزیشکێکی شارەوانی لە هەولێر، ئاماژە دراوەتە نەزارەتی جەلیلە تاوەکو کارەکە جێبەجێ بکات، لەبەر ئەوەی نەخۆشیەکە لەوێ بە وورییاییەوە تەشەنە دەکات، زۆر بە پێویست زانراوە پزیشکی شارەوانی بنێردرێت، بە گوێرەی حاڵەتەکە کارەکە بەپەلە جێبەجێ بکرێت و هیممەت بکرێت لە راگەیاندنی، بۆ ئەم مەبەستە نووسراو نوسرایەوە و ژمارەی لەسەر تۆمار کرا ئەفەندم، لە ١٩ جەمادی یەکەم ٣٢٢ لە ٢٠ تەمموز ٣٢٠.


داخلیه مکتوبی قلمی

موصل ولایتنه

<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>00885.00060</td><td>22 جەمادی کۆتایی 1322</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٢ جەمادی کۆتایی ١٣٢٢<br>٢١ ئۆغستۆس ١٣٢٠<br>بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە<br>مێژووی ٧ تەممووز ١٣٢٠ ژمارە ٥٩ وەڵامی نووسراوی بەهیەیە، بۆ نۆژەنکردنەوەی گرتووخانەی سانجەقی سلێمانی، ئەو پارەی رێکخراوە زیاتری بۆ خەرج کراوە، هەروەها لە بەرامبەر گشت خەرجیەکە ١١٠٠ قوروش بە یەکجاری دابین کراوە، لە تۆمار ئاماژەی پێکراوە، لەگەڵ ووتەی ژمێریاری پەلە بکرێت لە راگەیاندنی.</td></tr>
</table>



| 23 موحەررەم 1322 | 002310.173239 | BEO. |
|---|---|---|

٢٣ موحەررەم ٣٢٢
٢٨ مارت ٣٢٠
بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر
لە هەندێك شوێنی سانجەقی سلێمانی مەفرەزەی نیزامیە بوونی نییە، ئەمەش وایکردووە کۆکردنەوەی رسوماتی ئاژەڵی دانیشتوان مەحاڵ بێت، بۆ ئاسانکاری کردن لە کۆکردنەوەی رسوماتی ئاژەڵی دانیشتوان لەگەڵ رسوماتی مەڕومالاتی ئەم ساڵە و ساڵی رابردووی هۆزی غەواره، لەم پەنجا مەفرەزەیەی کە ئامادەیە یەکیان ئەرکی پێ بدرێت، چەندین جار سەردانی قوماندانیەت کراوە، بەڵام بە گوێرەی ناردنی فەرمان و هەواڵ بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا بەرزکردنەوەی ئەرکی مەفرەزەکە مەحاڵە، هەروەها ئەو وەڵامەی هاتووە لە ژمێریاری سانجەقی سلێمانی ئامادەکاری سەربازی بۆ نەزارەتی جەلیلە نێردراوە، تەلەگرافنامەی نەزارەتی ناوهاتوو لە مێژووی ٢٢ موحەررەم ٣٢٢ ژمارە ٣٢ لەگەڵ نووسراو بەیەکەوە بۆ سەر عەسکەر نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە کارەکە جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت، هەروەها هاوپێچەکەی بنێردرێتەوە.



| 29 موحه‌ررەم 1322 | 002313.173433 | BEO. |
|---|---|---|

٢٩ موحه‌ررەم ١٣٢٢
٣ نیسان ١٣٢٠
بۆ لایەنی واڵای سەر عەسكەریمان
سـاڵم ئەفەندی موتەسـەرفی داهاتووی سانجەقی سلێمانی، تا دەگاتە شـوێنی ئەركەكەی موتەسەرفیەتی لیوای ناوهاتوو لەلایـەن یوسـف كەنعـان پاشـا میری لیـوای رەدیف بە وەكالـەت بەڕێوە دەبردرێت، بـۆ ئەوەی ئـەم فەرمانەش لەلایەن واڵای سـەر عەسـكەرەوە دەربچێت، تەلەگرافنامە لە مێژووی ١ نیسـان ١٣٢٠ لە ویلایەتی موسـڵەوە هاتووە و بۆ لایەنی واڵای سـپاهیدار رۆیشـتووە، بۆ ئەم مەبەسـتە جێبەجێ بكرێت و رابگەیەندرێت هەروەها هاوپێچەكەی بنێردرێتەوە.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2317 | 173709

| 5 سەفەر 1322 | 002317.173709 | BEO. |
|---|---|---|
| ٥ سەفەر ١٣٢٢<br>٨ نیسان ١٣٢٠<br>بۆ لایەنی واڵای سەر عەسکەریمان<br>نووسراوی عالی سەر عەسکەر لە مێژووی ١ سەفەر ١٣٢٢ ژمارە ٣٠٦ نووسراوەتەوە، لەم نووسراوەیە هاتووە؛ گونجاو نییە میری لیوا یوسف پاشا بە وەکالەت لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی دابمەزرێت، ئەمەش لە وەڵامدا بە ویلایەتی موسڵ راگەیەندراوە، بەڵام هەرچی زووە پێویستە بەپەلە بۆ وەکالەتی ناوهاتوو کەسێکی گونجاو هەڵبژێردرێت، بەپەلە جێبەجێ بکرێت و چۆنیەتی کارەکەش رابگەیەندرێت. | | |



| 8 سەفەر 1322 | 002318.173795 | BEO. |
|---|---|---|
| ٨ سەفەر ١٣٢٢<br>١١ نیسان ١٣٢٠<br>بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر<br>نائیب ئەفەندی بە وەکالەت لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانییە، نەخۆشیەکەی لە ئاستێك دایە، ناتوانێت ئەرکەکەی بەڕێوە ببات، جگە لەمە تا موتەسەرفەکەی تر دەگاتە شوێنەکە مانگێکی پێویستە، لەبەر ئەوەی کێشەکانیش زۆر لە سەرووی خۆیەتی، بە گوێرەی راپۆرت بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوچەکە و پاراستنی رسوماتی مەڕومالات و ئاژەڵەکان حوسێن پاشا قوماندانی نیزامیە بە وەکالەت لە شوێنی ناوبراو دابنرێت، لە ویلایەتی موسڵ بە تەلەگرافنامە ئاماژەی پێکراوە، جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت. | | |


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2360 176961 1
2 vrk
(2 sht boş)

| BEO. | 002360.176961 | 16 رەبیعی کۆتایی 1322 |
|---|---|---|

١٦ رەبیعی کۆتایی ٣٢٢
١٧ حوزەیران ٣٢٠
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
دەفتەرداری دیاربەکر نیهاد بەگ لە دەفتەرداری ویلایەتی بەغداد هەروەها بۆ دەفتەرداری دیاربەکریش مەلیك موخلیس ئەفەندی ژمێریاری پێشووی سانجەقی سلێمانی دامەزرێن، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر نوسراوی ٣٠ سەفەر ٣٢٢ ژمارە ٦٠٦ بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە و دوای رەزامەندی لە ١٤ رەبیعی کۆتایی ٣٢٢ جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

صدارت عظمی مکتوبی قلمی

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2369 177647

| BEO. | 002369.177647 | 1 جەمادی یەکەم 1322 |
|---|---|---|

١ جەمادی یەکەم ١٣٢٢
٢ تەمموز ١٣٢٠
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لەسەر بارودۆخی ئێستای سانجەقی سلێمانی لێکۆڵینەوە ئەنجام دەدرێت، ئەو فەرمانبەرانەی بۆ ئەم مەبەستە دەنێردرێنە ئەوێ، لەلایەن جەنابی خەلافەتپەناهیەوە فەرمانی پاشای بۆ دەرچووە و بە نووسراو بە مابەینی هومایۆنی ملوکانەی باش کیتابەتی جەلیلە راگەیەندراوە کە هەرچی زووە ئەم فەرمانبەرانە هەڵبژێردرێن و رابگەیەندرێت، بۆیە لە مەرکەزەوە لەلایەنی سەربازیەوە دوو فەرمانبەر هەڵبژێردراون و دامەزراون، بە ئەمر و فەرمانی هومایۆنی شاهانەش ئەو فەرمانبەرانەی کە لەلایەنی مولکیەوە دەنێردرێت خێرا هەڵبژێردرێت و رابگەیەندرێت.




| BEO. | 002391.179300 | 4 جەمادی کۆتایی 1322 |
|---|---|---|

٤ جەمادی کۆتایی ١٣٢٢
٣ ئۆغستۆس ١٣٢٠
بۆ لایەنی عالی لە نەزارەتی دادی جەلیلە
لـە دادگای سـەرەتایی مەرعـەش موسـا کازم ئەفەنـدی سـەرۆکی فەرمانگـەی سـزا دوور خراوەتـەوە بـۆ شـوێنی ناوبـراو لـە دادگای سـەرەتایی سـانجەقی سـلێمانی نەزیـف ئەفەنـدی سـەرۆکی فەرمانگـەی سـزا و بـۆ سـەرۆکایەتی سـزای سـلێمانیش ئیسـماعیل زوهـدی ئەفەنـدی یاریـدەدەری داواکاری گشـتی لـە سـەرۆکایەتی سـزای سـانجەقی هـەکاری دوای سـوێند خـواردن بگوازرێنـەوە و دابمەزرێـن، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لەسـەر راپۆرتـی عالـی لـە مێـژووی ٧ جەمـادی یەکـەم ١٣٢٢ ژمـارە ٣٠٨ دوای مۆڵـەت لـە مێـژووی ٢ جەمـادی کۆتایـی ١٣٢٢ فەرمانـی پاشـای جەنابـی خەلافەتپەناهـی فەرموویەتـی، جێبەجـێ دەکرێـت.



| 8 جەمادی کۆتایی 1322 | 002393.179462 | BEO. |
|---|---|---|

٨ جەمادی کۆتایی ٣٢٢
٧ ئۆغستۆس ٣٢٠
بۆ لایەنی عالی لە نەزارەتی دادی جەلیلە
مستەفا نوری ئەفەندی یاریدەدەری گشتی دادگای سەرەتایی سانجەقی سلێمانی دوور دەخرێتەوە، لە شوێن ئەو شەعبان زوهدی ئەفەندی دەرچووی مەکتەبی یاسای شاهانە دوای سوێندخواردن دادەمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر راپۆرتی مێژووی ٢٣ جەمادی یەکەم ٣٢٢ ژمارە ٣٤٥ دوای رەزامەندی ٥ جەمادی کۆتایی ٣٢٢ فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت دەرچووە، جێبەجێ بکرێت.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2418 | 181303

2 vrk
(1 shf boş)

| BEO. | 002418.181303 | 14 رەجەب 1322 |
|---|---|---|

١٤ رەجەب ١٣٢٢
١٢ ئەیلوول ١٣٢٠
نووسراو بۆ لایەنی عالی لە نەزارەتی دادی جەلیلە
مستەفا نوری ئەفەندی لە یاریدەدەری داواکاری گشتی سانجەقی سلێمانی بۆ یاریدەدەری داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی سانجەقی مونتەفیك، هەروەها بۆ یاریدەدەری داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی سانجەقی هەکاری، ئەحمەد ئەدیب کە لە سەرۆکایەتی دادگای سەرەتایی قەزای کۆپرلی لێبووردراوە؛ دوای سوێند خواردنیان دامەزرێن، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر راپۆرتی عالی لە مێژووی ١٥ جەمادی کۆتایی ١٣٢٢ ژمارە ٤٠٨ مۆڵەتی داوە، لە مێژووی ١٢ رەجەب ١٣٢٢ جەنابی خەلافەتپەناهی بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، جێبەجێ بکرێت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

Y.MTV 273/9 1

Y.MTV.00273.00009.001

| 3 سەفەر 1323 | 00273.00009 | Y.MTV. |
|---|---|---|

پایەی سەرعەسكەر
قەڵەمی تۆمار
تایبەتی
لەلایەن ئەفسەرانی رەدیفی ناحیەی قەرەداغی سەر بە سانجەقی سلێمانی راگەیەندراوە؛ تاقمێك لە دانیشتوانی گوندەكە ملكەچ بوونیان شكاندوە و دەستیان بە هێرش و پەلامار كردووە، بۆیە ناوبراوان لە ژێر هەرەشە دان، پاراستنی ئەفسەرانی ئەم ناوچەیەش مولازمێك بە هاوەڵی مەفرەزەیەكی سوارەی ئێستر كە لە ٢٠ كەس پێك هاتووە بۆ شوێنەكە نێردراوە، لەم بابەتەدا بە تێروانین لە هەندێك ووتە لە قوماندانیەتی لەشكری شەشەمی هومایۆن دوو پارچە تەلەگرافنامە هاتووە و وێنەكانیان راگەیەندراوە و پێشكەش كراوە، هەروەها ئەفسەرانی ناوهاتوو بپارێزرێن و رێگە نەدرێت تووشی پەلامار ببنەوە، لە وەڵامی قوماندانیەتی ناوهاتوودا ئاگاداری راگەیەندراوە و زانیاری دراوەتە بابی عالی، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو كەسەیە كە فەرمان دەردەكات.
لە ٣ سەفەر ١٣٢٣ و لە ٢٦ مارت ١٣٢١
رزا سەر عەسكەر



DH.ŞFR.00354.00121.001

| DH.ŞFR. | 00354.00121 | 1 شەعبان 1323 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لـە ١٦ ئەیلـوول ١٣٢١ بەرەبەیانـی مانگـی قەمـەری، سـانجەقی سـلێمانی کـە بارودۆخەکـەی لەلایـەن سـەدری ئەعزەمـی پەیوەندیدارانـی نـەزارەت ئاشـکرا و دیـارە، بۆیە بە گوێرەی ناوچەکە کەسێکی لێهاتوو وەکو موتەسـەرف دابنرێـت کـە ئیدارەکـەی رێـك بخـات و جێگیـری بـکات، بـەڵام بـۆ ئـەم کێشـانە لەسـەر رای پایەبـەرز وەسـتاوە، لەم بابەتـە فەرمـان بدرێت.

لە ١٨ ئەیلوول ١٣٢١
والی موسڵ


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

İ.TAL.00391.00007.004

<table>
<tr><td>I.TAL.</td><td>00391.00007</td><td>29 زیلقەعدە 1323</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>.... دیوانی هومایۆن<br>٣١٩٥<br>جەنابی پایەداری ئەفەندم<br>مەحمود ئەفەندی فەرمانبەری دەفتەرخاقانی سانجەقی سلێمانی، لە پلەی چوارەم یەك پارچە نیشانی مەجیدی پێ دەدرێت، لەم بارەیەوە نووسراوی نەزارەتی دەفتەرخاقانی جەلیلە راگەیەندراوە و پێشكەش كراوە، لەم بابەتەدا جەنابی خەلافەتپەناهی لە فەرمانی پاشایەتیدا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەكرێت، دوای راگەیاندنی پەلە كراوە لە نووسینی نووسراو.</td></tr>
</table>



داخلیه مکتوبی قلمی

حضور عالی حضرت صدارتپناهی

| 26 جەمادی یەکەم 1323 | 00992.00040 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٦ جەمادی یەکەم ١٣٢٣
١٦ تەمموز ١٣٢١
جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
بەهۆی خزمەتە باشەکانی ساڵح ئەفەندی فەرمانبەری کاغەزەکانی لیوا، بە یەك پلە پلەکەی بەرز بۆتەوە کە بە پلە چوار ڕێزی لێگیراوە، بۆ ئەم مەبەستە لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی نووسراو هاتووە، لەگەڵ پۆستەی تۆمار پێشکەش کراوە، راوبۆچوون بۆ سەدارەتپەناهی عالیە.




DH.MKT.01001.00059.002

| DH.MKT. | 01001.00059 | 20 جەمادی کۆتایی 1323 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی فەرمانبەران
ژمارە ٢٩٤

لە بارەی برینەوەی مووچەیەك بۆ خانەوادەی خوالێخۆشبوو رەشید ئەفەندی بەرێوەبەری ناحیەی رۆژئاوای سەرچنار، لە ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی سلێمانی خشتەی ماوەی خزمەتی رێکخراوە و نێردراوە، چونکە دوای ئەوەی تۆمارەکانی یەکسان دەبێت ئینجا پەسەند دەکرێت و دەنێردرێت، لە نووسراوی نەزارەتی خانەنشینی مولکیەی عالی لە مێژووی ٦ ئۆغستۆس ٣٢١ ژمارە ٨٦ ئاماژەی پێکراوە، بە گوێرەی ئەمە دەرکەوتووە لە کاتی پێداچوونەوە بە تۆمارەکەی لەگەڵ خشتەی باسکراودا یەکسان بووە، لە وەڵامدا نەزارەتی ناوهاتوو بە پەیوەندیدارانی نەزارەتی راگەیاندووە نووسراوی باسکراو و خشتەکە گەرێندراوەتەوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢٠ جەمادی کۆتایی ٣٢٣ و لە ٨ ئۆغستۆس ٣٢١




DH.MKT.01004.00002.002

| DH.MKT. | 01004.00002 | 23 جەمادی کۆتایی 1323 |
|---|---|---|

بۆ جەنابی پەیوەندیدارانی سەدارەت

راگەیەندراوی بەندەیە

بەندەتـان لـە دەرچـووی مەکتەبـی دواناوەنـدی مەعمورەی عەزیزەیە، لە سـاڵی ٣١٦ بـە فەرمانی نەزارەتـی ناوەخۆی جەلیلـە لـە بەڕێوەبەرایەتـی ناحیـەی سورتاشـی نـاو ویلایەتـی موسـڵ دامـەزراوم، تـا مـاوەی چـوار سـاڵ خزمەتـی دەوڵەتـم کـردووە و دواتـر بەبـێ ویسـتی خـۆم بەهـۆی نەخۆشـی یـەك سـاڵ لەسـەر جێگا کەوتـم، ئینجا دەسـتم لە کارکێشـایەوە، کاتێـك دەهاتمـە دەرسـەعادەت لە نێوان سـانجەقی دیـرەزور و ویلایەتی حەلەب لەلایـەن چەتەکانەوە پارەوپـول و کەلوپـەلم تـالان کـرا، ئـەم بابەتـە لـە ویلایەتـی ناوهاتـووەوە بـە نهێنـی مایـەوە و نـووسراو بـۆ جەنابـی سـەدری ئەعـزەم نێـردرا، دواتـر لـە ئەنجامـی بەدواداچـوون دەرکەوتـووە لەلایـەن حکوومەتـی زورەوە خەرجـی ڕێگاکـەم کـە لـە حەلەبـەوە دەسـتی پێکـرد لەوێشـەوە بـۆ ئەسـکەندەرۆنە، دواتـر بـۆ دەر عالیە خـەرج کـراوە، بەڵام لێـرە لەگـەڵ خێزانەکـەم لـە نـاو کۆڵانـەکان سـەرگەردان و پەرێشـان بووینەتـەوە، هەروەهـا قووتـی ڕۆژانەمـان نییە، پێویسـتمان بـە سـەدەقەی پاشـایە، بـە میهرەبانـی و ویژدانـەوە لێـرە بژێومـان بـاش بکرێـت، داوای ئەمـر و فەرمانی ئێوەیـن، بـە دادپەروەری پاشـا تـکا دەکەم، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسـەیە کە فەرمـان دەردەکات.

لە ١٢ ئۆغستۆس ١٣٢١

بەڕێوەبەری پێشووی سورتاش



| DH.MKT. | 01020.00022 | 26 شەعبان 1323 |
|---|---|---|

٢٦ شەعبان ١٣٢٣
١٢ تشرینی یەکەم ١٣٢١
بۆ لایەنی جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
رزا بەگ لە قائیمقامیەتی قەزای مەعمورەی حەمیدیە دامەزراوە، بەڵام هێشتا نەرۆیشتووە، ماوەی سێ چوار مانگە ساڵح ئەفەندی فەرمانبەری کاغەزەکانی سانجەقی سلێمانی بە وەکالەت لەم قائیمقامیەتە کاری کردووە، لەبەر گرنگی قەزاکە و دووری شوێنەکە، بە پێنج مووچە ناتوانێت بژێوی خۆی دابین بکات و زەرەر و زیانی پێ گەیشتووە، هەروەها دەرکەوتووە قائیمقام لەوە زیاتر دوا دەکەوێت، بۆیە دابین کردنی خەرجی پێویستی وەکیلی ناوهاتوو لە ویلایەتی موسڵ بۆتە مەرج و نوسراو هاتووە کە سێ یەکی مووچەی بۆ دابین بکرێت، ئەو ئەرکانەی کە بە ناچاری کارگێڕیەکەی بە وەکالەت بەڕێوە دەبردرێت، لە مووچەی بنەرەتیدا جگە لەو ئەرکەی کە بە وەکالەت بەڕێوەی دەبەن، پێنج مووچەیان پێ دەدرێت کە بۆیان دابین کراوە، بەڵام بە گوێرەی شوێن و بەرژەوەندی هەروەها بارودۆخ و چینی ئەو وەکیلەی ئەرکەکە وەردەگرێت ئەگەر پێویست بکات لە پێنج مووچە شتێکی زیاتری پێ بدرێت، ئەوا دوای رەزامەندی گونجاوە کە لە مووچە بنەرەتیەکەی بری سێ یەك و چوار یەکی ئاقچەی پێ بدرێت، بە تێروانین لە بریارنامەی خەرجی رێگاش بە ووتەی ژمێریاری پەلە کراوە لە وەرگرتنی رەزامەندی.



| 1 ڕەمەزان 1323 | 01022.00001 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١ ڕەمەزان ١٣٢٣
١٦ تشرینی یەکەم ١٣٢١
بۆ ویلایەتی موسڵی عالی
٢٤ ئەیلـوول ١٣٢١ وەڵامـی تەلەگرافنامـەی پایـەی ویلایەتـی عالیـە، حاجـی حەسـەن ئەفەنـدی بەڕێوەبـەری تۆمـاری سـانجەقی سـلێمانی لەگـەڵ نورەددیـن بـەگ بەڕێوەبـەری تۆمـاری کەرکـووك گۆرینەوەیـان پـێ بکرێـت، لەگـەڵ گەیشـتنیان بـۆ ئەرکـە نوێیەکەیـان لـە مێـژووی دەسـت بـەکار بوونیـان مانگانـە نورەددیـن بـەگ ١١٠٩ و نیـو حەسـەن ئەفەنـدی ٩٠٠ قـوروش مووچـە وەردەگـرن، لـە بـارەی جێبەجـێ کردنـی بڕیارەکـەی نیـزام و سـوێند خواردنیـان ئەنجـام دەدرێـت، لەگـەڵ دەسـت بـە کاربوونیـان لـە ئەرکـە نوێیەکـە، مێـژووی دەسـت لـە کار کێشـانەوەیان لـە ئەرکـی پێشـوو ڕادەگەیەندرێـت، بـە ووتـەی ژمێریـاری پەلـە کـراوە لـە ڕاگەیاندنـی.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2650 | 198722 | 1

| BEO. | 002650.198722 | 22 جەمادی کۆتایی 1323 |
| --- | --- | --- |

٩ ئۆغستۆس ١٣٢٠
تەلەگراف بۆ ویلایەتی موسڵ
لە ٩ ئۆغستۆس ١٣٢١ زەکی ئەفەندی مەکتوپچی ویلایەت لە موتەسەرفیەتی سلێمانی دادەمەزرێت، لەسەر ئەم ئاماژە پێکردنە راگەیەندراو دراوەتە نەزارەتی ناوخۆ تاوەکو حاڵی حازر بە وەکالەت کارەکە بەرێوە ببات و رۆیشتنی بۆ سلێمانی گونجاوە.
لە ٢٢ جەمادی کۆتایی ١٣٢٣ و لە ٩ ئۆغستۆس ١٣٢١

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە کۆتاییدا سالم پاشا موتەسەرفی سلێمانی ئەرکەکەی گوازراوەتەوە بۆ موتەسەرفیەتی کەرکووك، هەر ئێستا بە ئاسایی زانراوە بچێتە سەر کارە نوێیەکەی، جگە لەمە تا موتەسەرفێکی تر لە دەرەوە دێت و لە سانجەقی سلێمانی دادەمەزرێت و دەچێتە شوێنەکە، لە ناوەخۆ وەکیلێکی گونجاو نەدۆزرێتەوە ئەوا مامەڵەی لیوای ناوهاتوو لەوە زیاتر تووشی کێشە دەبێت، لەبەر ئەمە مەکتوپچی ویلایەت حافز زەکی ئەفەندی لە موتەسەرفی لیوای ناوهاتوو دامەزرێت، بە تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵی بەهیە راگەیەندراوە، هەروەها تۆماری ناوهاتوو ئێستا بە وەکالەت کارەکە بەرێوە دەبات، بە نووسراو بە ویلایەتی ناوهاتوو رادەگەیەندرێت کە چۆتە سلێمانی، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە.




<table>
<tr><td>BEO.</td><td>002655.199090</td><td>29 جەمادی کۆتایی 1323</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز<br>قەڵەمی تۆمار<br>شیفرەی ئەو تەلەگرافنامەیە کە لە ویلایەتی موسڵ هاتووە<br>قەدەغەکراوە<br>لە ١٠ ئۆغستۆس ١٣٢١ بە بۆنەی هاوکاریەکانی پاشا نامەی سوپاسگوزاری بۆ پەیوەندیدارانی سەدارەت ئامادەیە، لە ویلایەتیش ئەفەندی بەندە بۆ چوونە سلێمانی ئامادەیە، بەڵام لە تەلەگرافنامەی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە ئاماژەی پێکراوە کە گونجاو نییە ناوبراو هەڵبژێردرێت، بەڵام کێشە تازەکانی سلێمانی بەهۆی بە وەکالەت بەرێوەبردنەکەیەتی، کە دووچاری نارێکی بووە، ئەگەر دامەزراندنی ئەفەندی ناوبراو گونجاو نەبێت، ئەوا عوسمان پاشا موتەسەرفی ماردین بگوازرێتەوە و دابمەزرێت، جێبەجێ کردنی بە پەلەی ئەم کارە دەگەڕێتەوە بۆ پاشای پایەبەرز، فەرمان.<br>لە ١٦ ئۆغستۆس ١٣٢١<br>نوری والی موسڵ</td></tr>
</table>


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2662/199648

2 vrk
(1 shf boş)

| 10 ڕەجەب 1323 | 002662.199648 | BEO. |
|---|---|---|

١٠ ڕەجەب ١٣٢٣
٢٨ ئۆغستۆس ١٣٢١
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لەبەر گرنگی شوێنی ستراتیژی سانجەقی سلێمانی، بە درێژایی ماوە بەڕێوەبردنی ئیدارەی ناوچەکە بە وەکالەت، کارێکی گونجاو نییە، بۆیە موتەسەرفێکی هەمیشەیی دامەزرێت، تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ لە مێژووی ٢٧ ئۆغستۆس ١٣٢١ هاتووە تێدا ئاماژەی پێکراوە، پەلە لە جێبەجێ کردنی ئەم مامەڵەیە بکرێت، بە تێڕوانین لەم بابەتەدا پەلە بکرێت لە جێبەجێ کردنی و ڕابگەیەندرێت و هاوپێچەکەی بنێردرێتەوە.



| 25 شەعبان 1323 | 002693.201955 | BEO. |
|---|---|---|

٢٥ شەعبان ١٣٢٣
١١ تشرینی یەکەم ١٣٢١
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
عوسمان پاشا موتەسەرفی ماردین بگوازرێتەوە بۆ موتەسەرفی سانجەقی سلێمانی و لەوێ دابمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە نووسراوی دەولەت لە مێژووی ٢ رەجەب ١٣٢٣ و بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە دوای رەزامەندی لە مێژووی ٢٣ شەعبان ١٣٢٣ فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی، بۆ ئەم مەبەستە نووسراو بکرێت.


صدارت عظمی مکتوبی قلمی

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2718 203779

| 1323 شەوال 12 | 002718.203779 | BEO. |
|---|---|---|

١٢ شەوال ٣٢٣
٢٦ تشرینی دووەم ٣٢١
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
عەبدولرەحمان نافد ئەفەندی ژمێریاری سانجەقی سلێمانی لەبەر نەخۆش کەوتنی نەیتوانیوە لە کارەکەی بەردەوام بێت، بۆیە بەرێوەچوونی کاروباری دارایی بە باشی نەرۆیشتووە، بەم هۆیەوە دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەو سەلیم سری ئەفەندی ژمێریاری پێشووی سانجەقی نیگدە دابمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر نووسراوی مێژووی ١١ رەجەب ٣٢٣ ژمارە ٥١٢٩ و بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە دوای رەزامەندی جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت، فەرمانی پاشا لە ٩ شەوال ٣٢٣ فەرموویەتی جێبەجێ بکرێت، هەروەها سەلیم سری ئەفەندی ئەو شوێنەی بۆی دەروات، کاروبارەکەی بە باشی بەرێوە دەبات، ئەگەر بێتو لەسەر ئەو سکاڵایانەی کە لە ئەرکەکەی پێشوو لێی کراوە و بۆتە هۆکاری جیابوونەوەی، دووبارە بێتەوە ئەوا بەکارهێنانەوەی قەدەغە دەکرێت، ئەمەش لە قۆمیسیۆن خوێندنەوەی لەسەر کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2724 204232

| BEO. | 002724.204232 | 21 شەوال 1323 |
| --- | --- | --- |
| ٦ کانوونی یەکەم ١٣٢١<br>تەلەگراف بۆ ویلایەتی موسڵ<br>لـە مەرکـەز و پاشـکۆی ویلایـەت پارەوپولـی دەوڵـەت بـە تایبەتـی ئـەوەی سـانجەقی سـلێمانی هـەر هەمـووی کـە ماوەتـەوە بـە پەلـە بەدەسـت بهێنرێت، جگە لەمە ئامۆژگاری کـراوە کە لە کارەکانی کارگێری سـەربازی خەرج بکرێت. | | |

| 25 شەوال 1323 | 002725.204337 | BEO. |
|---|---|---|

١٠ کانوونی یەکەم ١٣٢١
تەلەگراف بۆ ویلایەتی موسڵ
بۆ ئەوەی داهاتی سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی بە پەلە بەدەست بهێنرێت تا ئێستا چی کراوە و بری داهاتەکەش ئاماژەی پێ بکرێت و رابگەیەندرێت.





| BEO. | 002749.206138 | 28 زيلقەعدە 1323 |
|---|---|---|

- ٢٨ زيلقەعدە ١٣٢٣
١٠ كانوونی دووەم ١٣٢١
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە، فەرموویەتی
بڕیارنامەی شورای دەوڵەتی فەرمانگەی دارایی لە باڵا نوسراوەتەوە، لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە داواکراوە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە.

تۆفیق پاشا بە وەکالەت لە سانجەقی سلێمانی دامەزراوە، لە بارەی مووچە بە وەکالەتەکەی.

- شورای دەوڵەت
فەرمانگەی دارایی
ژمارە ٣٦٥٦
نووسراوی مێژووی ٢٧ شەعبان ٣٢٣ ژمارە ٣٤٩١ لە نەزارەتی ناوەخۆ حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، لە فەرمانگەی دارایی خوێندنەوەی بۆ کرا.
لەسەر گرنگی سانجەقی سلێمانی، قوماندانی نیزامیەی خۆچێی میری لیوا تۆفیق پاشا لە موتەسەرفیەت بە وەکالەت دامەزراوە، ئەو مووچەیەی لە وەکالەت وەریدەگرێت، لەگەڵ پلەکەی گەونجاو دەبێت، نموونەی وەکو ئەمە بە هەژماری سێ یەك هەژماردەکرێت و لە ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە، لەم بابەتەدا ئەو بڕیارەی دراوە، ڕەزامەندی دراوە لەسەر جێبەجێ کردنی، هەروەها ناوبراو لە بڕی سێ یەك گونجاوە مووچەی وەکالەتی پێ بدرێت و بە گوێرەی بڕیار ڕەزامەندی لەسەر دراوە، بۆ جێبەجێ کردنی نووسراو حەواڵەی نەزارەتی ناوهاتوو کراوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢٤ زيلقەعدە ١٣٢٣ و لە ٧ كانوونی دووەم ٣٢١
ئەندام مستەفا جەمال/ ئەندام محەمەد بەگ/ ئەندام زیا بەگ/ ئەندام ڕەشاد بەگ/ ئەندام لوتفی بەگ/ ئەندام عارف حیکمەت پاشا/ ئەندام شەریف عەبدوڵلا پاشا/ مۆری شورای دەوڵەت/ سەرۆکی فەرمانگەی دارایی/ ئەندام فەهیم بەگ/ ئەندام مستەفا سەفوەت/ ئەندام فەتحی بەگ/ ئەندام ئەحمەد بەگ



ZB.00408.00079.001

| 9 رەبیعی یەکەم 1324 | 00408.00079 | ZB. |
|---|---|---|

٩ رەبیعی یەکەم ٣٢٤
٢٠ نیسان ٣٢٢
بۆ ویلایەتی بەیروت
نووسراوی مێژووی ٧ شوبات ٣٢١ ژمارە ٥٢٠ وەڵامی پەیوەندیدارانی ویلایەتە، عەبدولقادر ئەفەندی ئەفسەری پێشووی سانجەقی سلێمانی داوای کردووە لە سلکی پۆلیسی ویلایەتی جەلیلە ئەرکی پێ بدرێت، دوای وەرگرتنی ئەرکەکە لە مێژووی ١٦ کانوونی یەکەم ٣٢٠ بە مەبەستی هێنانی خانەوادەکەی لە حەما، بۆ ماوەی سێ مانگ مۆڵەتی پێدراوە، بەڵام ماوەی مۆڵەتەکەی بەسەرچووە، هەروەها روون بۆتەوە هەرگیز ناچێتە سەر کارەکەی، بۆیە بە بریاری دەستەی هەڵبژاردن تۆماری رەش کراوەتەوە، لەم حاڵەتەدا ناوبراو لەوێ دەست بەکار نابێت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
Y.A.HUS 508/49

Y.A.HUS.00508.00049.001

| 11 زیلقەعدە 1324 | 00508.00049 | Y.A.HUS. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
..... دیوانی هومایۆن
٢٠٨٦
ساڵح وەسفی ئەفەندی موتەسەرفی سانجەقی سلێمانی لەبەر کێشەی جەستەیی لە ئەرکەکەی داوای لێبووردنی کردووە، لە شوێن ئەو بە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیدارانی خەلافەت تۆفیق بەگ قائیمقامی نەوشەهیر کە ئاماژەی پێکراوە لە موتەسەرفیەتێك دامەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە لە سەر نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە بریارنامە دراوەتە قەڵەم، لە مێژووی ٢٦ شەوال ١٣٢٤ بەپەلە راگەیەندراوە و خراوەتە پێش عالی، موتەسەرفی ناوهاتوو نەخۆشیەکی توندتر بووە، داوای کردووە رێگەی پێ بدرێت بچێتە مەرکەزی ویلایەت، هەروەها لەگەڵ گرنگی لیوای ناوهاتوو، کاتی هەژماری سەرمەرەکانی نزیك بۆتەوە، بۆیە پێویستە بەپەلە کارەکە ئەنجام بدرێت، لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەسەر رەزامەندی پێشوو ئەمر و فەرمانی دەرچوو جێبەجێ دەکرێت.
لە ١١ زیلقەعدە ١٣٢٤ لە ١٤ کانوونی یەکەم ١٣٢٢
سەدری ئەعزەم



| 5 جەمادی یەکەم 1324 | 01095.00014 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٥ جەمادی یەکەم ٣٢٤
١٤ حوزەیران ٣٢٢
بۆ لایەنی عالی لە جەنابی پەیوەندیدارانی سەدارەت
تـا بـە وەکالـەت موتەسـەرفی سـلێمانی دێـت، قوماندانـی میـری لیـوا یوسـف پاشـا کێشـەکانی قەبوڵـی کـردووە، هەروەهـا ناوبـراو لـەم ناوچەیـە لێهاتـوو و بـە جێگیـر دەناسرێـت، بۆیـە کاروبـاری لیـوا بـە باشـی بەرێـوە دەبـات، لەبـەر ئـەوەی ناوبـراو ئەرکەکـەی پێـدراوە، وەکـو کەسـانی وەکـو خـۆی بـە هەژمارکردنـی سـێ یـەك مووچـەی بریـکاری پـێ بدرێـت، لـە تەلەگرافنامـەی ویلایەتـی موسـڵ کە وەرگیـراوە، ئاماژەی پێکراوە، ئـەو ئەرکـە کارگێریانەی کـە بـە پێویسـت زانـراوە لەلایـەن کەسـانێکەوە بـە وەکالـەت بەرێـوە ببردرێـت، لـە مـاوەی بریکاریەکەیـان جگـە لـە مووچـەی ئەرکـە کۆنەکەیـان، ئـەو ئەرکـەی کـە بـە وەکالـەت بەرێـوەی دەبـەن، پێنـج مووچەیـان پـێ دەدرێـت، ئەگـەر پێویسـت بـکات بـە گوێـرەی شـایەد و بەرژەوەنـدی هەروەهـا بـە گوێـرەی بـارودۆخ و سـیفەتی ئـەو وەکیلـەی دادەمەزرێـت، لـە پێنـج مووچـە زیاتـری پـێ دەدرێـت، واتـە بـە مۆڵـەت ڕێگـە پێـدراوە لـە مووچـەی بنەڕەتیەکـەی بـری سـێ یـەك و چـوار یـەك ئاقچـەی پـێ دەدرێـت، بـە بریارنامـەی خەرجـی ڕێـگا مـاددەی ٨ ڕاگەیەنـدراوە و بـە تێروانیـن لـە وێنـەی ئامـاژەی ویلایـەت بـە ووتـەی ژمێریـاری چۆنیەتـی کارەکـە نـووسراوی پێکرا.




ML.EEM.01108.00018.002

<table>
<tr><th>ML.EEM.</th><th>01108.00018</th><th>8 زیلقەعدە 1324</th></tr>
<tr><td colspan="3">خەزینەی تایبەتی شاهانە<br>فەرمانگەی ئەملاکی هومایۆن<br>ژمارە ١٠٥٦٦<br>لە تۆماری سانجەقی سلێمانی روون بۆتەوە مەحوی ئەفەندی شێخی تەکیەی حەمیدیە مردووە، بۆ خەرجی تەکیەکەی لە داهاتی ئەملاکی هومایۆن مانگانە ٤٠٠ قوروش مووچەی پێ دەدرێت، لەگەڵ ٥٠٠ قوروش خەرجی خواردنی تەکیەکەی بووە، دوای مردنی ناوبراو بە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیدارانی خەلافەت بۆ کورەکەی بە ناوی عومەر ئەفەندی دابین کراوە، لە مابەینی هومایۆنی باش کیتابەتی جەلیلە نووسراوی تایبەتی لە مێژووی ١ زیلقەعدە ١٣٢٤ و ٣ کانوونی یەکەم ١٣٢٢ هاتووە و تێدا ئاماژەی پێکراوە و نووسراوەتەوە، فەرمانی پاشای ملوکانە بە تەلەگراف قۆمیسیۆنی موسڵی ئاگادار کردۆتەوە و بۆ جێبەجێ کردنی مامەڵەکە نووسراو کرا، لە ٩ کانوونی یەکەم ١٣٢٢.<br>چاوپێکەوتن کرا/ راوێژکار، باش کاتیب، سەرۆك محەمەد ...<br><br>لە ١١ کانوونی یەکەم ١٣٢٢ نووسراوەتەوە.</td></tr>
</table>



<table>
<tr><td>6 شەوال 1324</td><td>01130.00031</td><td>DH.MKT.</td></tr>
<tr><td colspan="3">٦ شەوال ١٣٢٤<br>٩ تشرینی دووەم ١٣٢٢<br>بۆ ویلایەتی موسڵی عالی<br>ئـەو نووسراوانـەی پەیوەسـتن بـە زانیـاری کەسـێتی محەمـەد عەزمـی بـەگ فەرمانبـەری ناسـنامەی سـانجەقی سـلێمانی نەنوسراوەتـەوە، کـە ناوبـراو لـە سـاڵی ٣٠٩ مانگـی ئۆغستۆسـی ڕۆژی ٣٠ تـا مێـژووی ٨ تشرینـی یەکـەم ١٣١١ بـە وەکالـەت لـە بەرێوەبەرایەتـی ناحیـەی سـەرچناری ڕۆژهـەڵات، هەروەهـا لـە سـاڵی ٣١٣ لـە ئەرکـی بەڕێوەبردنـی مەڕوماڵاتـدا بـووە، بۆیـە پێویسـتە لـە تۆمـارەکان ئامـاژە بە هۆکاری دەسـت لـە کار کێشـانەوە بکرێـت و جگـە لەمـە تۆمـار بکرێـت کـە لـە ئەرکەکانیـدا چەنـد کـرێ یـا مووچـەی وەرگرتـووە، لەلایەکـی تـر ئامـاژە بـە مێـژووی دەسـت بەکاربوونـی لـە ئەرکـی ئێسـتادا بکرێـت، بـە ووتـەی یەکـەی تۆمـار پەلـە کـراوە لـە ڕاگەیاندنـی.</td></tr>
</table>




<table>
<tr><td>BEO.</td><td>002816.21185</td><td>1 رەبیعی یەکەم 1324</td></tr>
<tr><td colspan="3">
١ رەبیعی یەکەم ٣٢٤<br>
١٢ نیسان ٣٢٢<br>
بۆ لایەنی عالی لە نەزارەتی دادی جەلیلە<br>
بە بریارنامەیەك زانیاری دراوەتە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە، هەروەها کاغەزی لێکۆڵینەوەکانیش نێردراوە، داوا لە نەزارەتی دادی جەلیلەی لایەنی عالی کراوە هیممەت بکرێت.<br><br>
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>
وێنەی ئەو بریارنامەیەی کە لە ئەنجوومەنی پێداچوونەوەی رای جیاوازی شورای دەوڵەت حەواڵەی نەزارەتی داد کراوە، لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە داواکراوە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.<br><br>
لە گوندی کانی کونەی سەر بە سانجەقی سلێمانی؛ لە پارچەیەك زەوی نیوەی لە ژێر سەرپەرشتی حاجی ئەمین بووە، دوای مردنی بە ساختەییەوە بردراوە، دواتر فرۆشراوە، بۆیە ئەم کەسانەی کە گومانیان لێ دەکرێت، لەلایەنی دادەوە بەدواداچوونی یاساییان بۆ بکرێت و بەردەوام بێت.
</td></tr>
</table>

| 4 جەمادی یەکەم 1324 | 002858.214307 | BEO. |
| --- | --- | --- |

٤ جەمادی یەکەم ٣٢٤
١٣ حوزەیران ٣٢٢
بۆ لایەنی عالی لە نەزارەتی دادی جەلیلە
ئیسماعیل ئەفەندی یاریدەدەری گشتی داواکاری دادگای سەرەتایی مەرکەزی ویلایەتی دیاربەکر لە سەرۆکایەتی فەرمانگەی سزای دادگای سەرەتایی مەرکەزی ویلایەتی یاینە دابنرێت، لە شوێن ئەویش محەمەد ئەفەندی سەرۆکی فەرمانگەی سزای دادگای سەرەتایی سانجەقی ئورفە هەروەها بۆ سەرۆکایەتی سزای ئورفەش زەبور ئەفەندی سەرۆکی فەرمانگەی سزای دادگای سەرەتایی سانجەقی حەما، بۆ شوێنی ئەویش ئەدیب ئەفەندی سەرۆکی فەرمانگەی سزای دادگای سەرەتایی سانجەقی سلێمانی، دوای سوێندخواردنیان دابمەزرێن، جگە لەمە سەرۆکەکانی دادگای سەرەتایی قەزاکانی ئاسقراپار و دەرنوە، عەلی کەمال ئەفەندی و حوسێن ئەفەندی شوێنەکانیان بگۆردرێتەوە، لەم بارەیەوە راپۆرتی ٣٠ رەبیعی یەکەم ٣٢٤ ژمارە ١٧٢ دوای رەزامەندی ٣ جەمادی یەکەم ٣٢٤ فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت دەرچووە، جێبەجێ بکرێت.


صدارت عظمی مکتوبی قلمی

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2947 | 221021

2 vrk
(1 shf 6 ??)

| BEO. | 002947.221021 | 7 شەوال 1324 |
|---|---|---|

٧ شەوال ١٣٢٤
١٠ تشرینی دووەم ١٣٢٢
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
سالح وەسفی ئەفەندی موتەسەرفی سانجەقی سلێمانی لەگەڵ کەشوهەوای شوێنەکە ئاوێتە نابێت و تووشی نەخۆشیەکی مەترسیدار بووە، بۆ ئەوەی لە ئەرکەکەی بە یەکجاری بوردرێت، تەلەگرافنامەی ویلایەتی موسڵ لە مێژووی ٩ تشرینی دووەم ١٣٢٢ بۆ دەوڵەت نێردراوە، لەبەر گرنگی شوێنەکەش بەپەلە موتەسەرفێك هەڵبژێردرێت و دابمەزرێت، بە گوێرەی بریار کارەکە جێبەجێ بکرێت و هیممەت بکرێت لە راگەیاندنی.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
İ.TAL.00415.00049.001

| 10 موحەررەم 1325 | 00415.00049 | I.TAL. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
.... دیوانی هومایۆن
١١٢
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
ئەمجارە تۆفیق بەگ ئەفەندی لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی دادەمەزرێت، لەبەر ئەوەی دێرین و ئەرکی باشی پێشووی ئەنجام داوە، پایەی میری میرانی روم ئیلی پێ دەدرێت، هەروەها ئەحمەد رامی ئەفەندی کە لە قائیمقامیەتی نەوشەهیر دادەمەزرێت، ئەویش شایەدی لەسەر هەوڵ و کۆششەکانی دراوە؛ بۆیە لەسەر ئاماژەی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە ناوبراو لە پلەی سێیەم نیشانی عوسمانی پێ دەدرێت، لە بارەی وەرگرتنیان جەنابی پەیوەندیدارانی خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراوی بەپەلە کرا ئەفەندم، لە ١٠ موحەررەم ١٣٢٥ و لە ١٠ شوبات ١٣٢٢.
سەدری ئەعزەم




DH.MKT.01161.00039.002

<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>01161.00039</td><td>6 موحەررەم 1325</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی تۆمارکردن<br>ژمارە ١٢٧<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>ئەحمەد عزەت ئەفەندی کاتیبی ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی سلێمانی شایەدی ئەرکە باشەکانی بووینە؛ جگە لەمە ناوبراو لە کەسانی لێهاتوو و بە توانایە، لەسەر بوێری و جۆش و خرۆشیەوە پاداشت بکرێت و بە پلەی چوارەم ڕێزی لێ بگیرێت، بۆ ئەم مەبەستە لە موتەسەرفیەتی لیوای ناوهاتوو ئاماژەی پێکراوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٦ موحەررەم ٣٢٥ و لە ٦ شوبات ٣٢٢.<br>مۆری والی موسڵ</td></tr>
</table>



| 20 ره‌بیعی كۆتایی 1325 | 01170.00080 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٠ ره‌بیعی كۆتایی ١٣٢٥
٢٠ مایس ١٣٢٣
بۆ لایه‌نی عالی له په‌یوه‌ندیدارانی سه‌داره‌ت
ئه‌دیب ئه‌فه‌ندی به‌ڕێوه‌به‌ری ته‌له‌گرافی سانجه‌قی سلێمانی له‌لایه‌ن ده‌وڵه‌تی ئێرانه‌وه؛ له پله‌ی پێنجه‌م نیشانی شیر و خورشیدی پێدراوه، دوای قه‌بوڵ كردنی له مێژووی ٢٢ نیسان ١٣٢٣ ژماره ١٤ له ویلایه‌تی موسڵ نووسراو هاتووه و هاوپێچ پێشكه‌ش كراوه، كه جێبه‌جێ كردنی كاره‌كه ده‌گه‌رێته‌وه بۆ راوبۆچوونی پاشا.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO

| 16 سەفەر 1325 | 003023.226695 | BEO. |
|---|---|---|

١٦ سەفەر ٣٢٥
١٧ مارت ٣٢٣
بۆ لایەنی والای سەر عەسکەریمان
عوسمان پاشا قائیمقامی قەزای گولعەنبەری پاشکۆی سانجەقی سلێمانی سەر بە ویلایەتی موسڵ، لە بەرامبەر خەڵکی هەژار دەستی بە زوڵم کردووە و خەڵکەکە لەمە بێزار بووە، زەوی و زار و مولکی ئەم و ئەو بە مامەڵەی ساختە بە زۆرەملێ تالان دەکات، لەگەڵ خزمەکانی بە ناوی پەیوەندیدار تاپۆکانی دەست کەوتووە، هەروەها داهاتی قەزاکەی خواردووە، بە مۆری جۆراوجۆر لە خۆچێی داواکاری هاتووە و بە راگەیاندن و بڵاوکردنەوەی تکا لە پاشای ملوکانە کراوە، لەم بابەتەدا بە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت فەرمان کراوە کە لێکۆڵینەوەی پێویست ئەنجام بدرێت و ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت، بە نووسراوی باش کیتابەتی جەلیلەی مابەینی هومایۆنی ملوکانە نووسراوەتەوە، لەسەر ئەو زانیاریانەی کە هاتووە، وەڵام لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە، میری لیوا عززەت پاشا کە لە هەولێرە، لەسەر ناوبراو لێکۆڵینەوە ئەنجام دەدات و بە پێویستیش زانراوە بچێتە گولعەنبەر، لەسەر رۆیشتنی پاشای ناوهاتوو و جێبەجێ کردنی ئەرکی قائیمقامیەت، بە مەبەستی رۆیشتنی بۆ قەزای گولعەنبەر فەرمانی پێویست دراوەتە قوماندانیەتی لەشکری شەشەمی هومایۆن، بۆ ئەمەش چۆنیەتی راگەیاندنی ئەنجام بدرێت.

<table>
<tr><td>BEO.</td><td>003062.229633</td><td>10 ڕەبیعی کۆتایی 1325</td></tr>
<tr><td colspan="3">
١٠ ڕەبیعی کۆتایی ٣٢٥<br>
١٠ مایس ٣٢٣<br>
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>
لە ناو سانجەقی سلێمانی بە پاراستنی مافەکانی هۆزی ئیسماعیل عەزیری و هۆزی غەواره داهاتی دەوڵەت زیادی کردووە، جگە لەمە بۆ کاروباری باجیش هەر یەکەیان پێویستیان بە سەرۆکێکە دامەزرێت کە ئاشنای ئەم کاروبارانە بێت، بۆ ئەم مەبەستە لەلایەن محەمەد جەمیل ئەفەندی مولازمی تابوری ڕەدیفی قەرەداغ کە سەر بە لەشکری شەشەمی هومایۆنە، کاغەزێك پێشکەش کراوە، نووسراوەکان لەلایەن قوماندانیەتی لەشکری هوماندانی ناوهاتوو بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر نێردراوە، وێنەی نووسراوەکان و هاوپێچەکانی لەگەڵ نووسراوی سەر عەسکەری ناوهاتوو لە مێژووی ٨ ڕەبیعی کۆتایی ٣٢٥ ژمارە ٦٢١ بەیەکەوە بۆ دەوڵەت نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە هەرچی زووە جێبەجێ بکرێت و ڕابگەیەندرێت، هیممەت بکرێت لە ناردنەوەی هاوپێچەکانیش.
</td></tr>
</table>







| 10 رەجەب 1325 | 003128.234533 | BEO. |
|---|---|---|

١٠ رەجەب ٣٢٥
٦ ئۆغستۆس ٣٢٣
بۆ نەزارەتەکانی ناوەخۆ و دارایی جەلیلە
لەگەڵ نووسراوی دەوڵەت لە مێژووی ٨ رەجەب ٣٢٥ ژمارە ١٣٠١ ئاماژەی پێکراوە و دەرکەوتووە؛ عەبدولرەحمان نافز ئەفەندی (عبدالرحمن نافذ افندی) ژمێریاری پێشووی سانجەقی سلێمانی لەم کەسانەیە کە کەوتۆتە تەنگانە و پێویستی بە هاوکاریە، بۆیە وەکو سەدەقە لەلایەن جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت لە پاداشتی پاشا ١٥٠٠ قوروشی بۆ رێك بخرێت و پێی بدرێت، لەسەر ئاماژەی نەزارەتی دارایی جەلیلە ئاگاداری دراوەتە نەزارەتی ناوهاتوو، هیممەت بکرێت لە نەزارەتەکانی جەلیلە جێبەجێ بکرێت.

دارایی
بە چەسپاندن زانیاری دراوەتە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

بە ئاماژەی جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
3191 | 239325 | 2

BEO.003191.239325.002


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
3191 | 239325 | 3

BEO.003191.239325.003

| 11 شەوال 1325 | 003191.239325 | BEO. |
|---|---|---|

- نەزارەتی کاروباری دارایی
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١٩٠٩
ڕاگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە
لەبەر ئەوەی عەبدولرەحمان نافز ئەفەندی (عبدالرحمن نافذ افندی) ژمێریاری پێشووی سانجەقی سلێمانی پێویستی بە کارئاسانی و هاوکارییە، بە فەرمان و ئاماژەی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت لە پاداشتی پاشا ١٥٠٠ قوروش ڕێکخراوە و دراوەتە ناوبراو، بریانامەی پاکانەشی کە پەیوەستە بە ژمێریاری سانجەقی پروزە هێشتا نەهاتووە، بۆیە ئەوەی پەیوەستە بە مامەڵەی مووچەی دوورخراوان تەواو نەبووە، خۆشی لە فەرمانبەرە دێرینەکانە، لەبەر ئەوە ماوەیەك ئاسانکاری بۆ بکرێت و وەکو سەدەقەی جەنابی پاشا ١٥٠٠ قوروشی تریشی بۆ ڕێك بخرێت و پێی بدرێت، لە نووسراوی بەندەمان لە مێژووی ١٨ تشرینی یەکەم ٣٢٣ ڕاگەیەندراوە و ڕەزامەندی دراوە، بەڵام هێشتا وەڵامی فەرمانی سەروو نەهاتووە، هەروەها ناوبراو خۆی دوور نەگرتووە لە سەردان و تکا و پارانەوەی و داوای میهرەبانی دەکات، بە ڕاگەیەندراوێك و ڕەزامەندیەك هاوکاری بکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١١ شەوال ١٣٢٥ و لە ٤ تشرینی دووەم ٣٢٣.
نازری دارایی محەمەد ڕزا

- ئەگەر ئاوا لە پاداشتی پاشا پارە بدرێتە هەموو کەسێك، ئەوا پێشوەچوون نابێت، ئەوە ووتەی جەنابی پاشای نازری داراییە، بە شێوەی زارەکی ووتوویەتی.



| 18 زیلقەعدە 1325 | 003215.241081 | BEO. |
|---|---|---|

١٨ زیلقەعدە ٣٢٥
١٠ کانوونی یەکەم ٣٢٣
نووسراو بۆ لایەنی واڵای سەر عەسکەریمان
خەیری ئەفەندی قوماندانی تابوری ژاندارمەی سانجەقی سلێمانی لە ژاندارمەی ئاڵای مەعمورەی عەزیز لە تابوری مەرکەز وەکو میوان تۆمار کراوە، بۆیە لە شوێن ئەو میرزا ئاغا کوڕی کرفت قوماندانی تابوری ئاڵای ژاندارمەی بەغداد لە تابوری مەرکەز وەکو میوان بەکار دەهێنرێت، لە بارەی دامەزراندنی لەسەر نووسراوی عالی سەرعەسکەریمان لە مێژووی ٢١ شەوال ٣٢٥ ژمارە ١٠٢٩ دوای رەزامەندی لە ١٤ زیلقەعدە ٣٢٥ جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، بۆیە کارەکە جێبەجێ دەکرێت.




ZB.00621.00002.001

| 17 رەجەب 1326 | 00621.00002 | ZB. |
| --- | --- | --- |

٢ ئۆغستۆس ١٣٢٤
بۆ ویلایەتی موسڵی عالیە
یوزباشی فەهمی ئەفەندی وەکیلی قوماندانی تابوری ژاندارمەی سانجەقی سلێمانی دوو سزادراوی بەناوی تۆفیق و رەشیدی ئازاد کردووە، هەروەها چەند کەسێکی بێتاوان و بێ کەسی لە پێش فەرمانگەی حکوومەت دارکاری کردووە و دەستگیری کردوون، هەواڵ دراوە تاوەکو لێکۆڵینەوە بکرێت و رابگەیەندرێت.



| 10 موحەررەم 1326 | 01233.00029 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٠ موحەررەم ٣٢٦
٣١ کانوونی دووەم ٣٢٣
بۆ ویلایەتی موسڵی عالیە
لە نێوان سانجەقی سلێمانی و قەزای گولعەنبەر بۆ گەیاندن و دەستاودەست کردنی جانتای پۆستە لە نێوان ئەندامانی پۆلیسی پاراستن کێشەی تێکەوتووە، چونکە دەرکەوتووە لە ناو قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو ئەندام کەمە، لەم حاڵەتەدا لە ناردن و هێنانی پۆستە و جێبەجێ کردنی مامەڵەکان لە خۆچێی و مەکتەبەکانی فەرمی سنووردار کراوە، پۆستەخانەی گولعەنبەر داهاتی رێگای سێ مانگ لە ٤٥ قوروش پێك هاتووە، ئەمەش وایکردووە تەنیا بۆ هەواڵی فەرمی سنووردار کراوە، حاڵی حازر جانتای پۆستە بە رێگەی ژاندارمەوە دەبردرێت و رەوان دەکرێت، هەروەها ئەگەر ژاندارمەی ئەو ناوچەیە بۆی دەچێت کەموکوری تێدا بێت، ئەوا دەبێ هەر خۆی کارەکە تەواو بکات، لەبەر ئەوەی گەیاندنی هەواڵی فەرمی پەیوەستە بە حکوومەتی خۆچێی، دەبێ دەستاودەستکردنی جانتای پۆستە رێك بخرێت و لە نووسراوی نەزارەتی پۆستە و تەلەگرافی عالی لە مێژووی ٢١ کانوونی دووەم ٣٢٣ هاتوو راگەیەندراوە، لە بارەی جێبەجێ کردنی ئەم ئاماژەیەی عالی هیممەت بکات.



| 3 رەبیعی کۆتایی 1326 | 01252.00019 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٣ رەبیعی کۆتایی ١٣٢٦
٢١ نیسان ١٣٢٤
بۆ لایەنی جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
شێخ مەلا حەسەن ئەفەندی لە شارۆچکەی سنە بۆ سلێمانی هیجرەتی کردووە، لە بارەی برینەوەی بڕێك مووچەی گونجاو بۆ ناوبراو بڕیارنامە لە ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی سلێمانی نێردراوە، لەگەڵ نووسراوی ویلایەتی موسڵ کە لە مێژووی ٢٩ مارت ١٣٢٤ ژمارە ١٢ هاتووە و هاوپێچ بەیەکەوە پێشکەش کرا، جێبەجێ کردنی دەگەڕێتەوە بۆ پاشای پایەبەرز.



| 6 رەمەزان 1326 | 002226.166949 | BEO. |
|---|---|---|

٦ رەمەزان ٣٢٦
١٣ تشرینی دووەم ٣١٩
بۆ لایەنی واڵای سەر عەسکەریمان
تەلەگرافنامەی موسڵ رادەگەیەندرێت

میری لیوای رەدیفی سلێمانی یوسف پاشا بۆ ئاشت کردنەوەی نێوان هۆزەکان ئەرکی پێ سپێردرابوو، دوای ئەوەی لە کارەکەی سەرکەوتوو بوو، مۆڵەتی یەك مانگی پێ دراوە کە کەشوهەوای بگۆڕێت، بۆیە ئەمرۆ لە لایەنی بەیروتە، جگە لەمە بە کارەکانی دڵسۆزی و لێهاتوویی بینراوە، ناوبراو شایەنی ئەوەیە پلەی فەریقی پێ بدرێت، لە هەمان کاتدا داهاتی سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی تێکچوون و وونی پێوە دیارە، جگە لەمە هاوکاری سەربازی لە پلەیەکە کەموکوری تێ دەکەوێت، بۆیە چاکسازی و چارەسەرکردنی بە پێویست زانراوە، بۆ ئەم مەبەستە هەر لەگەڵ دامەزراندنی ناوبراو لە قوماندانیەتی فرقەی ١٢ ئەرکی چاکسازیەکەی پێ سپێردرا، هەروەها هەرچی زووە فەریق موحسین پاشا لەوێ هەڵبگیرێت و لە تەلەگرافنامەی ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە، جگە لەمە ئاماژەی پێکراوە لەسەر هەندێك ووتە تەلەگرافی بریارنامەی ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی سلێمانی لەسەر جموجوڵی نەگونجاوی موحسین پاشا نێردراوەتە لایەنی سیپاهیدار، بەپەلە کارەکە جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت.




<table dir="rtl">
<tr><td>DH.MKT.</td><td>02632.00062</td><td>21 رەمەزان 1326</td></tr>
<tr><td colspan="3">٤ تشرینی یەکەم ٣٢٤<br>تەلەگرافنامە<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>لەلایەن هۆزی جاف هێرش کراوەتە سەر هێڵی گولعەنبەر، وا بریارە بۆ چاککردنەوەی ٧٥٠٠ قوروش لە سلێمانی وەربگیرێت، هەروەها لەبەر ئەوەی ئامادەکاری پێویست جێبەجێ نەکراوە تا رێگە لەم جۆرە هێرشانە بگیرێت بۆیە سەرپێچی کردن بەردەوامە، بەمەش هەواڵگری پەکی کەوتووە، بە نەزارەتی تەلەگراف راگەیەندراوە، بۆ وەرگرتنی پارەکە و رێگەگرتن لە سەرپێچیەکان کار بکرێت و ئاماژە بە چۆنیەتی کارەکە بدرێت.</td></tr>
</table>



| 22 ره‌مه‌زان 1326 | 02633.00020 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٢ ره‌مه‌زان ١٣٢٦
٥ تشرینی یه‌كه‌م ١٣٢٤
بۆ نه‌زاره‌تی پۆسته و ته‌له‌گرافی عالی
هاوپێچی نووسراوی مێژووی ١ تشرینی یه‌كه‌م ١٣٢٤ ی به‌نده‌مانه‌، له‌لایه‌ن كۆمه‌ڵه‌ی ته‌عاون و ته‌ره‌قی كورد به پێویست زانراوه ته‌له‌گرافنامه بۆ دوو كه‌س بنێرن كه له سلێمانین، له‌سه‌ر ئاماژه‌ی پێشوو ئه‌و ته‌له‌گرافنامانه به خۆرایی نێردراون.



| کۆتا رۆژی رەمەزان 1326 | 02640.00074 | DH.MKT. |
|---|---|---|

کۆتا رۆژی رەمەزان ١٣٢٦
١٣ تشرینی یەکەم ١٣٢٤
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
ئەحمەد بەگ بە وەکالەت لە بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی سوروچوکی سەر بە سانجەقی سلێمانی دادەمەزرێت، ئەمەش لە نووسراوی بەهیەی مێژووی ٢٠ ئەیلوول ١٣٢٤ ژمارە ٧٩ ئاماژەی پێکراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

بۆ قۆمیسیۆنی تۆماری زانیاری کەسێتی فەرمانبەران



DH.MKT.02641.00048.004



DH.MKT.02641.00048.002

| DH.MKT. | 02641.00048 | 3 شەوال 1326 |
|---|---|---|

- بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز
قەڵەمی تۆمار
تەلەگرافنامەی بە شیفرە لە ویلایەتی موسڵەوە بۆ نەزارەتی ناوەخۆی عالی هاتووە
تەلەگرافنامەی مێژووی ٢ تشرینی یەکەم ٣٢٤ هاوپێچی بەندەیە، حەفید شێخ سەعید ئەفەندی هاووڵاتی سلێمانی، کارە گەندەڵیەکانی زۆر زیادی کردووە، ئەگەر ئەم حاڵەش بەردەوام بێت، ئەوا خوێنێکی زۆر دەڕێژرێت، بۆ سەلامەتی حاڵ و بەرژەوەندی گشتی پێویستە ناوبراو لەگەڵ خزم و پاشکۆکانی لەوێ نەمێنن، بۆ ئەم کارەش هێزێك بنێردرێت، ئەمجارە موتەسەرفی سلێمانی لەگەڵ قوماندانیەت ئاماژەیان پێکردووە، کە مانەوەی شێخی ناوبراو لە ناوچەکە ئاسایش و بارودۆخەکە تێك دەدات، بۆ دوورخستنەوەی زیانی ناوبراویش بە شێوەیەکی کاتی تەنیا خودی خۆی بۆ حەلەب و سوریە یاخود بۆ شوێنێکی وەکو حیجاز لە مەرکەزێکی ویلایەت دابنرێت، بۆ بەرژەوەندی کارەکە ئەگەر رای لێکچووش هەبێت، شێخی ناوبراو دەستگیر بکرێت باشترە، بۆ ئەمەش ئاگاداری دراوەتە لەشکری هومایۆن، بۆ چۆنیەتی جێبەجێ کردنەکەش بەپەلە زانیاری بدرێتە لایەنی بەندە، راگەیەندراوە فەرمان، لە ٩ تشرینی یەکەم ٣٢٤.
فەریق زەکی والی

- ١٦ تشرینی یەکەم ٣٢٤
شیفرە بۆ ویلایەتی موسڵ
لە ٩ تشرینی یەکەم ٣٢٤ بە مەبەستی دوورخستنەوەی شێخ سەعید ئەفەندی لە سلێمانی، لە کاتی ناردنی هێزی سەربازی رووبەڕووبوونەوە روو بدات دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی شەڕ، بۆیە بە رێگایەکی گونجاو ناوبراو داوەتی مەرکەزی ویلایەت بکرێت، ماوەیەکیش وەکو میوان دەست بەسەر بکرێت، راگەیەندراوە ئەمەیان بۆ بەرژەوەندی گشتی گونجاوە.

T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

تلغراف نامه



OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
2650 | 75 | 3

DH.MKT.02650.00075.003

| DH.MKT. | 02650.00075 | 13 شەوال 1326 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لـە تشرینی یەکـەم ١٣٢٤ دانەیـەك لـە تەلەگرافـی موفتـی زادە شـێخ سـاڵح خوێندراوەتـەوە، دوای وەرگرتنـی ئـەو وەڵامـەی لـە موتەسـەرفیەتی سـلێمانی وەرگیـراوە، بـە حەوت سـاڵ زیندانی سـزا دراوە، یەکێـك لەوانەی کـە لەلایەن ئەفسەرەوە دەستگیرکراون، ناوبراو هاتۆتە فەرمانگەی پۆلیس تا بە زۆرەملێ بیباتە دەرەوە، بەڵام ئاواتەکەی نەهاتۆتە دی و لەلایـەن ئەوانـەی کـە ئامـادە بوونـە دەسـتگیرکراوە، لە ئەنجام کاغەزی پەسـەند کردنی ڕێکخـراوە و بۆ لایەنی داد نێـردراوە، لەلایەنـی دادەوەش تاوانەکـە سـەلمێنراوە، لـەم نێوەنـدەدا بەپەلـە زانیاریـەکان رابگەیەندرێـت، فەرمان.

لە ٢٦ تشرینی یەکەم ١٣٢٤

فەریق زەکی والی موسڵ



DH.MKT.02666.00057.001

| 20 شەوال 1326 | 02666.00057 | DH.MKT. |
|---|---|---|

فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی
یەکەی چوارەم
١٨٢
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لە ویلایەت والی پێشوو بە شەو رایکردووە و ئەو کارانەی کە کردوویەتی هەمووی لە دوای خۆیدا بەجێی هێشتووە، سانجەقی سلێمانیش لە حاڵەتێکی ئاڵۆزدایە، موتەسەرفەکەی چەندین ساڵ لە قائیمقامیەت کاری کردووە، بۆیە لە دەرسەعادەت راگەیەندراوە؛ بۆ چاکسازی ویلایەت و جێگیر کردنی بارودۆخی ناوچەکە و نەهێشتنی هەرەشەکان، پێویستە ویلایەتەکان پشکنینیان بۆ بکرێت، ئەمەش لەسەر ئەو فەرمانبەرە لێهاتووانە وەستاوە کە لەوێ ئامادەن، لە قوماندانیەتی موسڵ تەلەگرافنامە هاتووە، لە دەستەواژەیەکی نووسراوەتەوە بە تێروانین لە وێنەی ئاماژە پێکردنەکە فەرمان دراوە لەسەر جێبەجێ کردنی، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەفەندیمە، لە ٢٠ شەوال ١٣٢٦ و لە ٢ تشرینی دووەم ١٣٢٤.
نازری جەنگ



| 14 زیلحیجه 1326 | 02701.00033 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٤ زیلحیجه ١٣٢٦
٢٥ کانوونی یەکەم ١٣٢٤
بۆ لایەنی عالی لە سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی نێردراوان
هەڵبژاردنی نێردراوان کە لە سانجەقی سلێمانی بەرێوەچووە، بە رێگەی یاسایی ئەنجام نەدراوە، بۆ ئەوەی سەر لە نوێ هەڵبژاردنەکە ئەنجام بدرێتەوە، تەلەگرافنامە بە واژووی مەحمود پاشا زادە سالح دەرچووە و هاوپێچ بۆ عالی نێردراوە.



| 17 زیلحیجه 1326 | 02703.00080 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

١٧ زیلحیجه ٣٢٦
٢٨ کانوونی یەکەم ٣٢٤
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیه
رەفعەت ئەفەندی کۆچکردوو؛ کاتی خۆی که له موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانیدا بووە، کۆکراوەی مووچەی ماوە و وەرینەگرتووە، کە پێك هاتووە لە ٣٠٠٠٠ قوروش و هەندێك، بۆیە خێزانەکەی بە ناوی عائیشە لە دەرسەعادەت کە لە لالە نیشتەجێیە، داواکاریەکی بە مۆری پێشکەش کردووە، داوای مووچەکە دەکات، لەبەر ئەوەی هەقی خۆیەتی لە ویلایەتی بەهیەوە لە دەفتەری قەرزی نارێك رێکخراوە و نووسراوەتەوە و بۆ خەزینەی جەلیلە نێردراوە، بە ووتەی ژمێریاریش رادەگەیەندرێت و لەم بابەتەدا پەلە کراوە.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
3245 243

<table>
<tr><td>BEO.</td><td>003245.243373</td><td>8 موحەڕرەم 1326</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٩ کانوونی دووەم ١٣٢٣<br>شیفرە بۆ ویلایەتی موسڵ<br>لە ٢٦ کانوونی دووەم ١٣٢٣؛ لە مەرکەزی ویلایەت فەرمانبەرێك بۆ سانجەقی سلێمانی بنێردرێت تاوەکو کاری ئەو دەهاتە تەواو بکات کە زیادە و ماوەتەوە هەروەها ڕێنمایی پێویست جێبەجێ بکات، لە خەزینەش مافەکانی دابین بکرێت.</td></tr>
</table>



| 26 رەبیعی کۆتایی 1326 | 003323.249202 | BEO. |
|---|---|---|

٢٦ رەبیعی کۆتایی ١٣٢٦
١٤ مایس ١٣٢٤
بۆ نەزارەتی دەفتەرخاقانی جەلیلە
مەحمود ئەفەندی فەرمانبەری دەفتەری خاقانی سانجەقی سلێمانی لەگەڵ لەتیف ئەفەندی فەرمانبەری دەفتەری خاقانی سانجەقی کەربەلا گۆرینەوەیان پێ بکرێت، لە سەر نووسراوی دەوڵەت مێژووی ٢٨ رەبیعی یەکەم ١٣٢٦ ژمارە ٨٧ و بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە و دوای وەرگرتنی مۆڵەت لە مێژووی ٢٥ رەبیعی کۆتایی ١٣٢٦، فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
3386 | 253892 | 2

BEO.003386.253892.002

| BEO. | 003386.253892 | 28 ڕەجەب 1326 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی دەرەوە
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١٦٢٧
بۆ جەنابی سەدری ئەعزەم لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
لەلایـەن حاکمـی ئورامانـی ئێـران سـەرپێچی لـە زەوییەکانـی گونـدی دینمەچـوی سـەر بـە قـەزای گولعەنبـەری سـانجەقی سـلێمانی کـراوە و دوای گفتوگـۆ نـووسراو لـە نەزارەتـی خەزینـەی تایبەتـی شـاهانەی جەلیلـە وەرگیـراوە، بـە ناردنـی ئـەم نووسراوانـە و جێبەجـێ کردنـی کارەکـە، نـووسراوی سـەدری ئەعزەمـی جەنابـی پەیوەندیـداری سـەدارەت لـە مێـژووی ١٤ ڕەجـەب ٣٢٦ ژمـارە ٨١٧ خوێندنـەوەی بـۆ کـراوە، ئـەو نووسراوانـەی نـەزارەت ناردوویەتـی تێـدا هاتـووە؛ بـۆ ڕێگەگرتـن لـە دووبارەنەبوونـەوەی ئـەم سـەرپێچیانە، لـە داهاتـوودا لـە کاتـی کۆکردنـەوەی داهاتەکانـی زەوی ناوهاتـوو مەفرەزەیەکـی سـەربازی ئامـادە بێـت، یاخـود بـە ڕێگـەی گفتوگـۆی دیبلۆماسـی چارەسـەری کێشـەکە بکرێـت، چونکە مافـی دەوڵـەت و زەوییەکانـی هاوسـنوور پەیوەسـتە بـە مافـی حکوومـەت و دەوڵـەت، هەروەهـا فەرمانـی پاراسـتنی دەوڵـەت لەسـەر چ شـتێك وەسـتاوە وەکـو خـۆی جێبەجـێ بکرێـت و ئـەم ڕاگەیەنـدراوە هـەر ئێسـتا جێبەجـێ بکرێـت، جگـە لەمـە عوسـمان پاشـای جـاف قائیمقامی قـەزای گولعەنبـەر بـرادەری حاکمـی ئورامانـە کـە لـە زەوی باسـکراودا سـەرپێچی کـردووە، بۆیـە کاریگـەری بەسـەر حاکمـی ناوهاتـوو هەیـە، بـەو هیوایـەی ئامـادەکاری کاریگـەر ئەنجـام بـدات، لـەم بابەتـەش تێروانینـی وورد بکرێـت، ئەمجـارە باڵیۆزخانـەی تەهـران بـە دووپاتکردنـەوە ئـاگاداری نـاردووە و حکوومەتـی ئێـران بـە دەسـت پێشـخەری کاری کاریگـەر و بەهێـزی کـردووە و وایکـردووە هـۆکاری ڕێگەگرتنەکـە جێبەجـێ بکرێـت، لەلایەکـی تـر ئـەو کارەی پەیوەسـت کـراوە بـە نەزارەتـی بەندەمـان جێبەجـێ کـراوە، لەلایەکـەی تریـش ئەوانـەی پەیوەسـتن بـەم کارەوە بـۆ جێبەجـێ کردنـی مامەڵەکـە فەرمـان و ڕاگەیەنـدراوی جێبەجـێ کردنەکـەی پەیوەسـتە بـە فەرمانـی عالـی پەیوەندیدارانـی سـەدارەت، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
لە ٢٨ ڕەجەب ٣٢٦ و لە ١٢ ئۆغستۆس ٣٢٤
نازری دەرەوە



| 26 رەمەزان 1326 | 003419.256390 | BEO. |
|---|---|---|

٢٦ رەمەزان ٣٢٦
٩ تشرینی یەکەم ٣٢٤
بۆ نەزارەتی سندوقی خانەنشینی مولکیەی بەهیە
خوالێخۆشبوو عالم پاشا موتەسەرفی پێشووی سانجەقی سلێمانی لە کاتی مردنی خێزانی هەبووە، بەڵام نە خۆی و نە خێزانەکەی پێرانەگەیشتوون مووچە وەربگرن و لە کۆتاییدا خێزانەکەشی مردووە، بۆیە دوریە خان کچی خوالێخۆشبووە و مافی ئەوەی هەیە مووچەکەی باوکی وەربگرێت، بۆ ئەم مەبەستە دوریە خان داواکاری ناردووە و داوای کردووە مووچەکەی باوکی بۆ ببرێتەوە، بە گوێرەی نیزام هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

TELEGRAMME

L'état n'accepte aucune responsabilité à raison du service de la télégraphie

| محلی نومروسی N° du dépôt | کلمات Nombres des mots | غروب Group | محلی تاریخی Date du dépôt | ساعت Heures | دقیقه Minutes | روز ویا شب Matin ou Soir | طریق Voies | اشارات مخصوصه Indications non taxées |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٧٦٨٨ | ٦٥ | ٤٦ | ٢٩ | | | | | |

OSMANLI ARŞİVİ
DH.ŞFR
412 97

DH.ŞFR.00412.00097.001

| 21 ڕەبیعی کۆتایی 1327 | 00412.00097 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
سێ پیاو لە دانیشتوانی سانجەقی سلێمانی بە جلی دەروێشان، لە بازاری سەعرد دەفیان لێ داوە و بە گۆرانی باسیان لە گشت کاربەدەکانی ئەرمەن کردووە، بۆیە دەستگیرکراون و لە موتەسەرفیەتی سەعرد ئاماژە بە ناسنامەی کەسەکان و مەبەستی گەشتکردنیان کراوە و لەگەڵ لێکۆڵینەوەی دەورووبەر نووسراوەتەوە و ڕاگەیەندراوە، لە ٢٩ نیسان ٣٢٥.
حوسنی والی بەتلیس



مكتوبی قلمنه مخصوص

OSMANLI ARŞİVİ
ZB
626 54

ZB.00626.00054.001

| ZB. | 00626.00054001 | 3 سەفەر 1327 |
|---|---|---|

١١ شوبات ١٣٢٤
بۆ ویلایەتی موسڵی عالی
موئەیەد ئەفەندی وەکو ئەفسەری سانجەقی سلێمانی دامەزراوە بۆ ئەوەی بزانرێت ئاخۆ تا ئێستا گەیشتۆتە شوێنی ئەرکەکەی؛ پرسیار لە قۆمیسیۆنی عالی ویلایەت کراوە و لە نووسراوی مێژووی ٢٢ تشرینی یەکەم ١٣٢٤ ژمارە ٨ کە لەگەڵ خۆی هەڵیگرتووە، لە تۆمار دەرکەوتووە گەیشتۆتە شوێنی مەبەست.



| 12 جه‌مادی كۆتایی 1327 | 01096.00014 | ŞD. |
|---|---|---|

١٢ جه‌مادی كۆتایی ١٣٢٧
١٧ حوزه‌یران ١٣٢٥
بریارنامه
بریارنامه‌ی مێژووی ٣ جه‌مادی كۆتایی ١٣٢٧ ژماره‌ ١٠٢٣٧ ی ده‌سته‌ی گشتی سندوقی خانه‌نشینی مولكیه‌ له‌گه‌ڵ پۆسته‌ی ژمێریاری و پوخته‌ی فه‌رمانگه‌ی دارایی خوێندنه‌وه‌ی بۆ كرا.
بۆ عه‌باس ئه‌فه‌ندی كوڕی كۆچكردوو سه‌ید له‌تیفوڵلا ئه‌فه‌ندی فه‌رمانبه‌ری ده‌فته‌رخاقانی سانجه‌قی سلێمانی، له‌گه‌ڵ كچه‌كانی خه‌دیجه‌ خان و حه‌مدیه‌ خان و زه‌ینه‌ب خان و زوبیده‌ خان هه‌روه‌ها خێزانه‌كه‌ی مه‌ریه‌م خان ٤٥٧ قوروش مووچه‌یان بۆ براوه‌ته‌وه‌. به‌ راگه‌یاندنی بریاری له‌سه‌ر درا، چونكه‌ خه‌رج كردنی بره‌ مووچه‌ی باسكراو به‌ بریارنامه‌ گونجاو بینراوه‌، له‌سه‌ر بریارنامه‌ی ناوهاتوو مامه‌ڵه‌كه‌ی جێبه‌جێ كرا و حه‌واڵه‌ی نه‌زاره‌تی سندوقی خانه‌نشین كراوه‌، هه‌روه‌ها به‌ نووسینی نووسراو په‌سه‌ند كردنی پێشكه‌ش كرا.



| ٢ موحەررەم ١٣٢٧ | 02718.00053 | **DH.MKT.** |
| --- | --- | --- |

٢ موحەررەم ١٣٢٧
١٢ کانوونی دووەم ١٣٢٤
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
وەڵامــی نـووسراوی مێـژووی ١١ کانوونــی یەکـەم ١٣٢٤ ژمـارە ١٠٠٦ عالیـە، رەفعـەت بـەگ موتەسـەرفی پێشـووی سـانجەقی سـلێمانی مـردووە، لـە نەزارەتـی عاجیزانـە مووچـەی هەڵگرتـووی نییـە، بەڵکـو لـە خۆچێـی پارەکـەی وەرنەگرتـووە، ئـەو مووچەیـەی کـە وەرینەگرتـووە لـە دەفتـەری قـەرزی نارێـك تۆمـار کـراوە، بۆیـە لەلایـەن خێزانەکەیـەوە داواکـراوە پارەکـە خـەرج بکرێـت و لـە ژمێریاریـش باسـکراوە، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش لـە مێـژووی ٢٨ کانوونـی یەکـەم ١٣٢٤ نـووسراو بـۆ ویلایەتـی موسـڵ کـراوە.



| DH.MKT. | 02724.00054 | 8 موحەررەم 1327 |
|---|---|---|

٨ موحەررەم ١٣٢٧
١٨ کانوونی دووەم ١٣٢٤
بۆ جەنابی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت
لەبەر ئەو ناکۆکیەی لە نێوان سەید و شێخەکاندا هەیە، بە گونجاو نازانرێت تۆفیق پاشا موتەسەرفی سلێمانی لە کارەکەی بەردەوام بێت، بۆیە لە ویلایەتی موسڵ نووسراو کراوە، کە ناوبراو دووربخرێتەوە و لە شوێن ئەو خانەدان زیا پاشا موتەسەرفی پێشوی دەرسیم دابمەزرێت، ئەمەش لە بریارنامەی قۆمیسیۆنی تۆماری ناسنامەی فەرمانبەران جێگیر کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی بە هاوکاری پەیوەندیدارانی سەدارەت دەبێت.



| DH.MKT. | 02798.00040 | 10 رەبیعی کۆتایی 1327 |
|---|---|---|

١٠ رەبیعی کۆتایی ٣٢٧
١٨ نیسان ٣٢٥
بۆ نەزارەتی دارایی عالی
لە زاناکانی ئێران؛ شێخ حەسەن سەعید ئەفەندی پەنای بۆ ئێمە هێناوە و مانگانە ١٠٠٠ قوروش مووچەی بۆ دەبڕێتەوە، ئەم پارەیەش لە دارایی سلێمانی پێی دەدرێت، چونکە لەوێ نیشتەجێ دەبێت، بۆ حەواڵە کردنی مامەڵەکەی، نووسراوی مێژووی ٧ مارت ٣٢٥ی ویلایەتی موسڵ هاتووە لەگەڵ ڕێنمایی دارایی بۆ سەروو نێردراوە.

DH.MKT.02832.00020.002

DH.MKT.02832.00020.002

| DH.MKT. | 02832.00020 | 29 رەبیعی کۆتایی 1327 |
|---|---|---|

٧ مایس ١٣٢٥
سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی نێردراوەکانی جەلیلە
بەهـۆی سـتەمکارانەوە ئاشایشـی سـانجەقەکانی سـلێمانی و کەرکـووك تێکچـووە و کاری بازرگانـی وەسـتێنراوە، بازرگانـی ئێمـەش لەگـەڵ سـلێمانییە، لەبـەر هاتنـی چەتـەوە ناتوانیـن کەلوپـەل بنێریـن، ئـەم حاڵەتـە هـەم بـۆ خەزینـەی دەوڵـەت هـەم بـە شـێوەیەکی گشـتی بـۆ بازرگانەکانـی بەغـداد بـە زیـادەوە کێشـەی دروسـت کـردووە، بـەم شـێوەیەش ئەمنیەتـی بازرگانـی جێگیـر نییـە و شـڵەژاوە، بـە تەواوەتـی بازرگانـی وەسـتێنراوە، فەرمانـرەواش قەبـوڵ نـاکات حاڵەتـی سـەرپێچیکارانە و نەگونجـاو روو بـدات، بـۆ گەرانـەوەی ئایشـی سـانجەقەکانی ناوهاتـوو تـکا دەکەیـن کارێـك بکرێـت، لـەم بابەتـەدا فەرمـان.

حەفیری زادە یاسـین بازرگان/ ئیلیا عەبدولعەزیز بازرگان/ موختار زادە بازرگان/ شـاول خاخام سـەقبل بازرگان/ سـەید قاسـم بـازرگان/ عەلـی عەبدولـرەزاق زیـا بازرگان/ یەحیا بازرگان/ یوسـف شـەنتوب بازرگان/ مسـتەفا جـادر بازرگان/ سـەید جـەواد بـازرگان/ عـەرزە ساسـون بازرگان/ سـەلمان حاجـی داود بـازرگان/ ئیبراهیم حەقیل بـازرگان/ محیەددین بازرگان/ نەسـیم بەشـاعی بازرگان/ جەعفەر جەواد عەبدولرەزاق بازرگان/ داود شـەنتوب بازرگان/ شاول ساڵح ئەلیاهو بـازرگان/ روبیـل یەعقـوب شـوحیتە بـازرگان/ ئەسـمەق عـەزرە بازرگان/ مونشـی بـازرگان/ حەقیـل یەهودا بـازرگان/ یوسـف جبرائیـل عەباجـی بـازرگان/ ئەسـمان روبیـل بـازرگان/ حەقیـل شـەماس بـازرگان/ مونشـی شـوحیت بـازرگان




BEO.003373.252932.002

| 26 رەبیعی کۆتایی 1326 | 003373.252932 | BEO. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی دەرەوە
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٧٩٤
بۆ جەنابی سەدری ئەعزەم پەیوەندیداری سەدارەت
ڕاگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە
ساڵی ڕابردوو زەوی و زاری مولکی میری دیمەچوی قەزای گولعەنبەری سەر بە سانجەقی سلێمانی لەلایەن حاکمی ئۆرامانی ئێران هێرشی کراوەتە سەر و داهاتەکەیان تاڵان کردووە، لە سەرچاوەی ئاماژەکاندا دەرکەوتووە ئەم داهاتەی کە باسکراوە لە ساڵانی داهاتووشدا لە ژێر دەسەڵاتی و سەرپێچیەکانی ناوبراودا دەمێنێتەوە، بۆیە بە پەلە ڕێگە لەم سەرپێچیانە بگیرێت، بۆیە نووسراوی خەزینەی تایبەتی شاهانەی نەزارەتی جەلیلە نێردراوە، لەگەڵ ڕاگەیەندراوی عالی جێبەجێ دەکرێت و ئینجا ڕادەگەیەندرێت و بڵاودەکرێتەوە، ئەمەش لە ٢٢ موحەرەم ٣٢٦ ژمارە ١٧٠٧ لە نووسراوی سەدری ئەعزەمی پەیوەندیداری سەدارەت خوێندراوەتەوە و بە تەلەگراف ئامۆژگاری پێشوەختە نێردراوە، لە وەڵامدا هاتووە ئەو زەوییەی کە بە سەرچنار ناسراوە لە کۆندا لە ژێر دەسەڵاتی ئیدارەی ئێراندا بووە، دەوڵەتی عوسمانی دەستی وەرنەداوەتە زەوی باسکراو، ئەمەش لەلایەن حاکمی ناوهاتووەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە و وەڵامی ئەو ڕاپۆرتەی کە لە وەزارەتی دەرەوە وەرگیراوە، وێنەیەکی نێردراوە، باڵیۆزخانەی ئێران لە بەرژەوەندی خۆی نووسراوی ناردووە و وێنەیەکی نووسراوەکە هاوپێچ لەگەڵ نووسراوی وەرگێردراوی نووسراوەکە دەنێردرێتەوە و بەیەکەوە پێشکەش دەکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٦ رەبیعی کۆتایی ٣٢٦ و لە ١٤ مایس ٣٢٤.
نازری دەرەوە


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
3486 261388

<table>
<tr><td>BEO.</td><td>003486.261388</td><td>13 موحەررەم 1327</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٣ موحەررەم ٣٢٧<br>٢٣ کانوونی دووەم ٣٢٤<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لە ناو ویلایەتی موسڵ، جەنابی تۆفیق پاشا موتەسەرفی سانجەقی سلێمانی دوور دەخرێتەوە، لە شوێن ئەو موتەسەرفی پێشووی سانجەقی دەرسیم جەنابی زیا پاشا دادەمەزرێت، لەم بارەیەوە لەسەر نووسراوی مێژووی ٨ موحەررەم ٣٢٧ ژمارە ٤٢٧٨ دوای رەزامەندی لە مێژووی ١٢ موحەررەم ٣٢٧ جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>



BEO.003512.263326.002

| BEO. | 003512.263326 | 20 سەفەر 1327 |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی دەفتەر خاقانی
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٤٦٨
بۆ جەنابی سەدری ئەعزەم لە لایەنی پەیوەندیدارانی سەدارەت
داواکاری بێ  نرخی نزاکارتانە
دوای مردنی لوتفوڵلا ئەفەندی فەرمانبەری دەفتەرخاقانی سانجەقی سلێمانی؛ لە شوێن ئەو حیکمەت ئەفەندی فەرمانبەری دەفتەرخاقانی سانجەقی زور، لە شوێن ئەویش حوسنی ئەفەندی فەرمانبەری دەفتەرخاقانی سانجەقی چوروم بە مەرجی بەرز کردنەوەی پلە ئەرکەکەیان بگۆردرێتەوە، لە شوێن ئەویش حەمدی ئەفەندی فەرمانبەری دەفتەرخاقانی پێشووی دەراج دابمەزرێت کە هیچ شتێکی نییە رێگر بێت لە بەکارهێنانی، بۆ ئەمەش نووسراو کراوە، بریارنامەش لە نەزارەتی ئەنجوومەن رێکخراوە، لەگەڵ کاغەزەکانی تر بەیەکەوە پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی بە هاوکاری پاشاوە دەبێت، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢٠ سەفەر ٣٢٧ و لە ٢٨ شوبات ٣٢٤
نازری دەفتەرخاقانی نزاکار محەمەد




<table>
<tr><td>BEO.</td><td>003605.270356</td><td>8 رەجەب 1327</td></tr>
<tr><td colspan="3">٨ رەجەب ١٣٢٧<br>١٢ تەمموز ١٣٢٥<br>بۆ لایەنی عالی لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>بە پشت بەستن بە بریارنامەی تایبەتی بریارەکان جەنابی تۆفیق پاشا موتەسەرفی پێشووی سانجەقی سلێمانی مانگانە ٢٢٥٠ قوروش مووچەی دابراوانی بۆ دەبرێتەوە، بە بریاری شورای دەولەت بە رەزامەندی مێژووی ٩ تەمموز ١٣٢٥ جەنابی خەلافەتپەناهی بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، جێبەجێ دەکرێت.<br><br>بۆ نەزارەتی سندوقی مولکیەی خانەنشین و دابراوانی بەهیە<br>نووسراوی راگەیەندراو وێنەکانی لە باڵادا نووسراوەتەوە، هەروەها جەنابی خەلافەتپەناهی فەرمانی پاشاییەکەی دەرچووە، بە گوێرەی ئەم برەیە هیممەت بکرێت لە نەزارەتی سندوقی مولکیەی خانەنشین و دابراوانی بەهیە کارەکە جێبەجێ بکرێت.</td></tr>
</table>



| 7 شەعبان 1327 | 003625.271817 | BEO. |
|---|---|---|

٧ شەعبان ٣٢٧
١٠ ئۆغستۆس ٣٢٥
بۆ نەزارەتی دەفتەرخاقانی عالیە
بە نووسراوی عالی لە مێژووی ٦ ئۆغستۆس ٣٢٥ ژمارە ١٩٠ کارەکە کۆتایی پێ هاتووە، بە گوێرەی ئەم نووسراوە عەبدولوەهاب ئەفەندی فەرمانبەری دەفتەرخاقانی سانجەقی سەعرد بۆ سانجەقی سلێمانی، هەروەها فەرهاد بەهجەت ئەفەندی باش کاتیبی دەفتەرخاقانی سانجەقی دەراج وەکو فەرمانبەری دەفتەرخاقانی لە سانجەقی سەعرد دادەمەزرێن، ئەم دامەزراندنەیان بە گونجاو زانراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

بە ئاماژەی راوێژکاری عالی


داخلیه نظارتی مخابرات عمومیه دائره‌سی

شعبه

اوراق نومروسی | مسودی | مبیضی

OSMANLI ARŞİVİ

DH.MUİ

54-1 | 38

| 6 جەمادی یەکەم 1328 | 00094.1.00039 | DH.MUI. |
|---|---|---|

٦ جەمادی یەکەم ١٣٢٨
٢ مایس ١٣٢٦
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
بـۆ ڕێکخسـتنی نۆژەنکردنــەوە، لــە حەواڵەنامەکــە دەرکەوتــووە دابینکردنەکــەی ئەنجـام نــەدراوە، بــەڵام ئــەو بــڕە پارەیــەی کــە بــۆ نــۆژەن کردنــەوەی فەرمانگــە فەرمیەکانــی ســانجەقی ســلێمانی دابیــن کــراوە، بەمەبەسـتی خـەرج کردنـی پارەکـە؛ مامەڵـەی پـرس و راکـەی لـە مێـژووی ٢٧ نیسـان ١٣٢٦ تەلەگرافنامـە لـە ویلایەتـی موسـڵ هاتـووە و بـۆ عالـی نێـردراوە، بـە تێروانیـن لـە نووسراوەکانـی فەرمانـی جێبەجـێ کردنـی دراوە.

بە ئاماژەی بەڕێوەبەری بەهیە


I.DH 1484/12 / 1328.L/12

2

İ.DH.01484

| I.DH. | 01484.000012 | 14 شەوال 1328 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
قەڵەمی راگەیەندراوەکانی ئەنجوومەنی بریکارەکان
٣٠٨٨
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
دەرکەوتووە لە ناو ویلایەتی موسڵ رەشید بەگ موتەسەرفی سانجەقی سلێمانی لە ئەنجامی خراپ بەرێوەبردنی ئیدارەی ناوچەکە، کاروباری کارگێری لیوا تووشی ناجێگیری بووە، بۆیە بەردەوام بوونی لە ئەرکەکەی گونجاو نییە، لەسەر ئاماژەی ویلایەتی بەغداد ناوبراو دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەو بەهجەت بەگ قائیمقامی مەرکەزی ئەدرنە دابمەزرێت، بۆ رەزامەندی، نووسراو لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە بە هاوپێچەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، جەنابی پاشا لە فەرمانی پاشادا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو نووسرایەوە بەرێزم.
لە ١٤ شەوال ١٣٢٨ و لە ٥ تشرینی یەکەم ١٣٢٦
سەدری ئەعزەم



| 24 رەبیعی یەکەم 1329 | 00450.00020 | ŞD. |
|---|---|---|

٢٤ رەبیعی یەکەم ١٣٢٩
٩ مارت ١٣٢٧
نووسراو بۆ نەزارەتی دارایی
ئـەو توونتانـەی کـە لـە سـاڵی ٣٠٨ بـە دواوە لـە ئیدارەی رەژی سـانجەقی سـلێمانی دەسـتکەوتووە، زیاترە لـە خۆی و بـە مەرجنامـەی فەرمانڕەوایـی سـەرپێچیە، بۆیە لـە کۆمپانیا رسـوماتی پەرینـەوەی وەردەگیرێت، نـووسراوی مێژووی ٢٩ کانوونـی یەکـەم ١٣٢٦ ژمـارە ٣٨٩/١٥٧٣٠ هاتـووە و حەواڵـەی شـورای دەوڵـەت کـراوە، بڕیـاری شـورای دەوڵـەت بـە وێنەیـەك دەنێردرێـت، هیممـەت کردن لـە جێبەجێ کردنی مامەڵەکـە دەگەڕێتەوە بـۆ پەیوەندیدارانی نـەزارەت.




| BEO. | 003234.242508 | 16 زیلحیجە 1329 |
|---|---|---|

١٦ زیلحیجە ٣٢٩
٧ کانوونی دووەم ٣٢٣
بۆ نەزارەتی خەزینەی تایبەتی شاهانەی جەلیلە
بـۆ پاراسـتنی زەوی و زاری دیمەچـوی ئەملاکـی هومایۆنـی قـەزای گولعەنبـەر لـە سـانجەقی سـلێمانی؛ کـە لەلایـەن حاکمـی ئورامانـی ئێـران هێرشـی کراوەتـە سـەر، لەسـەر نـووسراوی مێـژووی ٢ رەمـەزان ٣٢٥ ژمـارە ٥١ وەڵامـی ئـەو ئاگاداریـەی پێشـووتر نیـردراوە، لـە ویلایەتـی موسـڵ نـووسراو هاتـووە، حاکمـی ئورامـان کـە سـەر بـە ئێرانـە، ئـەو داهاتـەی لێـی بـووردراوە ویسـتویەتی لـە قـەزای ناوهاتوو بە دەسـتی بهێنێتـەوە، بە قسـە کردن لەگـەڵ حکوومەتی ئێـران بـە پێویسـت زانـراوە کارەکـە چارەسـەر بکرێـت، هەروەهـا زەوی و زاری باسـکراو بـۆ ئورامان بە کشـتوکاڵێکی گرنـگ هەژمـار کـراوە، بۆیـە ئیـتر ئـەو کشـتوکاڵەی لـەوێ دەکرێـت داهاتەکـەی پەیوەسـت دەبێـت بـە خەزینـە و پەسـەند دەکرێـت و لـە کاتی جێبەجێ کردنی کارەکـە و کاری دوورینەوە مەفرەزەیەك لەگـەڵ فەرمانبەرانی ئەملاکی هومایۆن هاوبـەش دەبێـت و دەرواتـە شـوێنەکە، جگـە لەمـە بـۆ ڕێگەگرتـن و ڕێگـە نـەدان بـە حاکمـی ئورامـان دەسـت لـە کاروبـاری زەوی و زاری باسـکراو وەربـدات، ئـاگاداری دراوەتـە نەزارەتـی دەرەوەی جەلیلـە، لـە نەزارەتـی جەلیلـەوەش کارەکـە جێبەجـێ دەکرێـت و رادەگەیەندرێـت، هیممـەت دەکرێـت لـە ناردنـەوەی هاوپێچـەکان.

بە ئاماژەی جەنابی ڕاوێژکار

| BEO. | 003859.289424 | 20 سەفەر 1329 |
|---|---|---|

٢٠ سەفەر ١٣٢٩
٧ شوبات ١٣٢٦
بۆ نەزارەتی دەفتەر خاقانی عالی
عەبدولوەهاب ئەفەندی لەو کاتەی کە فەرمانبەری دەفتەرخاقانی سلێمانی بووە، پلەکەی بەرز کراوەتەوە و لە عەمارە بە فەرمانبەری دەفتەر خاقانی دامەزراوە، بەڵام لەسەر داوای ناوبراو لە ئەرکی پێشووی دەهێڵدرێتەوە و لە شوێن ئەو نوری ئەفەندی کاتبی تابوری مەرکەزی کەرکووك لە عەمارە دەست بە ئەرکەکەی دەکات، بۆ ئەم مەبەستە لە مێژووی ٢٠ کانوونی دووەم ١٣٢٦ فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی جێبەجێ بکرێت، لەم بابەتەدا وێنەی پەسەند کراوی بریارنامە هاوپێچ نێردراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
DH.MTV

DH.MTV.00049.1.00041.002

| DH.MTV. | 00049.1.00041 | 17 زیلقەعدە 1330 |
|---|---|---|

شورای دەوڵەت
ژمارە ١٦٣
جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە
فەتحوڵڵا ئاغازادە ئەحمەد ئاغا فەرمانبەری مەڕوماڵاتی ساڵی ٣٢٠ ی قەزای مەعمورە، پروپاگەندەی ئەوەی لەسەر کراوە کە ئەو کاتەی لەسەر ئەرکی بووە، لە باجی مەڕومالات دزی کردووە و باجی زیاتری لە خەڵك وەرگرتووە، بۆیە دراوەتە دادگا، لە بارەی وەرگرتنی بێتاوانیەکەی لە ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی سلێمانی، لەلایەن یاریدەدەری داواکاری گشتی ئەنجوومەنی کارگێری لیوا لەگەڵ داواکاری تاکە کەسی وەکیلی ژمێریاری لیوای ناوهاتوو بەیاننامەی پێداچوونەوە و ئیستدعانامەکە رەت کراوەتەوە، نووسراوی بە بریاری دادگای پێداچووەوەی شورای دەوڵەت رێکخراوە، پێشکەشی سەدری ئەعزەمی پەیوەندیداری سەدارەت کراوە، چۆنیەتی کارەکە و خەرجی نووسراوە بە بریارەکە کە دەکاتە ١٠٠ قوروش لە وەکیلی ژمێریاری پێداچوونەوەی داواکاری وەرگیراوە، لەگەڵ خەرجی پولەکە و رەت کردنەوەی لە ویلایەتی موسڵ حەواڵەی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە کراوە و زانیاری دراوەتە نەزارەتی دارایی جەلیلەش، شایەنی هاوکاری پایەبەرزە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١٧ زیلقەعدە ٣٣٠ و لە ١٤ تشرینی یەکەم ٣٢٨
حیکمەت عارف نازری داد و مەزهەبەکان/ وەکیلی سەرۆکی شورای دەوڵەت



ML.EEM.00892.00037.001

| 11 رەبیعی یەکەم 1330 | 00892.00037 | ML.EEM. |
|---|---|---|

دەفتەرداری ویلایەتی موسڵ
ژمارە ٨٧٣٣ گشتی
١١٣٣ تایبەتی
بۆ لایەنی عالی لە نەزارەتی دارایی جەلیلە
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
کۆچکردوو مەحمود پاشازادە سەعید بەگ دانیشتووی گەرەکی کانی ئیسکانی سلێمانی بوو؛ شوێنگرەوەی باجی دە یەکی ساڵی ٣٢١ سانجەقی سلێمانی لەسەر ناویەتی، ئەو داوایەی لەسەری بەرز کراوەتەوە لە دادگا نووسراوی بە بریاری لەسەر دەرچووە، بە گوێرەی ئەم نووسراوە ناوبراو لە بازاری سلێمانی ئەو پێنج دوکانەی کە هەیەتی، بە ناوی خەزینەی جەلیلە مامەڵەی فرۆشتنی ئەنجام درا، لە ژمێریاری سلێمانی لە نووسراوی ٥ کانوونی دووەم ١٣٢٧ ژمارە ١٦٥ ئاماژەی پێکراوە، لەم بابەتەدا پێنج پارچە سەنەد نێردراوە، هاوپێچ پێشکەشی پەیوەندیدارانی نەزارەت کراوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١١ رەبیعی یەکەم ١٣٣٠ و لە ١٦ شوبات ١٣٢٧.
بە مۆری موختار دەفتەرداری موسڵ




| 18 جەمادی کۆتایی 1330 | 01493.00070 | I.DH. |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
فەرمانگەی هەواڵگری گشتی
یەکەی دووەم
٧٨٨
لە ویلایەتی موسڵ؛ بەڕێوەبەری ناحیەی غەوارەی سەر بە سانجەقی سلێمانی ئەرکەکەی بۆ گوندی خورمال لە هەمان سانجەق گواستۆتەوە.

بۆ ئەم کارە نەزارەتی ناوەخۆ ئەرکی پێ سپێردراوە فەرمانی پاشا جێبەجێ بکات، لە ١٨ جەمادی کۆتایی ١٣٣٠ و لە ٢٢ مایس ١٣٢٨.

عادل نازری ناوەخۆ/ سەدری ئەعزەم

| 10 جەمادی کۆتایی 1330 | 004045.303335 | BEO. |
|---|---|---|

١٠ جەمادی کۆتایی ١٣٣٠
١٤ مایس ١٣٢٨
بۆ وەکالەتی نەزارەتی دارایی جەلیلە
فرقەکانی هارونی و یەداغی و ساداتی هۆزی جاف کە پاشکۆی سانجەقی سلێمانین، پێنج ساڵ لەمەوبەر چۆنەتە ناحیەی زەهاوی سەر بە ئێران، هەندێك لەوانەی کە لە هاووڵاتی عوسمانین، لەلایەن سەید ساڵح رۆژ ئەفەندی پۆست نشینی گوندی یاوەنوری سەر بە قەزای سەڵاحیە تەلەگرافنامەی بۆ عالی ناردووە و تکای کردووە ببووردرێن و بۆ گەڕانەوەیان هاوکاری بکرێن، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە.

| 14 رەجەب 1330 | 004057.304203 | BEO. |
| --- | --- | --- |

١٤ رەجەب ١٣٣٠
١٦ حوزەیران ١٣٢٨
بۆ وەکالەتی نەزارەتی دارایی جەلیلە
فەتحوڵلا ئەفەندی لە ئەرکی دەفتەرخاقانی سانجەقی سلێمانی و راغب ئەفەندی لە ئەرکی قەرە حیسار و مونیر ئەفەندی لە ئەرکی ئورفە و عەلی رزا ئەفەندی لە ئەرکی ئیچ ئیل و رەفعەت ئەفەندی لە ئەرکی کەرکووك دامەزرێن، بۆ ئەمەش نووسراوی عالی لە مێژووی ٩ حوزەیران ١٣٢٨ ژمارە ٩٧ نووسراوەتەوە، لەگەڵ لیستی فەرمانی پاشا بە واژووی هومایۆنی جەنابی پاشا پەسەند کردنی فەرمووە، وێنەی پەسەند کراوی هاوپێچ هیممەت بکرێت لە ئەنجامدانی.



BEO.004295.322082.002

| BEO. | 004295.322082 | 30 رەجەب 1332 |
|---|---|---|
| نەزارەتی دارایی<br>بەڕێوەبەرایەتی گشتی ژمێریاری گشتی<br>قەڵەمی هەژماری کۆن<br>گشتی ٥٩٥١<br>تایبەتی ١٠٩<br>دەرسەعادەت لە ١١ حوزەیران ١٣٣٠<br>پوختە: لە بارەی وەقفی شێخ کاك ئەحمەد ئەفەندی<br>بۆ جەنابی لایەنی عالی لە پەیوەندیدارانی سەدارەت<br>راگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە<br>لە سانجەقی سلێمانی باجی دە یەکی گوندەکان بۆ خۆراکی تەکیەی کاك شێخ ئەحمەد ئەفەندی تەرخان کراوە، بۆ شوێنگرەوەی دە یەکی ئەم گوندانە ٢٢٥٠ قوروش وەکو تەخمین بۆ خۆراکی ئەم تەکیەیە دابین کراوە، بەڵام بۆ سرینەوەی ئەم برە پارەیە بە نووسراوی ١٧ تشرینی دووەم ٣٢٩ ژمارە ٢٤٩/١١٨٦٢ داوای رەزامەندی کراوە، کەچی هێشتا وەڵامی وەرنەگیراوە، فەرمان و ئاماژەی جێبەجێ کردنی راگەیەندراوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>بە ناوی نازری دارایی | | |




DH.MB.HPS.00075.00004.002

| DH.MB.HPS. | 00075.00004 | 12 جەمادی کۆتایی 1331 |
|---|---|---|

نەزاره تی داد و مەزهەبەکان
بەڕێوەبەرایەتی کاروباری سزا
ژمارە ٦٦/٦١٦٥
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
پوختە: لە بارەی گرتووخانەی سلێمانی
جەنابی میری میرانی ئەفەندم
گرتووخانـەی سـانجەقی سـلێمانی زەوییەکـەی خۆڵـە و شـێوەی دروسـت کردنەکـەی تەندروسـت نییـە و سـەلامەتی تەندروسـتی تێـدا پارێـزراو نییـە، لەلایەکـی تـر گرتووخانەکـە لـە دوو ژوور و دوو ڕێـڕەو پێـك دێـت، بەشـی دەستبەسـەر و دەسـتگیرکراوان نـاکات، ئەگەرچـی بـە ناچـاری دەسـتگیرکراوەکان لـەم ژوورە دانـراون، بـەڵام لـە هاویـن لـە دوو ڕێڕەوەکـەدا سـێبەر نییـە، بۆیـە تـا ئێـوارە دەسـتگیرکراوان و سـزادراوان لـە ژێـر خـۆر دەمێننـەوە، کە لـە ئاسـتێکە بۆتـە جێگـەی گلەیـی کـردن، جگـە لەمـە لەبـەر ئـەوەی دەستبەسـەرکراوان و تاوانبـاران و ئاژاوەگێـران ژووری تایبەتیـان نییـە، هـەر هەمـووی بەیەکـەوە لـە یـەك ژوور کۆکراونەتـەوە، وای لێهاتـووە کاریگـەری لەسـەر دەروونیـان دروسـت بـووە، بـە شـێوەیەکە کـە زیاتـر لـە خـۆی کاریگـەری خراپـی دروسـت کـردووە، هەروەهـا بـۆ نەخۆشـەکانیش شـوێنێك نییـە بکرێتە نەخۆشـخانە و لە کاتی تیمارکردنیان کێشـەی زۆر دروسـت دەبێـت، هەروەها بـۆ چاککردنـی لایەنـی ئابووریـان هیـچ هەنگاوێـك نەنـراوە تـا بـە کارێـك سـەرقاڵ بکرێـن، بۆیـە ڕاگەیەنـدراوە کـە گرتووخانەیـەك دروسـت بکرێـت ئـەم مەرجانـەی تێـدا بێـت، بـۆ ئەمـەش لـە ویلایەتـی موسـڵ سەرپەرشـتیاری داد ئەرکـی جێبەجـێ کردنـی کارەکـەی پێـدراوە و لەلایـەن ناوبـراوەوە ئاماژەی پێکـراوە، بـە تێروانیـن لـە وێنـەی ئاماژەکـە کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت و ڕابگەیەندرێـت، هیممـەت بـۆ پەیوەندیدارانـی نەزارەتـە، لـەم بابەتـەدا ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ١٢ جەمـادی کۆتایـی ١٣٣١ و لـە ٢ نیسـان ١٣٣٢.
ڕاوێژکار بە ناوی نازری داد


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ DH.MB.HPS 89 2 2
DH.MB.HPS.00089.00002.002

| DH.MB.HPS. | 00089.00002 | 18 ره‌جه‌ب 1331 |
|---|---|---|

ویلایه‌تی موسڵ
قه‌ڵه‌می تۆماركردن
ژماره ٥٢
بۆ نه‌زاره‌تی ناوه‌خۆی جه‌لیله
سه‌باره‌ت به‌و گاردیانانه‌ی كه بۆ سانجه‌قی سلێمانی پێویستن.
جه‌نابی ئه‌فه‌ندم
بـۆ گرتووخانـه‌ی هـه‌ر یه‌كـه له چوار قه‌زاكه چـوار گاردیان دانـراوه، به‌ڵام به‌هـۆی زۆری و قه‌ڵه‌باڵغی ده‌سـتگیركراوان و سـزادراوانی مه‌ركـه‌زی لیـوا، ئـه‌و گاردیانانـه‌ی بوونیـان هه‌یـه بـه پێـی پێویسـت نیـن، بۆیـه لـه موته‌سـه‌رفیه‌تی سـلێمانی بـه پێویسـت زانـراوه سـێ گاردیـان زیـاد بكرێـت و بـه كۆكراوه‌یـی ده‌بێتـه حـه‌وت گاردیـان، هه‌روه‌هـا ئـه‌و گاردیانانـه‌ی كـه باسـكراوه، به‌كارهێنانیـان لـه پاراسـتنی گرتووخانـه‌كان سـوودی ده‌بێـت و خزمـه‌ت ده‌كـه‌ن، به حه‌واڵه‌كردنـی نـووسراو بـۆ داواكاری گشـتی ئیسـتینافی ویلایـه‌ت راگه‌یه‌نـدراوه، كـه ئـه‌و گاردیانانه‌ی ناویـان هاتووه سـه‌ر لـه نـوێ رێگـه دراوه بـه‌كار بهێنرێنـه‌وه، ئه‌مـه‌ش بـه ووتـه‌ی ژمێریـاری ویلایـه‌ت راده‌گه‌یه‌ندرێـت، لـه‌م بابه‌ته ئه‌مـر و فه‌رمـان بـۆ جه‌نابـی ئـه‌و كه‌سـه‌یه كـه فه‌رمـان ده‌رده‌كات، لـه ١٨ ره‌جـه‌ب ١٣٣١ و ١٠ حوزه‌یـران ١٣٢٩.
والی موسڵ

| MV. | 00177.00010 | **3 جەمادی کۆتایی 1331** |
| --- | --- | --- |

٣ جەمادی کۆتایی ١٣٣١
٢٧ نیسان ٣٢٩
پوختەی دارایی
نووسراوی مێژووی ٢٥ نیسان ٣٢٩ ژمارە ٢٥ی نەزارەتی دارایی خوێندرایەوە
بریار
لە نووسراوی باسکراو روون بۆتەوە، ئەحمەد روشدی پاشا بەگ کە کاتی خۆی موتەسەرفی سلێمانی بووە، بۆ خەرجی بژێوی ئەو هەمەوەندانەی لە سنووری ئێران خۆیان بەدەستەوە دەدەن و داوای پاراستن دەکەن، بری ٢٥ لیرە وەکو قەرەبووکردنەوە دراوەتە قوماندانی هێزی چاودێری، بۆیە بە پێویست زانراوە لە قەرزی خەزینە پارەکە رێك بخرێت و برە پارەی باسکراو لە بودجەی ساڵی ٣٢٦ لە خەرجی چاوەڕواننەکراودا رێك خراوە، لە بارەی ئەم رێکخستنە ئاماژەی نەزارەتی ناوهاتوو کرا بە نووسراو.



ML.EEM.00997.00027.002

| 13 ڕەجەب 1331 | 00997.00027 | ML.EEM. |
|---|---|---|

نەزارەتی دارایی
نـووسراو لـە موسـڵەوە هاتـووە؛ سـەبارەت بـە مووچـەی موعەلیمـی مەکتـەب ووتارخوێـن و پێشـنوێژی جامعـی شـەریفی ئاغچەلـەر
٥ حوزەیران ٣٢٩
لـە نـاو ویلایەتـی موسـڵ؛ بـۆ پیشـەی موعەلیـم و ووتارخوێـن و پێـش نوێـژی جامعـی شـەریفی ئاغچەلـەری یەکـەی سـەرچناری سـانجەقی سـلێمانی، مانگانـە ٢٠٠ قـوروش دابیـن کـراوە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە نـووسراوی فەرمانگـەی بوودجـە ڕێـك دەخرێـت و دابیـن دەکرێـت، لەگـەڵ نـووسراوی قەڵەمـی خێرخـوازی نەزارەتـی ئاوقافـی هومایـۆن لـە مێـژووی ١٨ مایـس ٣٢٩ ژمـارە ٢٩٩ ڕاگەیەنـدراوە، لـەم بابەتـەدا تۆمـارەکان پێداچوونـەوەی بـۆ دەکرێـت، ووتارخوێـن و پێـش نوێـژ و موعەلیمـی مەکتەبـی جامعـی شـەریفی ناوهاتـوو مانگانـە ٢٠٠ قوروشـی بـۆ دابیـن دەکرێـت، بـە گشـتی لەگـەڵ مووچـەی ئەرکەکانـی تـری خێرخـوازی لـە خەزینـەی تایبەتـی دارایـی ڕێـك دەخرێـت، هەروەهـا پێشـەکی بـە ڕێکخسـتن لەگـەڵ نـووسراوی مێـژووی ١٩ کانوونـی یەکـەم ٣٢٦ ژمـارە ٣٥٥٠، مووچـە و دەرماڵـەی ئەرکەکانـی تـری خێرخـوازی دراوەتـە بەڕێوەبەرایەتـی دارایـی، کـە دەرکەوتـووە لـە دەفتەریـش تۆمـار کـراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی کارەکـە لـە بەڕێوەبەرایەتـی ژمێریـاری نـووسراو نێـردرا.



ML.EEM.00998.00006.001

| 17 ڕەبیعی یەکەم 1331 | 00998.00006 | ML.EEM. |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٣٠٨
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
بۆ رووخانی دیواری گرتووخانەی سلێمانی ٩٠٠ قوروش و هەندێك حەواڵە کراوە.

جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
گرتووخانەی مەرکەزی سانجەقی سلێمانی رووخاوە، بۆ نۆژەنکردنەوەی دیوارەکەی، لە موتەسەرفیەتی ناوەخۆ بە پێویست زانراوە ٩٩١ قوروش خەرج دەکرێت، بۆ نۆژەنکردنەوەی گرتووخانەکەش پارەکە بە تەواوەتی خەرج کراوە و حەواڵە نامە نێردراوە، بۆ ئەم مەبەستەش بە ئاماژەی پەیوەندیدارانی نەزارەت لە ژمێریاری ویلایەت باسکراوە، بۆ حەواڵە کردنی برە پارەی دیاریکراویش هەرچی زووە پارەکە بنێردرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٧ ڕەبیعی یەکەم ١٣٣١ و لە ١١ شوبات ١٣٢٨.
والی موسڵ


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞIVI
ŞD
3111 60

ŞD.03111.00060.001

| ŞD. | 03111.00060 | 6 موحەررەم 1331 |
| --- | --- | --- |

بۆ سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی جەلیلە، جەنابی پایەبەرز
ڕاگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە
مێــژووی لــە دایکبوونــی بەندەتــان هەڵــەی تێــدا کــراوە، بۆیــە لەســەر بڕیارنامــەی فەرمانگــەی دارایــی و نافیعــە لــە مێــژووی ١١ تشرینــی دووەم ٣٢٨، هەروەهــا لــە مێــژووی ١٧ تشرینــی دووەم ٣٢٨ ژمــارە ١٣٥٩ لــە دەســتەی گشــتی بڕیارنامــەی پایــەی شــێخایەتی کارەکــە ڕێکخــراوە و وێنــەی پەســەند کــراوی پــێ بدرێــت، بــەڵام وێنــەی پەســەند کــراوی بڕیارنامــەی مێــژووی ١١ تشرینــی دووەم ٣٢٨ ی فەرمانگــەی ناوهاتــوو هــاوکاری جەلیلــەی پێویســتە، لــە هــەر حاڵەتێکــدا ئەمــر و فەرمــان بــۆ جەنابــی ئــەو کەســەیە کــە فەرمــان دەردەکات.
مۆری ساڵح وەسفی ئەفەندی موتەسەرفی پێشووی سانجەقی سلێمانی

| BEO. | 004171.312811 | 4 جەمادی کۆتایی 1331 |
|---|---|---|

٤ جەمادی کۆتایی ٣٣١
٢٨ نیسان ٣٢٩
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
نووسراوی مێژووی ٢٥ نیسان ٣٢٩ ژمارە ٢٥/٨٦٠، لە ئەنجوومەنی بریکارەکان خوێندنەوەی بۆ کراوە، ئەحمەد روشدی بەگ موتەسەرفی سانجەقی ئیلبیسان، کاتی خۆی موتەسەرفی سانجەقی سلێمانی بووە، بۆ دابین کردنی دە یەکی ئەو هەمەوەندانەی سەر سنوور کە ملکەچی خۆیان رادەگەیەنن، وەکو قەرەبووکردنەوە ٢٥ لیرە دراوەتە قوماندانیەتی هێزی چاودێری، ئێستا دەرکەوتووە ئەمە قەرزی خەزینەی و پێویستە بدرێتەوە، ئەو برە پارە دیاریکراوە، لە بوودجەی ساڵی ٣٢٦ لە خەرجی چاوەروانەکراو رێك بخرێت، بۆ ئەمەش لە نووسراوی نەزارەتی جەلیلە ئاماژەی پێکراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

| BEO. | 004213.315931 | 13 شەوال 1331 |
|---|---|---|

١٣ شەوال ١٣٣١
٢ ئەیلوول ١٣٢٩
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیله
لەبەر ئەوەی عەبدولوەهاب ئەفەندی فەرمانبەری دەفتەرخاقانی پێشووی سانجەقی سلێمانی، سەنەدی ساختەی داوەتە خەڵك، بریار له سەر دادگاییکردنی دراوە، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر نووسراوی مێژووی ٣٠ نیسان ١٣٢٩ ژمارە ٣٢ی نەزارەتی دەفتەرخاقانی عالی بە بریاری شورای دەوڵەت و فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرمانی داوە، وێنەی پەسەندکراوی لەگەڵ کاغەزە جۆراوجۆرەکان بۆ عالی نێردراوە، هیممەت بکرێت له جێبەجێ کردنی.

| 24 سەفەر 1335 | 00072.00026 | DH.SN.THR. |
|---|---|---|

- بابی عالی
نەزارەتی دەرەوە
بەڕێوەبەرایەتی شوێن کەوتە
ژمارە ١١٢٧/٥٠٦٤١
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
پوختە: لە بارەی عەبدولقادر کوڕی ڕۆستەم
جەنابی میری میرانی ئەفەندم
هاووڵاتی ئێران و دانیشتوی سنە؛ ١٠ ساڵ پێش ئێستا ناسنامەی عوسمانی وەرگرتووە و بە هەڵە شوێنی لە دایك بوونی بە سانجەقی سلێمانی بە هۆزی جاف تۆمارکراوە، دوای گەران لە تۆمارەکەی دەرکەوتووە؛ عەبدولقادر کوڕی ڕۆستەم پیشەی قاوەچیە و لە گەرەکی خەواجە پاشا دەژیت؛ داواکاری پێشکەش کراوە، تاوەکو لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت و بزانرێت خەڵکی کوێیە و دانیشتووی چ شوێنێکە و بە پشت بەستن بە چ بنەرەتێك لە تۆماری ناسنامە نووسراوەتەوە و تۆمار کراوە، بە سیفەتی چ شوێن کەوتەیەك ناسراوە و پارەوپولی نەگوازراوەی هەیە یاخود نییە، دواتر ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢٩ ئۆغستۆس ١٣٣٢
وەکیلی بەڕێوەبەری گشتی کاروباری سیاسی بە ناوی نازری دەرەوە

- بابی عالی
نەزارەتی دەرەوە
بەڕێوەبەرایەتیشوێنکەوتە
ژمارە ١٧١٩/٥٠٦٤١
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی میری میرانی ئەفەندم
بە ووتەی کارگێری گشتی تۆماری ناسنامە، وەڵامی پەیوەندیدارانی نەزارەت لە مێژووی ١٧ تشرینی دووەم ١٣٣٢ ژمارە ٨٨٦ هاتووە، عەبدولقادر کوڕی ڕۆستەم کە داوای راست کردنەوەی شوێنی لە دایکبوونی کردووە، پاش ووردبینی کردنی نووسراوی لێکۆڵینەوەکان دەرکەوتووە؛ کە خودی خۆی خەڵکی گوندی خورای سەر بە سنەیە، هەروەها ١٠ ساڵ پێش ئێستا ئافرەتێکی لە هاووڵاتی عوسمانی خواستووە، کوڕێکی بە ناوی ئیبراهیمی بووە، جگە لەمە لەگەڵ راست کردنەوەی شوێنی لە دایك بوونی، هاوپێچ لێکۆڵینەوەکانی نێردراوەتەوە، دوای ئەنجامدانی مامەڵەی پێویست نووسراوی باسکراو لە دۆسیەکەی هەڵدەگیرێت، لە بارەی ناردنەوەی بۆ نەزارەتی عاجیزانە بە هاوکاری پەیوەندیدارانی نەزارەتی جەلیلە دەبێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٧ کانوونی یەکەم ١٣٣٢
وەکیلی بەڕێوەبەری گشتی کاروباری سیاسی بە ناوی نازری دەرەوە

| 12 رەمەزان 1332 | 004305.322846 | BEO. |
|---|---|---|
| - بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>فەرمانگەی گشتی بەرێوەبەرایەتی ناوەخۆ<br>٩٣٢٠٥ گشتی<br>٩٢٤ تایبەتی<br>بۆ جەنابی عالی لە پەیوەندیداری سەدارەت<br>راگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە<br>مێژووی ١٤ مایس ٣٣٠ ژمارە ٤١٦ وەڵامی نووسراوی سەدری ئەعزەمە، لە سانجەقی سلێمانی تەکیەی شێخ کاك ئەحمەد ئەفەندی نزیکەی ١٠ فێرخوازی زانستی هەیە، هەروەها ئەگەرچی لەسەردەمی شێخ ئەحمەد ئەفەندی خەڵکێکی زۆر هاتووچۆی تەکیەکەیان کردووە و لەبەر کەسایەتی ناوبراو حاجیەکانی ئێرانیش لە کاتی هاتن و چوونیان وەکو میوان دەچوونە تەکیەکەی و خواردنیان دەخوارد، بەڵام دواتر بە هۆی گۆرینی پۆست نشینی تەکیەکە و چاودێریکردنی ئاڵۆزی و ئاژاوەکانی ئێران، تەکیەکە ئەو گرنگیەی نەما کە لە رابردوودا هەیبوو، جگە لەمە ئەگەرچی کەسوکار و منداڵەکانی شێخی ناوبراو هەژارن، بەڵام وازیان نەهێناوە و هەموو ماڵومولکی خۆیان لە ئەمانە و هەژاران خەرج کردووە، جگە لەمە بۆ پرکردنەوەی پێداویستی موریدەکانیش یارمەتی تەکیەکە نادرێت، ئەو داهاتەی بۆ ئەم تەکیەیە دابینکراوە، بە هەر شێوەیەك بێت پێویست ناکرێت زیاد بکرێت، بە ئاماژەی موتەسەرفیەتی سلێمانی بە وەڵام لە ویلایەتی موسڵ راگەیەندراوە، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>لە ١٢ رەمەزان ٣٣٢ و لە ٢١ تەمموز ٣٣٠<br>نازری ناوەخۆ<br><br>- زیلحیجە ٣٣٢<br>تشرینی یەکەم ٣٣٠<br>نووسراوی بریارنامە؛ تایبەتە بە گفتوگۆی ئەنجوومەنی بریکارەکان<br>پوختەی دارایی<br>بۆ خۆراکی تەکیەی شێخ کاك ئەحمەد ئەفەندی، کە دەکەوێتە سانجەقی سلێمانی؛ نووسراوی نەزارەتی دارایی لە مێژووی ٧ تشرینی یەکەم ٣٣٠ ژمارە ١٧٠ خوێندرایەوە.<br><br>بریار<br>لە نووسراوی ناوهاتوو روون بۆتەوە، بە پێویست نەزانراوە بۆ خۆراکی تەکیەی ئەفەندی ناوهاتوو جگە لە دە یەکی گوندەکانی موری و غەرمان و تەزتەپانی زەوی میری ناحیەی سروجك، هەروەها داهاتی خێرخوازی مانگانە ٢٠٠٠ قوروش بەردەوام دابین بکرێت، سەبارەت بە سرینەوەی تۆمارەکەی، لە وەڵامدا ئاماژەی نەزارەتی ناوهاتوو و زانیاری نەزارەتی ناوەخۆ نێردراوە و چەسپێنرا. | | |


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
DH.MB.HPS
45 19 2

DH.MB.HPS.00045.00019.002

| DH.MB.HPS. | 00045.00019 | 19 ره‌جه‌ب 1333 |
|---|---|---|

ویلایه‌تی موسڵ
قه‌ڵه‌می تۆماركردن
ژماره ٨٢
بۆ نه‌زاره‌تی ناوه‌خۆی جه‌لیله
جه‌نابی نازر به‌گی ئه‌فه‌ندم
له‌به‌ر ئه‌وه‌ی قۆناغی حكوومه‌تی سلێمانی وێران بووه، بۆیه بۆ فه‌رمانگه‌ی ناوه‌خۆ و داد مانگانه به ٢ لیره‌ی عوسمانی شوێنێك به كرێ ده‌گیرێت، هه‌روه‌ها له جیاتی شوێنگره‌وه‌ی ئه‌م كرێیه‌ش حه‌واڵه‌نامه ده‌درێت، به ئاماژه‌ی موته‌سه‌رفی سلێمانی و ووته‌ی ژمێریاری ویلایه‌ت راده‌گه‌یه‌ندرێت، له‌م بابه‌ته‌دا ئه‌مر و فه‌رمان بۆ جه‌نابی ئه‌و كه‌سه‌یه كه فه‌رمان ده‌رده‌كات.
له ١٩ ره‌جه‌ب ٣٣٣ و له ٢٠ مایس ٣٣١
بریكاری والی موسڵ




ML.EEM.01192.00003.001

| ML.EEM. | 01192.00003 | 1 ڕەجەب 1333 |
|---|---|---|

دەفتەرداری موسڵ
قەڵەمی بەڕێوەبەرایەتی مولکی میری
ژمارە
٢٧٦٣ گشتی
١٨٩ تایبەتی
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم

لە سلێمانی؛ موفتی زادە شێخ قادر ئەفەندی لە باجی دە یەکی ساڵی ٣٢٨ قەرزارە، بە ڕێگەی بەدواداچوون بۆ برە پارەی دیاریکراو کە ١٣٦٠ قوروش پێك دێت، وەکو شوێنگرەوەی ئەم پارەیە بە ناوی خەزێنەی دارایی هەشت پارچە زەوی کشتوکاڵی تەرخان کراوە، بۆ ئەم مەبەستەش لە فەرمانگەی تاپۆی ناوچەکە سەنەداتی خاقانیەکانی کە لە هەشت پارچە پێك دێت هاوپێچ پێشکەش کراوە، هەروەها مۆڵەت و داهاتی زەوی کشتوکاڵی ناوهاتوو بە پێویست زانراوە بە باشی داهاتەکەی کۆبکرێتەوە، ئەمەش لە شوێن خۆی لە یەکەی مولکەکانی خۆچێی ڕاگەیەندراوە و لە ژمێریاری سلێمانی ئاماژەی پێکراوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە ١ ڕەجەب ٣٣٣ و لە ٢ مایس ٣٣١
مۆر بە ناوی بەڕێوەبەری مولك
مۆری ئەحمەد نەسیم دەفتەرداری موسڵ




BEO.004364.327297.002

| BEO. | 004364.327297 | 5 ره‌مه‌زان 1333 |
|---|---|---|

بابی عالی
نه‌زاره‌تی ناوه‌خۆ
به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی گشتی ته‌ندروستی
قه‌ڵه‌می تایبه‌تی
٤٤٩ تایبه‌تی
جه‌نابی سه‌دری ئه‌عزه‌م له‌ په‌یوه‌ندیدارانی سه‌داره‌ت
راگه‌یه‌ندراوی به‌نده‌ی بێ نرخه
له‌به‌ر بارودۆخی ئێستا پزیشك نه‌ماوه‌، بۆیه‌ شاره‌وانیه‌كی زۆر و پزیشكگه‌ری حكوومه‌ت چ فه‌رمانبه‌ری به‌ وه‌كاله‌ت و چ پزیشكی ئازاد نادۆزرێته‌وه‌، هه‌روه‌ها ئه‌و پێنج یه‌كی مووچه‌یه‌ی كه‌ ده‌درێته‌ فه‌رمانبه‌ران رازی نین به‌ وه‌كاله‌ت به‌رپرسیارێتی وه‌ربگرن، له‌ هه‌مان كاتدا پێویسته‌ بۆ پزیشكگه‌ری هه‌ر یه‌كه‌ له‌ قه‌زای بیوك چه‌كمه‌چه‌ و سانجه‌قی سلێمانی به‌ وه‌كاله‌ت پزیشكێك دابمه‌زرێت، ئیسماعیل ئه‌فه‌ندی و ئالبێرتۆ ئه‌فه‌ندی به‌ وه‌رگرتنی سێ یه‌كی مووچه‌ ئه‌ركه‌كه‌ وه‌ربگرن، له‌م بابه‌ته‌ ئه‌مر و فه‌رمان بۆ جه‌نابی ئه‌و كه‌سه‌یه‌ كه‌ فه‌رمان ده‌رده‌كات.
له‌ ره‌مه‌زان ١٣٣٣ و له‌ ته‌مموز ١٣٣١
نازری ناوه‌خۆ



DH.İ.UM.00032.00024.004

| 11 شەعبان 1334 | 00032.00024 | DH.I.UM. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
قەڵەمی کاروباری کارگێری
ژمارە
٣٣١٣٣٢ گشتی
٣٤٩ تایبەتی
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
پوختە: لە بارەی ئەو پارەیەی کە لە بەرامبەر ئەو ئاگرکەوتنەوەی لە گوندی تاقان روویداوە.
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
وەڵامی نووسراوی مێژووی ٢ مایس ٣٣٢ ژمارە ٢١٤ ی عالیە: گوندی تاقانی سەر بە ناحیەی قەرەداغی سانجەقی سلێمانی ئاگری گرتووە، دانیشتوانەکەی پێویستیان بە هاوکاریە، بۆ بەرز کردنەوەی ئاستی بژێوی ژیانیان؛ بە بریارنامە لە ئەنجوومەنی کارگێری لیوای ناوهاتوو داوای ٦٩١٦ قوروش کراوە، لەم پارەیە نیوەی لە بودجەی ئەم ساڵەدا لە خەرجی چاوەروواننەکراودا ڕێکخراوە و هەژمار کراوە، سەبارەت بە حەواڵە کردنی، لە دوای گفتوگۆ لە وەڵامدا وەکالەتی نەزارەتی دارایی جەلیلە نووسراو وەرگیراوە، لە ئەنجوومەنی بریکارەکان پەسەند کراوە، هەروەها بۆ وەکالەتی ناوهاتووش ئاگاداری نێردراوە.
١١ شەعبان ٣٣٤ و لە ٣٠ مایس ٣٣٢
راوێژکار بە ناوی سەدری ئەعزەم

مجلس وکلا

مذاکراتنه مخصوص ضبط نامه

خلاصهٔ مآل

قرار

MV. 202/58 2 vrk (2 shp bos)

| MV. | 00202.00058 | 10 شەعبان 1334 |
| --- | --- | --- |

١٠ شەعبان ١٣٣٤
٢٩ مایس ١٣٣٢
ئەنجوومەنی بریکاران
بریارنامە تایبەت بە گفتوگۆ
پوختەی دارایی
گوندی تاقان سەر بە ناحیەی قەرەداغی سانجەقی سلێمانی سووتاوە، دانیشتوانەکەی پێویستیان بە هاوکاریە، بۆ باشکردنی بارودۆخیان لە ئەنجوومەنی کارگێری لیوای ناوهاتوو بە بریارنامە داواکراوە ١٩١٦ قوروش دابین بکرێت بۆیە نیوەی لە بوودجەی ئەم ساڵە لە خەرجی چاوەڕواننەکراو ڕێك دەخرێت، بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندی و ناردنی حەواڵەنامە بۆ خۆچێی، لە وەکالەتی نەزارەتی دارایی ٢٣ مایس ١٣٣٢ ژمارە ١٩ نووسراو خوێنرایەوە.

بریار
لەسەر ئاماژەی جێبەجێ کردن؛ لە وەکالەتی ناوهاتوو نووسراو کرا تا رابگەیەندرێت.

ML.EEM.01198.00011.015

| ML.EEM. | 01198.00011 | 18 شەعبان 1334 |
|---|---|---|

نەزارەتی دارایی
٧ حوزەیران ٣٣٢
نووسراو
بۆ دامەزراندنی تەلەگرافخانە لە قەزایەکانی بازیان و مەعمورەی سەر بە سانجەقی سلێمانی؛ دوو خانوو لە جەمیل ئەفەندی و مەحمود نەشئەت ئەفەندی کراوە، بە ناوی دەوڵەتی عوسمانیە رێکخراوە و نوسراوی دەفتەرخاقانی ئەمانەتی عالی لە مێژووی ٨ شوبات ٣٢٧ ژمارە ٨٢٢ لەگەڵ دوو پارچە سەنەد نێردراوە، لە مێژووی ٢٨ نیسان ٣٢٨ بە فەرمانی پاشا بە ناوی خەزینەی دارایی رێکخراوە و بۆ ئەم کارە لە ئەمانەتی ناوهاتوو فەرمان حەواڵە کراوە.



ML.EEM.01207.00008.001

| 30 زیلقەعدە 1334 | 01207.00008 | ML.EEM. |
|---|---|---|

زیلقەعدە ٣٣٤
١٥ ئەیلوول ٣٣٢
بۆ دەفتەرداری موسڵ
لـە نـاو سـانجەقی سـلێمانی زەوی و زاری سـەرچنار و بەکرەچـۆ لەگـەڵ زەوییەکانـی دەلیـن و سـوان و مالـوان و تەپـە کـۆرە و سـەرگەردان خولیـان تـەواو بـووە و بـۆ حەواڵەکردنیـان هێشـتا سـەنەدەکانیان نەهاتۆتـە خەزینـەی جەلیلـە، ئەمـەش بـە ووردبینیکـردن دەرکەوتـووە، هەرچـی زووە سـەنەداتی زەوی و زاری ناوهاتـوو بـە نـاوی خەزینـەی دارایـی رێـك بخرێـت و بنێردرێـت، هەروەهـا سـەنەداتی ساڵانەی زەوییـەکان بـە دیاریکردنـی سـنوور و بـری رووبەرەکـە و نرخەکـەی، جگـە لەمـە وێنـەی گواسـتنەوەی بـۆ خاقانـی ناوهاتـوو لەگـەڵ دەفتـەری مانگانـەی سـاڵانی کـۆن بـە ریزبەنـدی ژمـارەوە بنێردرێـت، بـەو هیوایەیـن ئەفەنـدم.




BEO.004418.331332.002

| BEO. | 004418.331332 | 4 شەعبان 1334 |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی دارایی
بەڕێوەبەرایەتی ژمێریاری دارایی
قەڵەمی خەرجی گشتی دارایی
١١٢٠ گشتی
١٩ تایبەتی
ڕاگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە

گوندی تاقانی سەر بە ناحیەی قەرەداغی سانجەقی سلێمانی سووتاوە، دانیشتوانەکەی کەوتوونەتە حاڵەتێکەوە پێویستیان بە هاوکاریە، بە پێویستیش زانراوە بارودۆخیان باش بکرێت، بۆیە لە ئەنجوومەنی کارگێری لیوای ناوهاتوو بریارنامە ڕێکخراوە و لە ویلایەتی موسڵ مامەڵەکە جێبەجێ کراوە، تێیدا هاتووە؛ خەڵکی گوندەکە بەم ئاگرکەوتنەوە زەرەمەند بوونە، بۆیە لە ٦٩١٦ قوروش نیوەی پارەکە لە خەرجی چاوەڕواننەکراو ڕێکخراوە و دەدرێت، بۆ وەرگرتنی پارەکەش لە نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە ئاماژەی پێکراوە، بە ڕاگەیاندنی عالیش بە نووسراوی سەدری ئەعزەمی پەیوەندیدارانی سەدارەت لە مێژووی ١٠ مایس ٣٣٢ ژمارە ٢١١ فەرمان دەرچووە و ڕاگەیەندراوە کارەکە جێبەجێ بکرێت، هەر لەگەڵ ڕاگەیەندراوی پاشا برە پارەی باسکراو لە بودجەی دارایی ئەم ساڵە هەژمار دەکرێت، حەواڵەنامەکەش بۆ شوێنی خۆی دەنێردرێت، بە ناردنی حەواڵەنامەکە بریاری ئەنجوومەنی بریکارەکان بە بەندەمان ڕادەگەیەندرێت، بۆچوونیش بۆ پەیوەندیداری سەدارەت دەگەڕێتەوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٤ شەعبان ٣٣٤ و لە ٢٣ مایس ٣٣٢.
بە ناوی بریکاری نازری دارایی

T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

DH.ŞFR.00548.00078.001

| 28 رەجەب 1335 | 00548.00078 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

٢٠ مایس ١٣٣٣
بۆ نەزارەتی ناوەخۆ
شیفرە
لـە سـانجەقی سـلێمانی و قەزاکانـی سـەر سـنوور پـارە و کاغـەزی دراوی زیـادە بگوازرێتـەوە بـۆ شـوێنێکی ئارامـتر و پارێـزراو تـر، بـۆ ئەمـەش لەسـەر ئامـاژەی قوماندانیـەت ئـاگاداری دراوەتە موتەسـەرفیەت.
حەیدەر والی

| DH.I.UM. | 00020.18.00012.040 | 14 ڕەجەب 1336 |
|---|---|---|

فەرمانگەی گشتی بەڕێوەبەرایەتی ناوەخۆ
٢٥ نیسان ٣٣٤
هاوپێچی نووسراوی مێژووی ١٦ نیسان ٣٣٤ ژمارە ١٣٥٢٨، ئەو ویلایەتانەی دەستی بەسەرداگیراوە لەوانە ویلایەتی وان و سانجەقی سلێمانیش بە تەواوەتی وەرگیراوەتەوە، بە ڕاگەیاندنی نووسرا ژمارەی لە سەر تۆمارکرا.

لوتفی بەگ ئەفەندی بەڕێوەبەری کارگێری گشتی ویلایەت بۆ شەریف بەگ بەڕێوەبەری فەرمانبەران
هاوپێچی نووسراوی مێژووی ١٦ نیسان ٣٣٤ ژمارە ١٣٥٢٨، ئەو ویلایەتانەی دەستی بەسەرداگیراوە لەوانە ویلایەتی وان و سانجەقی سلێمانیش بە تەواوەتی وەرگیراوەتەوە، بە ڕاگەیاندنی زانیاری، ئەم نووسراوەیە بۆ بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەرانی عالی نێردرا.




DH.EUM.6.Şb.00027.00052.001

| 4 رەبیعی یەکەم 1336 | 00027.00052 | DH.EUM.6.SB. |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٢٧٨
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
راگەیەندراوی بەندەی بێ نرخە

لە سانجەقی سلێمانی ناکۆکی لە نێوان شێخ قادر و هەمەوەندەکان دا دروست بووە، بۆ نەهێشتنی ئەم ناکۆکییە و چارەسەر کردنی کێشەکە، مەفرەزەیەك نێردراوە، بەڵام کاتێك ئەم مەفرەزەیە چاودێری ١١ چەتەیان کردووە، لەلایەن هۆزی عەزیزی بە چەك هێرشیان کراوەتە سەر و دوای رووبەرووبوونەوە لە چەتەکان ٢ کوژراوە و ٩ چەتە بە زیندووی دەستگیر کراون، هەروەها ٤ .... گەورە و ٣ مارتین و ٢ ..... ١ تفەنگی ژاندارمە دەست بەسەر کراوە، هەروەها لەگەڵ کاغەزی چەتەکان بۆ لایەنی داد نێردراوە، ئەو زانیاریانە لە وەکالەتی موتەسەرفی لیوای ناوهاتوو راگەیەندراوە، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٤ رەبیعی یەکەم ٣٣٦ و لە ١٨ کانوونی یەکەم ٣٣٣.
والی موسڵ


İ.DUİT.00042

<table>
<tr><td>I.DUIT.</td><td>00042.000091</td><td>4 شەوال 1336</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>ژمارە ٣٢<br>فەرمانی پاشا<br>عەلـی رزا بـەگ قائیمقامـی قـەزای حوسـنی مەنسـور بـە مووچـەی چینـی سـێیەم لـە موتەسـەرفیەتی سـانجەقی سـلێمانی دامـەزراوە.<br><br>بـۆ جێبەجـێ کردنـی فەرمانـی پاشـا نـازری ناوەخۆ ئەرکی پێ سـپێردراوە، لـە ٤ شـەوال ١٣٣٦ و لە ١٣ تەممـوز ١٣٣٤.<br>سەدری ئەعزەم و نازری ناوەخۆ</td></tr>
</table>


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

صدارت امور مهمه قلمی

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
4510 | 338219

BEO.004510.338219.001

| 25 جەمادی کۆتایی 1336 | 004510.338219 | BEO. |
|---|---|---|

٢٥ جەمادی کۆتایی ١٣٣٦
٧ نیسان ١٣٣٤
بۆ نەزارەتی دادی جەلیله
٣ نیسان ١٣٣٤ ژمارە ٥٢ وەڵامی نووسراوی عالیە: بۆ پیشەی قازیەتی سانجەقی سلێمانی، قازی سانجەقی دیوانیە عەبدولقادر ئەفەندی دامەزرێت، لەسەر ئاماژەی دەوڵەت جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا رەزامەندی داوە، وێنەی پەسەند کراوی هاوپێچ بۆ لایەنی عالی نێردراوە.

فەرمانی پاشا لە مێژووی ٦ نیسان ١٣٣٤